# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە

ئەمیندارێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو
لاوان بە زمانی کوردیو عەرەبی
دەری دەکا

لەم ژمارەیەدا



سەرنووسەر
**محمد أمین محمد احمد**

جێگری سەرنووسەر
**حسین عارف**

**54**
نیسانی ١٩٨٧
**ساڵی پێنجەم**

ئەدرەس :
هەولێر : ئەمیندارێتیی
گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢١٩٢٢

**نرخی (٢٥٠) فلسە**

لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ
لە چاپخانەی (الادیب البغدادیة) چاپکراوە

# دۆخی جیهانی ی کوردستان لەسەرەتای سەدەی بیستەوە

نووسینی : د. م. س. لازاریف          وەرگێڕانی : د. کاوس قەفتان

**بەشی یەکەم**

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە ، مەسەلەی کورد بووە مەسەلەیەکی جیهانیو لەوەدا نەما کێشەیەکی ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانی یاخود ئێران بێت .

هەر لە سەرەتاوە ، کاتێك دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی وەك بەریتانیاو فەرەنساو ئەڵەمانیاو رووسیاو نەمساو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو یاپۆنو ئیتالیا ، گەیشتنە ئەوەی خۆیان بۆ زۆرانبازیو شەڕ ئامادە بکەن ، بە نیازی دابەش‌کردنی جیهان لە ناو خۆیانا ، لەو ساتەوە سیاسەتی ئیمپریالیستیو کۆلۆنیالی لە رۆژهەڵاتی نزیکدا چووە دەورێکی نوێوە . ئەگەر جاران رووسیاو بەریتانیا بەینیان خۆش‌نەبوو ، بەڵام ئەڵەمانیا هاتە مەیانەوەو بووە دوژمنو موونافیسی بەریتانیا ، ئەو دەوڵەتەی لە دووا چل ساڵەکانی سەدەی نۆزدەهەمداگورجو چالاکانە هەنگاوی بەرەو پێشکەوتنی ئابووریو جەنگیی نابوو . رووسیای قەیسەریش کە لە مەیانی پێشکەوتندا لە دووای دەوڵەتە ئەوروپاییەکانەوەبوو ، مەترسییەکی ئەوتۆی لەم ناوچەیەدا بۆ بەریتانیا نەبوو . بەڵام رووسیا بەو سامانە زۆرەیو ژمارە گەورەکەی دانیشتوانی وڵاتەکەی ، وای لێ‌هات تای تەرازووەکەی قورس‌بێتو ببێتە هاوڕێو هاوپەیمانی بەریتانیاو بە جووتە لە رووی مەترسیی ئەڵەمانیا راوەستن ، مەترسیی ئەو ئەڵەمانیایەی لە ساڵی ١٨٩٠دا لە رۆژهەڵاتی نزیکدا پەرەی سەندبوو . ئەم دەسەڵات پەیدا کردنەی ئەڵەمانیا بەریتانیاو فەرەنسای ناچارکرد واز لە مەبدەئە کۆنەکەی خۆیان بهێنن کە بریتی بوو لە (پاراستنی یەکێتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی) . (ئەو مەبدەئەی بەو نیازو ئامانجە دانرابوو دەوڵەتی عوسمانی ببێتە دیوارێکی هەمیشەیی لە رووی رووسیاداو رێی پەلاماردانی رۆژهەڵاتی نزیكو بەلقانی لێ بگیرێت)و هەرگیز بیانوویەکیش‌بێت ، دەست بخەنە ناو کارو باریی ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانییەوە) .

هەردوو دەوڵەتەکە ، بە نیازی دابەش کردنی دەوڵەتی عوسمانیو گۆشە گیرکردنی ئەڵەمانیا بەراستیی کەوتنە خۆ کۆکردنەوە . ئەمەش وازوو بە زوو نەهاتە دی ، بەڵکو بە هێواشییو لە سەرخۆ پێك‌هات .

کۆنە دووبەرەکیو زۆران بازییەکەی نێوان رووسیاو بەریتانیا (لە رۆژهەڵاتی نزیکدا) ، نەك هەر لە پێش تەواوبوونی

پێك هاتنی پەیمانەکەی سوێندخۆرەکان ، بەڵکو دووای ئەوەش دەورێکی گەورەی هەبوو . ئەوەی پەیوەندی بە رووسیای قەیسەرەی‌یەوە هەیە ، ئەوەیە لە دووا بە دووای سەدەی بیستەمدا ، گۆڕینێکی تەواو بەسەر سیاسەتەکەی‌دا هات لە رۆژهەڵاتی نزیکدا . لە رووی سیاسەتی دەرەوەدا ، رووسیا تەنیا ئەوەی گەرەك‌بوو مافی ئەوەی هەبێت پاپۆرە جەنگی‌یەکانی بچنە ناو دەریای ناوەراست‌و بگەڕێنەوە . لەمە بەولاوە شتی تری نە ئەویست چونکە پەرژەوەندی ئابووریی رووسیای ، لە ئاسیای بچووك‌و تورکیای ئەوروپایی‌و ولاتە رۆژهەڵاتەکانی عەرەب بەلاوە زۆر گرنگ‌نەبوو .

هەر لەبەر ئەمەش‌بوو رووسیا پیلانی بۆ داگیرکردنی ئەم ولاتانە دانەنابوو . بە پێچەوانەشەوە ، لە رۆژهەڵاتی نزیکدا ، ئەنادۆلی رۆژهەڵات‌و ئێران ، دەورێکی گەورەیان لە سیاسەتی رووسیای قەیسەریدا هەبوو . دۆخ‌و هەڵوێستی ناوەوەی ئازربایجانی ئێران‌و کوردستان‌و ئەرمینیای تورکیا ، بەلای رووسیاوە ، بۆ پاراستنی سنوورەکانی زۆر گرنگ‌بوون . ئەمە دۆخی ویلایەتی قەفقاسیشی ئەگرتەوە ، چونکە دانیشتووەکانی وەك دانیشتوانی ناوچەکانی سەر سنووری تورکیاو ئێران تێکەلاوبوون (واتە کوردو تورك‌و ئەرمەنیان تیادابوو) . هەر لەبەر ئەمەشە ئەبینین بۆچی رووسیا گوێی دابووە مەسەلەکەی کوردو ئەو مەسەلەیەی بەلاوە گرنگ‌بوو . ئەمەش بە تایبەتی لە ساڵی ١٨٩٠وە رووی‌دا ، کاتێك ئاشووبەو شەڕو هەرا لە کوردستان‌و ئەرمینیای تورکیا دەستی پێ‌کردو ژمارەیەکی زۆری کوردەکان رێکخراوی جەنگیی خۆیان پێك‌هێنا .

مەسەلەی کورد لە رۆژهەڵاتی نزیکدا ، لە مەیانی سیاسەتی چەند دەوڵەتێکی مەزنی تریشدا ، شتێکی کەم نەبوو . بەریتانیا لە هەمووان زیاترو بە شێوەیەکی تایبەتی چاوی بریبووە کوردو بەلایەوە گرنگ‌بوو ، ئەو بەریتانیایەی لە رێی سیاسەتی داگیرکەرانەوە ئێرانی خستبووە ژێر چنگی خۆیەوەو هەوڵی ئەدا عیراقیش بخاتە ریزەوە . ئینگلیزەکان هەوڵیان ئەدا کوردەکان بکەن بە هاوپەیمانی خۆیان بۆ ئەوەی نفوزو دەسەلاتی رووسیاو دووای ئەویش ئەڵەمانیا لە ئاسیای نزیك‌دا بەربەست‌بکەن .

فەرەنساش کە ئەیویست دەست بەسەر سووریاو مووسڵدا بگرێت ، ئەویش لە کێشەکەی کوردەوە دوور نەبوو . دووایش ئەڵەمانیا زۆر بە گەرمیی کەوتە ئاوڕدانەوە لە کورد . ئەمەشی لە رێی هێڵە ئاسنینەکەی بەغداوە بۆ ئەچووە سەر . لەم کونەوە ئەڵەمانیا توانیی نفوزی خۆی لە ئەنادۆلی رۆژهەڵات‌و عیراق‌و ژووروی سووریا بلاو بکاتەوە . لەم رووەوە هەتا لە ئێرانیشدا هەنگاوی فراوانی هەڵنا .

مینۆرسکی دەربارەی ناوەرۆکی مەسەلەی کورد . لە رووی پەیوەندیی جیهانی‌یەوە لە رۆژهەڵاتی نزیك‌دا روونو ئاشکرا ئەدوێ‌و ئەنووسێ :

«پێشکەوتنی سیاسیی‌و ئابووری کارێکی ئەوتۆ ئەکات ئەو نیشتەنیانەی سەرووی میسوپۆ تامیایان بە درێژایی دەورداوە (واتە کوردەکان) ببنە بنکەو شانۆی گەلێك تاسیراتی کاریگەری دەرەوە ، وەك : هێڵی ئاسنینی بەغدا ، گرنگ نی‌یە بە دەست کام دەوڵەتەوەبێت ، زۆران بازی‌و مونافەسەی بازرگانیی ئەوروپاییەکان ، دەوڵەتی عوسمانی‌و سەر دەرهێنانی بزوتنەوەی جیابوونەوە خوازی عەرەب ، دووایی تەشەنەکردنی نفوزی رووسیا لە باکووردا ، ئەو نفوزەی بێ شەڕو جەنگ بلاو ئەبێتەوە . جا ئەگەر هەر یەکێك لەم تاسیراتانە بیەوێ پێی خۆی قایم بکات‌و کاری گەرتر بێت ، ئەوە مەسەلەی کورد لە گەڵ خوێدا راپێچ ئەکات ، ئەو مەسەلەیەی هەتا بێت بەرەو فراوان‌بوون ئەچێت . بەلام کوردەکان هەر ئەوە نین دیوارێك بن لە نێوان ژووروو خواروودا ، بەڵکو لە رۆژهەڵاتیشەوە بە ناو سنووری ئێران‌و هەموو شاخەکانی ئەرمینیادا درێژ ئەبنەوە ، هەتا ئەگەنە سنوورەکانی ئێمە (واتە رووسیا – وەرگێر) . شتێکی باشە ئەم سێ ملیۆن کوردە لە چوارچێوەیەکی یەك یاساییدا بە یەکەوە دامەزرێن ، بەلام هەر ئەمە خۆی لە خوێدا یەکێکە لە کێشە هەرە گەورەکانی سیاسەتی دووا رۆژ لە ئاسیای نزیکدا»[1] .

دۆخی کوردستانو ئەرمینیای تورکیا مەترسیی‌یەکی تەواوی بۆ کاربەدەستانی رووسیاو هەروەها بۆ کاربەدەستانی جەنگیو مەدەنی قەفقاس هێنا . لە سالأنی ۱۸۹۰دا ، رووسیا لە رووی پیشە سازی‌یەوە هەنگاوی فراوانی هەلّهێنا ، وەك راکێشانی هێلّی ئاسنینو دامەزراندنی کارگەی پیشە سازیو پەرەسەندنی دەوری بانکەکان . لە گەلّ ئەوەشدا کە کاربەدەستانی پیشەسازیو دارایی‌و هەروەها سیاسیو جەنگیو لەو سەردەمەدا چاویان لەوەوەبوو روو بکەنە رۆژهەلأتی دوور ، بەلأم رووسیا نەکە هەر بەو پێی‌یە نەئەرۆشت ، بەلّکو چاوی خۆی لەوەش نەنووقاندبوو هەلّوێستو جیّ پێی خۆی لە رۆژهەلأتی نزیکیشدا قایم بکات .

پێك‌هێنانی سوپای حەمیدیش هەرەشەیەکی گەورەبوو بۆ رووسیا لە سنوورەکانی لای قەفقاسەوە . ئەوەبوو لە ناوەراستی سالّی ۱۸۹۰دا ، رووداو دەستی پی‌کرد . گەلێك لەو ئەرمەنانەی لە مردن رزگاریان‌بووبوو ، خۆیان هاویشتە سنووری رووسیاوە . ئەو حەمیدی‌یانەی راویان نابوون ، چەند جار سنووریان بریو لە ناوچەکانی قارسو یەریڤاندا پەلاماری ئەرمەنەکانیان‌داو تالأنیان کردن . بۆ بەربەست‌کردنی ئەم هێرشانە ، هێزی چەکداری ئەرمەن لە قەفقاس دروست‌کرا . نیاز لەمە ئەوەبوو پەلاماری سنووری تورکیا بدەنو شەری پارتی‌زانی داگیرسێنن . زۆر جار لەم شوێنانەی سەر سنوور شەرو هەرا رووی ئەدا . نە جارێكو نە دوو تەقو هوور لە نێوان سوپای حەمیدیو کازاکە پاسەوانەکانی سەر سنوور پەیدابوو[٢] . زوربەی ئەم هەروا هوریانە لە کۆتایی سالّەکانی ۱۸۹۰داو سەرەتای سەدەی بیستەمدابوو .

کاربەدەستانی دەولّەتی عوسمانی ، بە تایبەتی سەرۆکایەتی ئەنادۆلّی رۆژ هەلأت ، هانی ئەم هێرشانەی حەمیدیان بۆ سەر قەفقاس ئەدا .

کاربەدەستانی عوسمانی ، بە تایبەتی قۆمندانی ئەنادۆلی رۆژهەلأت ، ئەم هێرشانەی سوپای حەمیدی‌یان بۆ سەر قەفقاس فراوان‌کردبوو .

میر تیزنیگاوسی موتەسەریفی یەریڤان لە نامەیەکیدا نووسیوێتی : «سەرۆکەکانی حەمیدی بەو جۆرە سەیری ناوچەکانی رووسیا ئەکەن ، پارووی‌ەك‌بیّ بتوانن هەمیشە قووتی بدەن .»[٣] . بەلای ئەوەوە ناخۆشیی نەك هەر لەوەدابوو کاربەدەستانی عوسمانی گویّیان خەفاندبوو هیچیان نەئەکرد ، بەلّکو بە ئاشکرا پەتیان شل کردبوو ، بە تایبەتیش موتەسەریفی بایەزید[٤] .

زینۆڤیفیش ئەم رایە ئەچەسپێنیّو پشتگیری ئەکات بەوەی ئەنووسیّ : «گویّ خەفاندنی کاربەدەستانی عوسمانی لە ئاست ئەو هەموو شکات کردنانەمان لە هەراکانی سەر سنووردا ، لەبەر کەم تەرخەمیو سەرسادی‌یەوە نی‌یە ، بەلّکو لە سیاسەتەوە هەلّقولأوە ، ئەو سیاسەتەی سولّتان بەرامبەر کوردەکان گرتوویەتی ، ئەو کوردانەی بەلای ئەوەوە وەك دیوارێك وەهان دەسەلأتی سولّتان لە ئاسیای بچووکدا ئەپارێزن»[٥] . ئەوی راستی‌بێت ، کاربەدەستانی عوسمانی کە کوردەکانیان هان ئەدا پەلاماری ناوچەو هەریمەکانی رووسیا بدەن ، لەمەدا ئامانجێکی سیاسیو جەنگی‌یان هەبوو . لە پێش هەموو شتێکەوە ، یەکەم ئامانجی ئەوەبوو رێگا لەوە بگرێت ئەرمەنەکانی رووسیا یارمەتی براکانیان لە تورکیا بدەن . چونکە کاربەدەستانی دەولّەتی عوسمانی ، قەفقاسیان بە بنکەیەکی بزووتنەوەی رزگاری خوازی ئەرمەنەکان لە ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانی‌دا دائەنا .

دووهەمیان ئەوەبوو ، دەولّەتی عوسمانی ئەیویست هەرەشەیەکی هەمیشەیی بۆ ستراتیجی‌یەتی رێگاو بانی هاتوچۆکردنی رووسیا لە قەفقاس دامەزرێنیّ . دووایش دەستگاکەی سولّتان چاوی لەوەبوو هەرگیز دالغەی بەوەوە لیّ ئەدا ، سوود لەو چەند سەد هەزار کوردە ببینیّ کە لە موتەسەریفی‌یەتی قەفقاسدا ئەژیان ، بۆ ئەوەی یەکێتیو ئاسایشی ناوەوەی پیّ هەلّتەکێنیّو بە وەش ئامانجەکەی عەبدول حەمید

ێتەدی ، ئەو ئامانجەی بریتی بوو لەوەی هەموو کوردەکان بخاتە ژێر سایەی خۆیەوە . ئەمەش نەك هەر مایەی نارەزایی ئێران بەڵکو هی رووسیاش بوو تیژبوون و شێواندنی دۆخی سەر سنووری عوسمانی وای کرد ئەرکی بەڕیوە بردن و جڵەو کردنی کوردەکانی قەفقاس لە لایەن داگیرکەرە قەیسەری یەکانەوە هێندەی تر قورس تربێت . دۆخی ژیانی کوردەکانی رووسیا زۆر خراپ بوو . لە ئەنجامی ئەو سیاسەتەش کە کاربەدەستانی قەیسەری لە قەفقاس ، دەربارەی زەوی و زار بەکاریان هێنا ، ە ئەنجامی ئەمەدا دۆخی کوردەکان ئەوەندەی تر خراپ بوو .

مووچە خۆرە رووسەکان بۆ ئەوەی رادەی زەوی و زاری چاندراو زۆرتر بکەن ، هاتن هەموو ئەو زەوی یانەی کوردە کۆچەرەکان تیایا ئەژیان ، دایان بەو خێڵە کوردانەی لە ناوەوەی ولایەتەکەدا ئەژیان . دووایش کە ژمارەیەك لە کوردە کۆچەرەکان ناچار بوون واز لە ژیانی کۆچەرێتی بهێنن و دامەزرێن و خەریکی زەوی چاندن بن ، ئەوسا ئەوەندە زەوی نەمابۆوە تیا نیشتەجێ بن . هەر لەبەر ئەمەش کاربەدەستان لە ساڵی ١٩٠١دا ، باجی سەر زەوی یان زیادکرد .

هەر لەبەر ئەمەش کوردەکانی رووسیا لە دۆخێکی تاڵ و نزمدا ئەژیان و بۆ ئەوەی پاروویەك پەیدا بکەن ناچار ئەبوون وڵاتەکە بەجێ بهێڵن و روو بکەنە دەرەوە[٦] . نارەزایی کورد لەم دۆخە بووە هۆی ئەوەی سەنگی کردەوەو دەست درێژی بەڕیوەبەران و پۆلیس لە سەر شانیان قورس تربێت . کاربەدەستانی ناوچەکە بۆ ئەوەی ئیرادەو هەستی خێڵایەتی دێرینی کوردەکان لەناو بەرن و بە تەواوەتی لەژێر چنگ و دەسەڵاتی خۆیانا لغاویان بکەن ، بۆ ئەم مەبەستە هاتن رێگای هاتوچۆکردنیان لێ بەستن . (ئەم هاتو چۆکردنەش لەبەر پێویستی ئابووری و زۆر جار لەو جۆرە شتانەبوو کە لە توانادا نەبوو وازی لێ بهێنرێ .) . لە ئەنجامی ئەو یاسا قورسەی بۆ پاسپۆرت دانرابوو ، هەتا ئەو کوردەی لە رووسیاش لە دایك بووبوو ، ئەگەر پاسپۆرتی نەبوایە لە وڵات دەرئەکرا .

نارەزایی بەشێکی زۆری کوردەکان بووە داردەست و پروپاگاندەیەکی باش بە دەست ئەو کەسانەوە کە دەوڵەتی عوسمانی ناردبوونی بۆ قەفقاس و لەوی بووبوونە چاووڕای ئەو . ئەو کەسانە پروپاگەندەیان دژی رووسیا لە ناو کوردەکاندا ئەکردو بیرو باوەری پان ئیسلامەتی یان لە ناویانا بڵاو ئەکردەوە . لە ئەنجامی ئەمەش گەلێك لە کوردەکانی رووسیا . هەڵاتن و روویان کردە تورکیاو چوونە ریزی سوپاکەی حەمیدی یەوەو دووایش بە چەکەوە گەڕانەوەو پەلاماری جووتیارەکانیان ئەداو تاڵانیان ئەکردن و ترس و تۆقاندنیان بە ناویانا بڵاو ئەکردەوە[٧] .

ئەم دۆخە قورس و تاڵەی کورد لە قەفقاس . کاری کردە سەر جۆری خێڵەکانی تری کورد لەدەرەوەی رووسیادا . کۆنسوڵی رووسیا لە بایەزید لەم رووەوە ئەنووسێت : «لە دۆخێکی وەهادا ، ناکرێ چاومان لەوە بێت کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی — هەژارەکانی لێ دەرچێت — لەگەڵەمانا باش بن[٨] » . بەڵام لێرەدا ئەتوانرێ بەراوردێك لە نێوان هەردوولایانا بکرێت . (واتە رووسیاو دەوڵەتی عوسمانی — وەرگێڕ) . هەردوو لایان لایەنی چاکەو خراپەیان هەیە . ئەگەر لە رووسیا ئاسایش چەسپاوتر بێت و لەبەر ئەمەش کوردەکان بۆ سوپا نەبرێن و باج سەندنیش کەمتربێت ، بەڵام لە تورکیا کوردەکان ئەیانتوانی بچنە ریزی سوپای حەمیدی یەوەو سوود لەو چوونەیان ببینن و لە هەمان کاتیشدا خاوەنی چەند سەر مەڕو ماڵاتێك بن . ئەگەر لە رووسیا ، سەرچاوەی زۆرداری کاربەدەستان و مووچەخۆرەکان بوون ، ئەوە لە تورکیا سەر چاوەی زۆرداری ئاغاو بەگەکان بوون . چ لە تورکیاو چ لە رووسیا میللەت نوقمی دەریای نەزانین و هەژاری بوو ، یەك دانە قوتابخانە نەبوو بە کوردی تیا بخوێنرێت .

دەوڵەتی عوسمانی بە هەموو جۆرێك هەوڵی ئەدا وا لە خێڵە کوردەکان بکات رووسیایان لە بەر چاو بکەوێت و پەیوەندی یان تێك بدات . هەوڵی دا سوود لە کردەوە نارەواو خراپەکانی کاربەدەستانی قەفقاس ببینێ و بۆ سوودی خۆی بەکاریان بهێنێ .

جا لە کاتێکدا کاربەدەستانی سەر سنووری رووسیا رێگایان نەئەدا بەو کوردانەی کاربەدەستانی عوسمانی ئەیاننااردن بۆ ئەوەی سنوور ببڕن‌و بچنە خاکی رووسیاوەو رێگای نە ئەدان لەوێ دامەزرێن ، بە پێچەوانەوە دەوڵەتی عوسمانی دەرگای سنووری بۆ ئەو کوردانە ئەخستە سەرپشت کە لە رووسیاوە هەڵ ئەهاتن[٩] . دەوڵەتی عوسمانی رێگای نەئەدا بەرهەمی مەڕومالاتی کوردستان بگاتە رووسیا . « وەکو بیەوێ کوردەکانی خۆی بگرێت‌و نەیەڵێ پەیوەندی‌یان لەگەڵ رووسیادا هەبێت»[١٠] .

بەڵام سەبارەت بەمەش بەشێکی زۆری کوردەکانی دەرەوەی رووسیا ، بەگشتی هەستێکی باش‌و شیرینیان بەرامبەر رووسیا هەبوو بە رزگار کەری خۆیان لە چنگ دەوڵەتی عوسمانی زۆردار دائەنا ، کە زۆر ڤینیان لێ ئەبۆوە . هەتا موراقیبە بێگانەکانیش هەستیان بەمە کردبوو . هەر بۆ نموونە ، سمیرنۆف کە بە هەموو ناوچەکانی باکووری کوردستانی تورکیادا گەڕابوو ، لەم رووەوە ئەو هەستی خۆشەویستی‌و دۆستایەتی‌یەی کورد بەرامبەر رووسیا هەیبوو دەری ئەخات‌و ئەنووسێت : « بەلای ئەوانەوە رووسیا ، لە هەموو بێگانەکانی‌تر نزیك‌ترە[١١] » . ئەگەر بێینە سەر بەراوردکردنی دۆخی ژیانی سەرەك خێڵە دەرەبەگە کوردەکان لە دەوڵەتی عوسمانی‌و رووسیا ، بۆمان دەرئەکەوێت ئەو بەراوردکردنە سوودی رووسیای تیانی‌یەو بەلای ئەودا دائاشکێتەوە . چونکە کوردەکانی رووسیا کە بە زۆری رەگ‌و ریشەو رەچەڵەکی خۆیان بزرکردبوو (واتە لە خێڵەکانی خۆیان دابچرابوون — وەرگێڕ —) ، بەگ‌و ئاغاکانیان لای کاربەدەستە رووسەکانی ئەودیو قەفقاس ، هیچ جۆرە نرخ‌و بایەخێکیان نەبوو . پیاوە گەورەکانی کورد (نیازی لە ئاغاو بەگەکانە — وەرگێڕ) ، لە رووسیا هیچ جۆرە روتبەو پلەیەکی سوپاییان پێ نەئەدرا . جێگاو پلەی بەڕێوەبردنیان پێ نەئەدرا . بگرە هەتا لە مەدالیاو خەلات کردنیش بێ بەش کرابوون[١٢] . کاربەدەستانی عوسمانی سوودیان لەمە بینی‌بوو ، بە یارمەتی دەرەبەگ‌و سەرەك خێڵەکان ، پروپاگاندەیان دژی رووسیا بە ناو خێڵە کوردەکاندا بلاو ئەکردەوە . مەبەستیش ئەوەبوو دۆخی جەنگی‌و سیاسی رووسیا لەو دیو قەفقاس شلۆق کەن‌و بشلەقێن‌و رووسیا ناچار بکەن پاڵە پەستۆکەی ، کە لەسەر کێشەکەی ئەرمەن‌و کێشەی تر کردبوویە سەر تورکیا ، کەم بکاتەوە .

دۆخەکەی کوردستان کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئاڵۆزتربووبوو ، وای لە رووسیا کرد بە چاوێکی‌تر سەیری کێشەکەی کورد بکات . وای لێ‌هات نەك هەر لە رێی پەیوەندی نێوان رووسیاو تورکیا (دووایش رووسیاو ئێران)ەوە ، سەیری کێشەکەی کورد بکات ، بەڵکو وەك مەسەلەیەکی سەربەخۆی گرنگی رۆژ هەلاتی نزیك تێی بڕوانێ . سیاسەتی دەرەوەی رووسیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەمدا ، لە رۆژهەلاتی نزیکدا ، لە رووی پەیوەندی‌یەوە لە گەڵ تورکیادا ، بریتی‌بوو لەوەی ئەو (دۆخی هەبووە) وەك خۆی بمێنێتەوە . ئەو نامەیەی وەزیری کاروباری دەرەوەی رووسیا ، بە رەزامەندی چاری رووسیا بۆ ئەخمینۆڤی نێردراوی دیبلوماسی رووسیا لە بولگاریا ، دەربارەی سیاسەت‌و ئامانجی نەگۆڕدراوی رووسیا لە ساڵی ١٨٩٧دا نێردرابوو ، بریتی‌بوو لە : « چاو دێری‌کردنی ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانی بە جۆرێك کەس دەست درێژی نەکاتە سەرو ولاتەکەو وەك خۆی بەبێ دابەش‌کردن‌و جیابوونەوەی هیچ پارچەیەك بمێنێتەوە . بەو نیازەی رێگا نەدرێت هیچ جۆرە ناخۆشی‌و سەرێشەو ئاڵۆزی‌یەك بێتە کایەوە . لەم رۆژانەو لەم کات‌و ساتەدا ، باشترین رێگا بۆ پشتگیری کردنی دەسەلاتی سوڵتان‌و پاراستنی دەوڵەتەکەی ، ئەوەیە بە هەر جۆرو رێگایەك‌بێت ، رۆژهەلات کپ‌و بێ دەنگ‌بێ .

ئەمەش ئەوە ئەگەیێنێ ، نابێ رێگای دابەش‌کردنی ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانی بدرێت ، ئەو ئیمپراتۆری‌یەتەی لە سەر ئاگرەو لە کولاندایەو ئاژاوە هەموو لایەکی گرتۆتەوە . ئەگەر

ڕێگا بۆ دابەش کردنی دەوڵەتی عوسمانی تەخت بکرێت ، ئەوسا هەر یەکە لە لای خۆیەوە ڕاست ئەبێتەوە ، دەوڵەتی بولگار لە لایەکەوە ، میللەتەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی لە لایەکی ترەوە ، هەوڵ ئەدەن قووتی بدەن‌و بەشێك بۆ خۆیان دابپچڕن‌و لە ئەنجامی ئەمەش ئاژاوەو شەڕو شۆڕ پەیدا ئەبێ . لەبەر ئەمە بە هیچ جۆرێك ڕازی نابین ئەو فەرمانەمان پشت گوێ بخرێت کە لە سەرەوە باسمانکرد»[١٣] . کە لە تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەشدا زینۆڤیف کرا بە باڵیۆزی ڕووسیا لە ئەستەمبوول ، نامەیەکی لە وەزارەتی کارو باری دەرەوەی ڕووسیا پێگەیشت ، لەو نامەیەدا ئامانجە سیاسییەکانی ڕووسیا بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی بەم جۆرەی خوارەوە ڕوون کرابوونەوە : «لەم کاتەدا هەموو هەوڵ‌و تواناو گوێ پێ دانمان ئاراستەی ڕۆژهەڵاتی دوور کردووە ، کە بۆ دووا ڕۆژی ڕووسیا لە هەموو شتێکی تر گرنگ‌ترە ، لەبەر ئەمە ئەبێ دەست بەرەڵلابین‌و بە هیچ شتێکی ترەوە سەرمان قاڵ نەکەین بۆ ئەوەی ئەمەش بێتەدی ، پێویستە هیچ لە تورکیا ڕوو نەدات ، بە مەرجێك چاودێری پەرژەوەندی‌و مافەکانی ڕووسیا بکەیت .

هەر بۆ ئەم مەبەستەش ئەبێ هەوڵ بدەیت پەیوەندیی دۆستایەتی‌و دراوسێیەتی تورکیا لەگەل ڕووسیادا توندو قایم بکەیت .

لەو نامەیەدا ئەمەش دەربارەی ڕووداوەکانی ئەرمینیا نووسرابوو . «ئەو ڕووداوانەو خوێن ڕشتنە ، جێی داخ‌و خەفەتن ، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی نەمان توانی ڕێگا لەو خوێن ڕشتنە بگرین ، ئەمەش لە ترسی ئەوەی کێشەکەی ڕۆژهەڵات بە هەموو مەترسی‌و ئەنجامەکانییەوە دەست نیشان بکەین‌و بیخەینە بەر چاوو کایەوە . . . . بەڵام لە گەڵ ئەمەشدا ناتوانین چاو لەو مافەمان بپۆشین کە پشتاوپشت بۆمان ماوەتەوە ، واتە مافیی پاراستنی گاورەکانی دەوڵەتی عوسمانی .»[١٤]

لە ئابی ساڵی ١٩٠٠دا . لامز دروۆڤی وەزیری کارو باری دەرەوە ، نامەیەکی سەیری نارد بۆ زینۆڤیف : نامەکەش بە بۆنەی پەلاماردانەکەی سوپای حەمیدی بۆ سەر ئەرمەنەکانی قەزای ساسۆن‌و سپاگانگ لە ویلایەتی واندا نووسرابوو . لەو نامەیەدا ئەڵێ : بە هۆی ڕووداوەکانی ئۆکیانی هێمنەوە (نیازی لە ڕۆژهەڵاتی دوورە) ئێستە لە هەموو کاتێك‌و هەموو ڕۆژێك زیاتر ئەوەمان بەلاوە گرنگە ناوچەکانی سەر سنووری تورکیای دراوسێمان بێ دەنگ‌بن . نامانەوێ هیچ ڕووداوێك ببێتە هۆی ئاڵۆزبوونی پەیوەندیمان لە گەڵ تورکیادا ، هەر لەبەر ئەمەش داوا ئەکەم بە خێرایی‌و بێ وەستان ڕووداوەکانی سپاگانگ بخەیتە بەر دەم ئەستەمبوول‌و داوا بکەیت ڕێگایەك ، دەرفەتێك ، چارەیەك بۆ یەکالا کردنەوەی بدۆزنەوە .»[١٥] .

ئەتوانین لەمانەی لەسەرەوە باسمانکرد ، سێ ئەنجام دەست بخەین : یەکەمیان ئەوەیە ، حکومەتی ڕووسیا چاوی لەوە بوو دۆخی سیاسیی ناوەوەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك ڕاست بکاتەوەو بیخاتەوە شوێنی خۆی‌و بێ وەستان بە یەکاچوون‌و شەڕو شۆڕی نێوان کوردو ئەرمەنەکان بوەستێنێ . دووهەمیشیان ئەوەبوو ، کە ڕووسیا بڕیاری دابوو ئاسایش لە ناوچەکانی ئەودیو قەفقاس بچەسپێنێ‌و ئەو ناوچانە لە مەترسیی دووربخاتەوەو هێمنیش لە سەر سنوورەکانی لای تورکیاوە بڵاو بکاتەوەو دامەزرێنێ . سێیەمیشیان کە لە هەموویان گرنگتر بوو ، ئەوەبوو لە پیتربورگ بڕیار درابوو ئەو ئامانجانە لە ڕێی دیبلوماسییەتەوە بەدی بهێنێ . ئەم ئامانجەش نە ئەهاتە دی ئەگەر دەوڵەتە ناحەزەکانی ڕووسیا وەك بەریتانیاو چەند دەوڵەتێکی تر پشتیی حکوومەتی سوڵتانیان بگرتایە .

یەکەم هەنگاوی دیبلوماسییانەی ڕووسیا کە بۆ ئەم مەبەستە هەڵی هێنا ، ئەوەبوو باڵیۆزێکی ڕووسیان وەك نوێنەرێکی تایبەتی نارد بۆ ئەستەمبوول . دەربارەی پەلاماردانی سوپای حەمیدی بۆ سەر سنوورەکانی ڕووسیا گفتوگۆیانکرد . باسیی سنوورەکانی نێوان ڕووسیاو ئێرانیش‌کرا ، کە لە ساڵانی ١٨٩٤وە تا ساڵی ١٨٩٦ بووە مەیانی شەڕو ئاشووبە . بۆ نموونە لە کانوونی دووهەمی ساڵی ١٨٩٥دا ، نیلیدۆڤ بە سەرەك

وەزیران (واتە سەدری ئەعزەم)ی ، راگەیاند : کە ئەگەر پەلاماردانو تالانیی کوردەکان نەوەستێ ، ئەوە رووسیا ناچار ئەبێ بەهێزی چەك هەتا سنوورەکانی تورکیا راویان بنێ[١٦] .

ئەم هەرەشەیە کاری خۆی کرد ، بەلام بۆ ماوەیەکی کورت . لە سەرەتای کانوونی دووهەمی ساڵی١٨٩٨دا ، زینۆڤیف روو بەروو لە سوڵتان عەبدول حەمیدی دووهەمی گەیاند کە کوردەکان سنووری رووسیا ئەبڕن . سوڵتان بەڵێنی دایە بە هەر حاڵێك بێ رێگایەك بدۆزێتەوەو چارەیان بکات . بەلام وەك باڵیۆزی رووسیا لە نامەکەیدا ئەنووسێت : «سوڵتان داوای لە کاربەدەستانی ئەو ناوچانە کرد شتێکی وەها نەکەن دڵی کوردەکانی پێ بشکێت»[١٧] . زۆری نەبرد ئەنجامی ئەم پەت شل کردنە بۆ حکوومەتی سوڵتان دەرکەوت . پاش هەراکەی مایسی ساڵی ١٨٩٩ ، کە لە گەڵ کوردە حەمیدی‌یەکان رووی‌داو دوو ئەفسەری رووسی تیا کوژرا (لادچێنکۆو شڤیریکە) ، پیتر بورگ بریاریدا خێراتر بێتە کایەوە . لە (١٢)ی ، حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٩دا ، زینۆڤیف ، لە گەل سوڵتانا کۆبۆوەو باسی رووداوەکانی سەر سنوورو دۆخی ئەو ناوچانەیانکرد . باسی هەراکەی مایسیش‌کرا . زینۆڤیڤی باڵیۆز رووبەروو یەکسەر تورکیای تاوانبارکرد . ئەوەی‌دا بە رووپا ، کە حەمیدی‌یەکان هەرچی‌یەك ئەکەن ، لغاو ناکرێنو سزا نادرێن . لە سەرەتادا عەبدول حەمید نەی ویست وەلام بداتەوەو هیچ بە دەستەوە بدات ، بەلام کەدی باڵیۆزی رووسیا واز لە قسەو هەڵوێستەکانی ناهێنێ ، ئەوسا بەڵێنی‌دا لەو رووداوانە بکۆڵێتەوەو تاوانبارەکان سزابدات . هەر لەبەر ئەمەش فەرمانی نارد بۆ کاربەدەستانی ئەرزرووم‌و هێزی شەشەم[١٨] . وادیاربوو سوڵتان نیازی نەبوو بەڵێنەکەی بەجی‌بێنێ .

هەرچۆنێك بێ ، لە ماوەی مانگێکدا ، موراڤیێڤی وەزیری کاروباری دەرەوەی رووسیا ، داوای لە زینۆڤیڤی باڵیۆزکرد ، بە خێرایی سەر لە سوڵتان بداتو داوای لێ‌بکات : (بەخێرایی‌و ئەوپەری گوێ پێ‌دانەوە ، ئاور لە کردەوە نارەواکانی سەر سنوور بداتەوەو هانی سوڵتان بدات بە خێرایی هەوڵ بدات ئەو رووداوانە دامرکێنێتەوەو سزای تاوان بارەکان بدات[١٩]» . بە لای مواریێڤەوە ، ئەو هەنگاوانە بریتی بوون لەمانە : یەکەم موتەسەریفی بایەزید لابیرێت . دووەم ، روتبەو ناتۆری سوپاییی لەسەر ئەفسەرەکانی سوپای حەمیدی هەتا روتبەی سەرپەل لابیرێت . سێیەم : خزم‌و کەس‌و کارانی کوژراوەکان بە پارە تەعویز بکرێن[٢٠] . کە ئەم داخوازیانە دران بە کاربەدەستانی عوسمانیو بووە مایەی پرسیارکردن ، باڵیۆزی رووسیا ئەوەشی خستە سەر کە سوپای حەمیدی تەنیا بۆ ئەوە دروست‌کراوە دژی رووسیا بەکار بهێنرێ . تەحسین بەگی یەکەمین سکرتێری سوڵتان گورج نامەیەك ئەدا بە زینۆڤیف . لەو نامەیەدا نووسرابوو : «نیاز لە دروست‌کردنی سوپای حەمیدی ئەوەبوو کوردەکان لە ناوچەکانی خۆیانا دامەزرێن‌و جەندرمەیان لێ‌بگیرێت‌و بەمەدا دەر ئەکەوێت کە حەمیدی دژی رووسیا دروست‌نەکراوە ، بەڵگەش ئەوەیە تەنیا لە عیراق‌و سووریا پێك هێنراوە .»[٢١] .

بێگومان زینۆڤیف بڕوای بەم روون کردنەوەیە نەکرد . باڵیۆزی رووسیا هەر ئەوەی پێ‌کرا وا لە کاربەدەستانی تورکیا بکات رازی بن لیژنەیەکی دوولایی رووسیاو تورکیا پێك بهێنرێ ، بەو نیازەی هەراو شەرو شۆڕەکانی سەر سنوور لەناو بەرێت . رووسیا جەنەراڵ زیلین کردە نوێنەری خۆی بۆ ئەم لیژنەیە ، تورکیاش توفیق پاشای دانا . کاری ئەم لیژنەیە ئەنجامی نەبوو . لە گەڵ ئەوەشدا رێك کەوتن ، ژمارەیەکی زۆر کەمی سوپا لەسەر سنوور دابنرێت ، بەلام دەوڵەتی عوسمانی سوپای حەمیدی خۆی لەسەر سنوور هێشتەوە[٢٢] .

بەلام کاربەدەستانی عوسمانی ناچاربوون ، هەموو ئەو زیانانە بژمێرن کە کەوتبوونە سەر کوردەکانو ناچاریش‌بوون سوپا بنێرنە سەر کوردەکانو سزایان بدەن لەسەر ئەوەی پەلاماری سنووری رووسیایان داوە[٢٣] . بەلام ئەو لیژنە

ـیبەتی‌یەی لە لایەن سولتانەوە دانرا ، بۆ سزادانی ئەو کوردانەی بەشداری هەراکەی (١١)ی مایس‌یان کردبوو ، کەوتە پاکانە کردن‌و وای پیشان‌دا کە ئەو دوو ئەفسەرە رووسە کوژراوانە (لادچینکۆو شفیریکە) بە دەست کوردەکانی رووسیا کوژراون . لەگەلّ ئەوەشدا زینۆڤیف بە توندی دژی ئەم بریارە وەستا ، بەلاّم بێ ئەنجام بوو بەلّێنەکەی سولتانیش بۆ ئەوەی چاو بەو کێشەیەدا بگێرێتەوە هیچ دەرچوو[٢٤] .

بێ‌گومان ئەم هەلّوێستەی کاربەدەستانی عوسمانی وای‌کرد هەلّویستی دوژمنانەی چەند سەرۆکێکی کورد بەرامبەر رووسیا تیژترو جەربەزەتربێت‌و شان بە شانیشی پەیوەندی دووا رۆژی نێوان تورکیاو رووسیا خراپ‌تر ئالّۆزتربێت . لەبەر ئەمە لە پیتربورگ بریاردرا پالّە پەستۆی دیبلۆماسیی بۆ سەر ئەستەمبوولّ تیژتر بکرێت . لە ناوەراستی ئەیلولی سالّی ١٩٠٠دا ئەو بیانوو بەهانەیە پەیدابوو ، هەتا ئەو پالّە پەستۆ دیبلۆماسیی‌یە بێتە دی .

ئەو بەهانەیەش ئەوەبوو کوردەکان پەلاماری میر شاخۆفسکی بەریوەبەری گشتی کۆنسۆلخانەی رووسیان لە ئەرزروم داو لە ئەنجامدا شاخۆفسکی بریندارکراو هەرچیشیان لە بەردەستدابوو تالاّنیان‌کرد .

لامزدرۆڤ لە کۆتایی ئەو سالّەدا زینۆڤیڤی ئاگادار کرد کە «بە پێی فەرمانی خاوەن شکۆ پێویستە هەولّ بدات سەرنجی راستە قینەی سولتان راکێشێت‌و ئەوەی پیشان‌بدات کە زۆر پێویستە کوردەکانی ئاسیای بچووك لغاو بکات‌و دایان مرکێنێتەوەو ئەبێ ئەنجامی ئەو پەلاماردانە بخاتە ئەستۆی خۆی .»[٢٥] . پاش چەند رۆژێك ئەم فەرمانە بەجێ‌هێنرا[٢٦] . بەلاّم لەوە ئەچوو هەولّەکەی ئەو ئەنجامەی نەدابێ کە چاوەروان ئەکرا . لە کانوونی دووهەمی سالّی ١٩٠١دا ، لامزدرۆڤ بروسکەیەکی نارد بۆ زینۆڤیف تیایا هاتبوو : چاری رووسیا فەرمانی داوە کە « زۆر بە توندی داوا بکرێت وەك چۆن تاوانی پەلاماردانی کوردەکان بۆ سەر هێزەکانی سەر سنوورمان وەهاش تاوانی پەلاماردانەکەی کونسۆلی گشتی‌و نێردراوی رووسیا لە ئەرزروم بخەنە ئەستۆی خۆیان . دۆخی ویلایەتی ئەرزروم لەوەدا نەماوە چاوی لێ بپۆشرێت . لەبەر ئەمە پێویستە هەنگاوی راستەقینە بۆ لغاوکردنی کوردەکان هەلّ بنێن . ئەوەش لە سولتان بگەیێنە کە لەمەودووا هیچ پاکانەو منجەمنجێك قبوولّ ناکەین[٢٧] .» . ئەم هەرەشەیە کاری خۆی کردوو سەری گرت . لە هاوینی سالّی ١٩٠١دا ، دادگا بۆ کوردەکانی کازیجان سازکرا ، واتە بۆ ئەوانەی بە پەلاماردانەکەی شاخۆفسکی تاوان‌بار کرابوون . لە حەڤدە کەس حەوتیان بەرەلّلا کران‌و ئەوانەی تریش بۆ ماوەی جیاجیا حوکم دران[٢٨] . هەرچەندە کاربەدەستانی عوسمانی ناچار بوون دلّ نەوایی رووسیا بکەن ، بەلاّم هەرگیز ئامادە نەبوون ئەو هۆیانە لە ناو بەرن کە مایەی شەرو شۆری سەر سنووربوون .

ئەمەش لەو نارەزایی دەربرینەدا خۆی دەرخست کە کاربەدەستانی عوسمانی بۆ پیتربورگیان نارد ، بە ناوی ئەوەی گوایە هێزی ئامادەکراوی ئەرمەنەکان لە سنوورەکانی رووسیاوە دێن‌و پەلاماری سنوورەکانی تورکیا ئەدەن ، بە نیازی ئەوەی دەستی یارمەتی بۆ بزوتنەوەی رزگاری خوازی ئەرمەنەکان لە عوسمانی درێژ بکەن . لە پیتربۆرگ زوو هەستیان بەم چاو شارکێی‌یەی تورکیا کرد . پێویست‌بوو زوو بەرەنگاری بوەستن . لە ناوەراستی تشرینی دووهەمی سالّی ١٩٠١دا ، لامزدرۆڤ بە رەزامەندی چاری رووسیا ، چەند تێبینی‌یەکی بۆ زینۆڤیف نارد ، لەوانە : ئەو نارەزایی دەربرینەو سکالاّکردنەی تورکیا ، رووی راستیی رووداوەکانمان نادەنێ ، چونکە هەتا ئێستا هیچ شتێکی وەهایان پیشان نەداوە ، ئەوە بچەسپێنێ کە لە سەر هەقن‌و مافیان بە دەستەوەیە .

لە دووا رۆژدا گوێ نادەینە ئەم جۆرە سکالاّیانە . بۆ ئەوەی ئاسایش لە ناوچەکانی سەر سنوور بچەسپێت ، داوا ئەکەین ، سولّتان خۆی هەولّ بدات‌و رێ‌و شوێنێك بدۆزێتەوە ، وابکات ئاسایش لە ناوچەکانی ئاسیای بچووکی دراوسێمانا رەگ داکوتێ .»[٢٩] .

ئەو زۆر لێ کردنو پاڵە پەستۆ دیبلوماسیی‌یەی رووسیا ئاراستەی دەوڵەتی عوسمانی کرد . رۆژ لە دووای رۆژ کاری خۆی کردو ئەنجامی‌دا . ژمارەی پەلاماردانو تالآنی‌کردن کزبوو . ژمارەی رووداوەکانی سەر سنووریش تەواو هاتنە خوارێ . هەروەها دۆخی ناوەوەی هەمیشە شڵەقاوی کوردستانو دوژمنایەتی کوردو ئەرمەن ، ئەمانەی تارادەیەکی زۆر حەسانەوەی لە کاربەدەستانی رووس بڕیبوو خاڵێکی رەش بوو لەسەر پەیوەندی نێوان رووسیاو تورکیا ، ئەوەش وای لێ‌هات بێتە سەربار . ئەوەی بە زۆری مەیانەی رووسیاو تورکیای تێك‌ئەدا ، گەڕانەوەی ئەرمەنەکان‌بوو لە رووسیاوە بۆ تورکیا ، ئەو ئەرمەنانەی لە رۆژانی کوشتارەکەوە بەرەو رووسیا هەڵاتبوون . لە ساڵی ١٩٨٤-١٨٩٦دا ، نزیکەی (٣٠) هەزار ئەرمەن ، لە تاو کوشتنو برین پەنایان بردە بەر رووسیا . کاربەدەستانی رووس‌و دامو دەستگاکەی قەیسەر کە لەو رۆژانەدا ئەیانویست ناوچەکانی ئەودیو قەفقاس بکەن بە رووس ، نەیان ئەویست جێگاو شوێن‌و زەوی‌و زار بدەن بە ئەرمەنەکان .

لەبەر ئەمە بڕیاریان‌دا ئەرمەنەکان رەوانەی تورکیا بکەنەوە . ئەمەش سەرو دڵی تورکیای گرت . لە سەرێکەوە لەوە ئەترسا ژمارەی ئەرمەنەکانی دەوڵەتی عوسمانی پەرەبسێنێ ، لە سەرێکی تریشەوە سڵی لەوە ئەکردەوە ، پەیوەندیی لە گەڵ دەرەبەگە کوردەکاندا تێك بچێت ، ئەوانەی بە شێکی زۆری زەوی‌و زاری ئەرمەنە هەڵاتووەکانیان بۆ خۆیان بردبوو .

هەر ئەوەندەی یەکەم دەستەی ئەرمەنە هەڵاتووەکان گەڕانەوە ، زۆرداری‌و دەست‌درێژی دەرەبەگە کوردەکان بۆ سەر ئەو ئەرمەنە لێ‌قەوماوانە پەرەی‌سەند . بێ‌گومان کاربەدەستانی عوسمانی هانیان ئەدانو پشتیان ئەگرتن . جارێکی‌تر بۆنی قەسابخانەیەکی‌تر بڵاوبۆوە .

رووسیاش وازی لەوە نەهێنا ئەرمەنەکان بەرەو تورکیارەوانە بکاتەوە . باڵیۆزو کۆنسۆلی رووسیا لە ئەستەمبوول ئاگادارکران ، هەوڵ بدەن ئەرمەنە گەڕاوەکان لە دەست درێژی بپارێزن[٣٠] . زینۆڤیف چالاکانە ئەم ئەرکەی خستە ئەستۆی خۆی‌و نامەی بۆ ئەستەمبوول ناردو نووسی : «ناتوانێ لەوە زیاتر چاوەڕوانی بکاتو ئەنجامی ئەوێت»[٣١] .

تورکیاش سووربوو لەسەر ئەوەی ناردنەوەی هەڵاتووەکان بوەستێت . پێویست‌بوو زینۆڤیف هوشیارانە لەسەر رێگاکەی خۆی بڕوات ، ئەوەبوو ، لە سەرێکەوە نەیەڵێ تورکیا دڵ‌گیربێت‌و لە سەرێکی تریشەوە زۆرداریی‌و بێ ئاسایشی زەبر نەسێنێ . زینۆڤیف بروسکەیەکی بۆ موراڤییف نارد تیایا هاتبوو .

«لەم دۆخی سیاسیی‌یەی ئیستەدا ، بووژاندنەوەی کێشەی ئەرمەنەکان ، بەلای کەمەوە کارێکی پڕ لە مەترسیی‌یەو بەلای زۆریشەوە کارێکە لە جێی خوی‌دا نیی‌یەو بە دڵنیشانی‌یە . ئاگاداریشی کرد لەوەی تورکیا نیازی وایە بەزەبری چەك ئەرمەنەکان لەسەر سنوور بهێڵێتەوە .»[٣٢] . رووسیا ئەوەی بۆ دەرکەوت کە ئەم هەویرە ئاو ئەکێشێ‌و ئاڵۆزی بەدووادا دێت‌و ئەوەی ئەیەوێ بیسەپێنێ وا بە ئاسانی نایەتەدی . لە ١٩ی حوزەیرانی ١٨٩٨دا نیکۆلای دووەم فەرمانی‌دا کە بۆ ماوەیەك – لەسەر خواست‌و ئارەزووی ئەرمەنەکان خۆیان – گەڕانەوەیان بوەستێ[٣٣] . لە پیتربورگ بڕیاردرا کە ئەبێ دەست بەرداریی رێی‌و شوێنی دیبلوماسیی نەبن‌و بەهۆی ناردنەوەی دەستەیەك ئەرمەنی‌تر تورکیا لە خۆیان زویر نەکەن .

لەو نامەیەی موراڤییف بۆ زینۆڤیڤی ناردبوو ، ئەوەی تیا هاتبوو کە ئەبێ وەك جاران لەسەر داخوازی‌یەکەی رووسیا دەربارەی ئەرمەنەکان سووربێت ، بەڵام پێویستە هوشیارانە بخرێتە بەر دەم کاربەدەستانی تورکیا .

«ئەبێ ئەوە لە یاد نەکرێ ، یەکەم ، پەیوەندی دۆستانەمان لە گەڵ تورکیادا بمێنێتەوە . دووەم ، کە لە هەمووی گرنگ‌ترە ، رێگا نەدرێت هەراو هوریای ئەرمەنەکان داگیرسێتەوەو دووا بە دوواشیی رووداوە خوێناوی‌یەکانی ساڵی ١٨٩٥ دووبارە ببنەوە ، ئەوەی رێگا پاك ئەکاتەوە هەڵاتوو روو

ـکەنەوە رووسیا . لە تەك ئەوەشدا ولاَتە مەزنەکان سەر لە نوێ دەست بخەنەوە کارو باری ناوەوەی تورکیا هەموو ئەمانە بەسەر یەکەوە دۆخێکی سیاسی ئاڵۆز دروست ئەکەن»[٣٤] .

لە ماوەی ساڵی ١٨٩٨–١٨٩٩دا ، زینۆڤیف چەند جار ، دەربارەی کێشەی ئەرمەنەکان ، گفتوگۆی بێ ئەنجامی لەگەڵ ئەستەمبووڵدا کرد .

ئەوەبوو ئارتین پاشای راوێژکەری وەزارەتی کاروباری دەرەوە ، باڵیۆزی رووسیای لەوە ئاگادارکرد کە گەڕانەوەی ئەرمەنەکان بۆ تورکیا ، مەترسی ئەوەی تێدایە ، سەر لە نوێ خوێن رشتنی بەدووادابێت . زینۆڤیف لەسەر ئەم رایە نەبوو ، بەڵکو لەو رایەدابوو کە لە توانادا هەیە رێو شوێنی وەها دابنرێت ، وابکات رووداوەکانی ساڵی ١٨٩٤–١٨٩٦ دووبارە نەبنەوە : «چونکە لەوانەیە ئەنجامەکانی زۆر خراپ‌بێت» . هەردوولا هەرەشەو گورەشەیان لەیەك ئەکرد ، بەلاَم وادەرئەکەوت هەر یەکەیان لەسەر راو هەڵوێستی خۆی مابوەوە[٣٥] .

لە بەهاری ساڵی ١٨٩٩دا ، موراڤێف ، پیلانێکی تری دانا ، کە بریتی‌بوو لەوەی والەتورکیا بکرێت رازی بێت بە گەڕانەوەی تەنیا دە هەزار لە سی هەزار ئەرمەنە هەلاَتووەکانو ئەوانەی ئەمێننەوە لە هەر شوێنێك بێ دامەزرێن[٣٦] . زینوڤیف ئەوەشی لە پیتربورگ گەیاند کە لەو چەند مانگەی دوواییدا دۆخی ناوەوەی ئەنادۆڵی رۆژهەلاَت لە رووی گەڕاندنەوەی ئەرمەنەکان بەرەو خراپ‌بوون چووە .

بەگە کوردەکان – زینۆڤیف ئەنووسێت – بەشێکی زۆری زەوی‌و زاری ئەرمەنەکانیان داگیر کردووە ، جا بۆ ئەوەی ئەرمەنەکان بتوانن بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان ، ئەبێ ئەو زەوی‌و زارانە لە خاوەنە نوێیەکانیان بسێندرێنەوە . کاربەدەستانی تورکیاش حەز لەمە ناکەن . بە تایبەتی لە ترسی ئەوەی کێشەو دەردە کۆنەکە ، واتە کێشەی ئیسلاحات لە ئاسیای بچووکدا سەر لە نوێ راست‌بێتەوە . ئەو کێشەیەی دەوڵەتە مەزنەکان ئەیکەنە بیانوو داردەست بۆ ئەوەی لووت بخەنە کاروباری ناوەوەی تورکیا ، بە جۆرێك بە دڵی رووسیا نەبێت . لە «کۆتایی‌دا ، زینۆڤیف رایەکی‌تر پێشنیار ئەکات ، کە بریتی‌یە لەوەی پێویست بە ناردنەوەی ئەو ئەرمەنی‌یانە ناکات کە لە رووسیا کاریان دۆزیوەتەوە .

نیکۆلای دووەم ، دەربارەی ئەم هەموو دەنگ‌و باسە بەم شێوە (دادپەروەرانە) راو هەڵوێستی خۆی ئەنووسێ : « هەر چونێك بێت با جارێ چاو لەم کێشەیە بقوچێنرێت دووا بخرێت»[٣٧] .

لە نامەیەکدا کە موراڤێف بۆ نیکۆلای دووەمی نووسیوە تیا هاتووە :

«با ئەو پێشنیارە بدرێت بە عەبدول حەمیدی دووەم کە بەرامبەر بەوەی رووسیا تەنازولاتی لەچەند کێشەیەکی سیاسی‌بکات ، با ئەویش لە کێشەکەی ئەرمەندا کاریان بۆ سووك بکات[٣٨] .» . هەر لەم رووەشەوە وەزیری کاروباری دەرەوە چەند ئامۆژگاری‌یەکی بۆ زینۆڤیف ناردو داوای لێ‌کرد وابکات تورکیا بە گەڕانەوەی دە هەزار ئەرمەنی قایل‌بێت[٣٩] . بەلاَم زۆری نەبرد رووسیا لەوە دڵنیابوو کە لەم رووەوە هیچی لە ئەستەمووڵەوە دەست ناکەوێ . بەم جۆرە تورکیا توانی دەستکەوتێکی سیاسی چنگ بخات .

بەمەش هەقی خۆی لەو سەرپێی دانەوانەی رووسیا لە رێك خستنی رووداوەکانی سەر سنووردا پێ‌کرد .

تیژ بوون وناخۆش بوونی پەیوەندی نێوان رووسیاو تورکیا لە سەر کێشەی گەڕانەوەی ئەرمەنە هەلاَتووەکان ، دەری خست کە تای تەرازووی سیاسی لە کوردستاندا لەق بووەو لەوانەیە مەترسی‌و تەقاندنەوەی رووداو بە دووای خوێدا بهێنێ . بە گشتی کێشەکەی کورد چەند ماناو ناوەرۆکێکی گەورەی هەبوو . لە رووی پەیوەندی کوردو ئەرمەنو کوردو تورك‌و رووس‌و ئەرمەنو رووس‌و کوردیشەوە شوێنێکی تایبەتی هەبوو ، هەموو ئەوانە لە گەڵ نیازو مەبەستی چەسپاندنی دۆخی

رۆژهەلاتی ناوەند بە یەكدا لكابوون . لەبەر ئەمە دامو دەستگای رووسیای قەیسەریی ، ئەوەی خستە بەر دەم خۆی . تاچ رادەیەك مەسەلەی كورد نرخی پیدراوە ؟ هەروەها ئەوەش خرایە بەردەم . چۆن كوردەكانی دەرەوەی رووسیا بەلای خۆیانا رابكێشن . هەروەها باسی ئەوەش كرا چ ڕێی و شوێنێك بگرن . هەتا بتوانن دەسەلاتو نفوزی رووسیا لەناو كوردەكاندا بەهێز بكەنو چۆن تەشەنە كردنی سیاسیی رووسیا لە كوردستاندا سەرخەنو قایم بكەن .

مووچە خۆرەكانی رووسیای قەیسەری ، بە هۆی ئەوەی لەوێ نیشیان ئەكردوو كوردەكانیان ئەناسیی و شارەزای دۆخی كوردستان بوون ، ئەوانە لە هەمووان زیاتر ئاوریان لە كوردەكان ئەدایەوەو بە تەنگیانەوە بوون . هەر بۆ نموونە ، سكریابینی یاریدەدەری كۆنسۆلی رووسیا لە ئەرزروم ، سەرنج بەرەو ئەو راستی یە رائەكێشیت بەوەی ئەنووسێ .

«ئەوەی لەم رۆژانەدا زۆر پێویستە ئەوەیە لە ناخەوە ، لە وردترین شتێكدا ، ناوی رووسیاو نفوزی رووسیا لەبەر چاوبێت ، بە تایبەتی لە ناو كوردەكاندا ، ئەوانەی تا ئەم ساتە دانیان بە دەسەلاتی دەولەتی عوسمانیدا نەناوەو سەریان بۆ نەواندووە . ئەو كوردانەی لە شەرەكانی قەفقاسدا ئێمەیان خوێندەوە . ئەبێ ئێمەش بۆ دوواڕۆژ بیانخوێنینەوەو حیسابیان بۆ بكەین» . لە رووی گرنگیی ئەم ئەركو كارەوە . واتە ڕێگا دۆزینەوە بۆ چوونە ناو كوردەكانەوە ، سكریابین ، — لە ئەنجامی تاقی كردنەوەو ورد بوونەوە لە كوردەكان — دێتە سەر ئەوەی رای خۆی بەم جۆرە دەربڕێتو بڵێ «لە ناو كوردەكاندا ئەو رایە بلاوە كە رووسیا زۆر دادپەروەرترو بە هێزو دەسەلاتترە لە توركیا ، ئەبێ ئێمەش ئەم هەلە لە دەست نەدەینو نەیەڵین زەمانە بە جێمان بهێڵێ ، بە تایبەتی توركیا خۆی لەناو كوردەكاندا ئەباتە پێشێو سەرۆكەكانیان ئەبات بۆ سوپای حەمیدی (٤٠) .» .

باشترین پێشنیارێك كە بۆ كێشەكەی كورد كرابێت ئەوەیە كە ئیڤانۆڤی یاریدەدەری كۆنسۆلی رووسیا لە بایەزید كردی . ئیڤانۆڤ لەم رووەوە ئەنووسێت : «پێویستە چەند بە تالیونێك لە كوردەكانی رووسیا . یان هێزێكی سوارەی كورد ، وەك ئەوانەی لە توركیانەكان پێك هاتوون . لە كوردەكانیش دروست بكرێت ، بەوە نارەزایی كوردەكانمان ئەسرینەوە . ئەبێ ئاگاداریی ئەمانە بكەین : یەكەم ، چاودێری دۆخی ئابووری كوردەكانمان بكەینو دووەم ، هەوڵ بدەین خوێندەواری لە ناویانا بلاو بكەینەوە . ئیڤانۆڤ ، چاوی بریبووە كێشەی خوێندەواریی ، چونكە هوشیاربوونەوەی كوردەكانو بلاوبوونەوەی خوێندەواریی لە ناویانا ، ئەبووە كۆسپێك لە ڕێی دەوڵەتی عوسمانیدا كە بە ناوی ئیسلامو لە ژێر پەردەی ئیسلامدا پروپاگاندەی ئەكردوو كوردەكانیان لە رووسیاو لە ئەرمەن راست ئەكردەوەو رقو كینەیان ئەخستە دڵیانەوە . با قوتابخانەكانمان وا لە كوردەكان بكاتو فێری ئەوەیان بكات كە بە رەگەز لە گەڵ توركەكاندا جیاوازن .

ئیڤانۆڤ كە ئەمانە ئەنووسێت ، ئەوەش لە یاد ناكات داوا بكات دۆخی ئابووری ناوچەكانی ئەودیو قەفقاس چاك بكرێتو پێش بخرێتو پەیوەندی ئابووریان لەگەڵ كوردستاندا بەهێز بكرێت ، بۆ ئەوەی كوردستان پشت بە رووسیا ببەستێتو هەتا لەو ڕێگەیەشەوە نفوزو دەسەلاتی سیاسیی رووسیا تەشەنە بكاتو جێ پێی خۆی قایم بكات» (٤١) .

لە پیتربورگو لە تفلیس ، بە كەم تەرخەمی یەوە روانیانە ئەم پێشنیارانەو بە هەوڵو كارێكی بێ ئەنجامو بۆشیان دانا . بەلام لە هەمان كاتیشدا ، كاربەدەستانی رووسیاو دامو دەستگاكەی قەیسەر ، بەرە بەرە ، هاتنە سەر ئەوەی دان بەوەدا بنێن كە پێویستە لە هەموو روویەكەوە لە كوردستان وردبینەوەو پەیوەندیی لە گەڵ سەرۆكە هەرە گەورەكانی كوردا پەیدا بكەن . لە كانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩١دا ، جەنەراڵ ئەبروچیف ، داوای لە زینۆڤیف كرد ، كە ئەوسا سەرۆكی بەشی ئاسایش بوو لە وەزارەتی كارو باری دەرەوەدا ، بە وردی

ـگای لە دۆخی ئەنادۆلی رۆژهەلات بێت‌و بەشی شەشەمی هێزەکەی ئەویٚ بە هێز بکات‌و لە کوردەکان پەل‌و لق سوارە پێك بهێنیٚ .

هەر لەبەر ئەمە ، وەکو ئەبروچێڤ ئەنووسیٚ ، ئەبیٚ بە زووترین کات ، لە شوێنی جەنەرالٚ (دینیتا)ی ، یاریدەدەری کۆنسۆلی پێشووی لیٚخراو ، یاریدەدەرێکی‌تری کونسۆل لە ئەرزروم دابنرێت[٤٢] . لەوساوە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی روسیاو چەند دەستگایەکی تری ناسراوی رووسیا ، کەوتنە ئەوەی بە قوولی لە کوردستان‌و دانیشتوانەکەی ورد ببنەوە . ئەمەش بووە مایەی مەترسی‌یەکی گەورە بۆ حکومەتی سولتان بۆ نموونە لە سالی ۱۹۰۳دا ، پرۆژەیەك دانرا بۆ ئەوەی بیعسەیەکی جوغرافی بۆ کوردستان‌و میسوپۆتامیا بنێردرێت . عەبدول‌حەمید ، خێرا داوای لە زینوڤیف‌کرد ، بە هەر حالێك بیٚ ناردنی ئەو بیعسەیە ، هیچ نەبیٚ بۆ سالێك دووا بخرێت . بیانووەکەشی ئەوەبوو ، بەریتانیاش هەلی وەها لە دەستی خۆی نادات‌و داوا ئەکات ئەویش بیعسەکی خۆی بۆ ناوچەکانی خوارووی تورکیا بنێرێت .

زینۆڤیف لەم رووەوە ئەنووسێت : «گەورەترین هۆکەوا لە تورکیا ئەکات لەم بیعسەیە بسلەمێتەوە و کۆسپ بێنێتە رێی ، ئەوەیە نیازو مەبەستێکی نهێنی هەبێت . بالێوزی رووسیا هەولێکی زۆری‌دا ، بیٚ وچان سەری ئەکردە سەر کاربەدەستانی تورکیا ، بەلام سولتان ، بە تایبەتی لە سەرەتادا رازی نەئەبوو بەلێنی نەئەدا ، بەلام لە دوواییدا بالێوزی رووسیا ، توانی کەللەرەقێتی کاربەدەستانی تورك نەرم بکات ، بەس بەو مەرجەی ژمارەی ئەندامانی بیعسەکە کەم بکرێتەوە[٤٣] .» . هەر لەم ماوەیەشدا ئاورێکی زۆر لە کوردو پەیوەندی نێوان میللەتەکانی ئەنادۆلی رۆژ هەلات درایەوە .[٤٤] . ئەوانەی بە زۆری ئاوریان لە کوردەکان ئەدایەوە ، نوێنەرە سیاسی‌یەکانی رووسیابوون ، ئەوانەی لە هەریمەکانی رۆژهەلاتی دەولەتی عوسمانیدا ئیشیان ئەکردو زۆر جار بە شێوەیەکی تایبەتی سەریان لە سەرۆکە کوردەکان ئەداو دیاریی بە بایەخیان ئەدانیٚ ، واتە ئەو جۆرە دیاریانەی لای کوردەکان بە نرخ بوون ، وەك چەك . هەروەها سەریان لە پیاوە ئایینی‌یە پیرۆزەکانی کوردو شوێنە پیرۆزەکان ئەدا[٤٥] . جارەهای جاریش هەولٚدرا . لە رێی کوردە موسلمانەکانی رووسیاوە ، ئەوانەی سەریان لە کوردستان ئەدا ، پروپاگاندە بۆ سوودو چاکەی رووسیا بکرێت . لە کانوونی دووەمی سالی ۱۹۰۱دا . (رایبۆ)ی ، یاریدە دەری کۆنسۆلی فەرەنسا لە ئەرزروم ، (دیل کاسێ)ی . . وەزیری کاروباری دەرەوەی فەرەنسای ئاگادر کرد کە لەویٚ قاو وایە ، کە ئەوانە لە گەلٚ سەرکردەکانی سوپای حەمیدیا گفتوگۆیان کردووەو لە سەر ئەوە رێك کەوتوون ، کە ئەگەر هاتو شەڕ لە نێوان رووسیاو تورکیا داگیرسا ، لا بدەنە لای رووسیا .

وادیارە ئەم دەنگ‌و باسە زۆری خراوەتە سەر . بەلگەش ئەوەیە یاریدەدەری کۆنسۆلی فەرەنسا هەموو ئەو دەنگ‌و باس‌و هەوالە دوور لە راستیانەی ئەنارد هەتا سیاسەتی رووسیا بە خراپ‌و قەلب‌و نارەوا بخاتە بەر چاو . بۆ نموونە هەرگیز ئەوەی دووپات ئەکردەوە کە رووسەکان ئاگری شەڕو ئاشووبەی نێوان کوردو ئەرمەنەکان خۆش ئەکەن ، بەو نیازەی ئەو ناوچانە لە تورکیا بکەنەوە[٤٦] . ئەمە لە کاتێکدا ، هەموو سەرچاوەکان ئەوە بە درۆ ئەخەنەوەو راست‌و رەوان دەری ئەخەن کە سیاسەتی دەرەوەی رووسیا هەرگیز بریتی بووە لەوەی ئاسایش لە رۆژهەلاتی نزیکدا چەسپاوبێت . هەرچۆنێك بیٚ ، نوێنەرەکانی رووسیا هەولیان داوە – جا با ئەو هەولدانە ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبووبیٚ – پەیوەندی لە گەلٚ کوردەکانی دەرەوەی رووسیا پەیدا بکەن ، بەو نیازەی دەسەلاتێکی سیاسی‌یان لە کوردستاندا هەبێت .

لە سالی ۱۹۰٤–۱۹۰٥دا ، سالی شەڕەکەی نێوان رووسیاو یاپوندا سەر لە نویٚ پەیوەندی نیوان رووسیاو تورکیا تێك چووەوە . هەر ئەوەندەی شەڕ داگیرسا ، زینوڤیف خێرا

کەوتە گفتوگۆ لە گەڵ زەکی پاشای سکرتێری دووەمی سوڵتان عەبدولحەمید . بە واتەی زەکی پاشا ، عەبدولحەمید هاوهەستی خۆی پیشان رووسیاداوە ، بگرە فەرمانی داوە بە سەرۆکی هێزی چوارەم ، چەند هەزار کوردێکی پڕ چەك کۆ بکاتەوەو رەوانەی قەفقاسیان بکاتو لەوێ ئامادە بن بۆ ئەوەی کاربەدەستانی رووس کەی ویستیان رەوانەی جەبهەیان بکەن[٤٧] ، (واتە جەبهەی شەڕی نێوان رووسیاو یاپۆن) . بەڵام زینۆڤیف ئەمەی بەگوێدا ناچێتو بڕوای پێ ناکات ، چونکە لەوە دڵنیابووە کە سوڵتان هەر لە خوێیەوە ئەو بەڵێنەی داوەو فێڵیان لێ ئەکاتو چاوەڕوانی ئەنجامی شەڕەکانی جەبهەی ئۆکیانی هێمن ئەکات .

لەراستیشدا هەر وادەرچوو . هەر ئەوەندەی هەواڵی نەهامەتی سوپاو ئوستۆلی رووسیا لە رۆژهەڵاتی دووردا بڵاوبۆوە ، پەیوەندی نێوان رووسیاو تورکیا تێكچوو . کاربەدەستانی عوسمانی دەستوبرد کەوتنە خۆئامادە کردن بۆ شەر لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا . یەکێك لەو خۆ ئامادەکردنەش پێك هێنانی سوپای حەمیدی بوو . هەموو ئەو کوردانەی لەبەر هەر هۆیەك بێ لە رووسیا گیرسابوونەوە ، بە ناوی ئەوەی گوایە ئەرمەنەکان خەریکی راست بوونەوەو راپەڕینن ، بانگ کرانەوە[٤٨] . کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانیو تارادەیەك کوردەکانی ئێرانیش ، ئەوانەی لە سوپای حەمیدیدابوون یان لەو سوپایەدا نەبوون لەسەر سنوورەکانی رووسیا گردکرانەوە . لەناو دانیشتوانی ئەنادۆڵی رۆژ هەڵاتدا قاو کەوتەوە ، کە شەڕی نێوان تورکیاو رووسیا زوو نابات دائەگیرسێتەوە . بە واتەی چەند دەنگو باسێك لە نیسانی ساڵی ١٩٠٤دا ، سوپای عوسمانی ( بە حەمیدییەکانەوە) کە لە ویلاتە رۆژهەڵاتەکانی تورکیدا لە نزیك سنووری رووسیا کۆکرابوونەوە ، ژمارەی ئەو سوپایە زیادکراو گەیشتە (٢٠٠) هەزار . ئەوی راستیبێت هەموو لقو پەلەکانی هێزی چوارەم ئامادەبوون بۆ شەڕ[٤٩] . لە هەمان کاتیشدا رووداو لە سنوورەکانی لای قەفقاسەوە دەستی پێ‌کرد . لە (٢٠)ی حوزەیران بەیەکاچوونێکی چەکدار رووی‌دا . لە (٢٨)ی ، ئەو مانگەشدا هێزی سوپایی عوسمانیو حەمیدییەکان پەلاماری سنوورەکانی رووسیایاندا . لە «(٢٨)ی ، ئابیشدا ، سەربازەکانی عوسمانیو حەمیدی ، سەرلەنوێ سنووریان بڕیو پەڕینەوە . لە ئەیلوولدا بە یەکاچوونێك لە گەڵ قاچاخچییەکاندا رووی‌دا ، سەربازە عوسمانییەکان یارمەتییان ئەدان .

لە (٣٠)ی ئەیلوولدا تەقە پەیدا بۆوە[٥٠] . لە ناوەراستی مارتی ساڵی ١٩٠٤دا ، بە فەرمانی چاری رووسیا ، زینوڤیف داوای لە تورکیا کرد هۆی ئەو خۆ بۆ جەنگ ئامادەکردنە روون بکاتەوە ؟ وەلامی تورکیاش بریتیبوو لەوەی کە تورکیا لە تاو بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەنەکانو بۆ بەرهەڵستی کردنی پەلامارادانو هێرسی چەتەکانی ئەرمەن کە لە رووسیاوە ئەیکەنە سەر تورکیا ، ناچارە خۆی ئامادە بکات[٥١]

(١) – فەسلی سێهەمی کتێبی «کێشەکەی کورد» . نووسینی . د . م . س لازارێف وەرگێڕ لە رووسییەوە : د . کاوس قەفتان

## پەراوێزەکانی فەسلی سێهەم :

١ – ف . ف . مینۆرسکی . کورد تێبینیو سەرنج . «دەنگو باسی وەزارەتی دەرەوە» ، کتێبی ٣٠، ، ١٩١٥ . لاپەڕە . ٢٢٩

٢ – تساگ ف نی ئا ، بەشی . ٤٤٦ . باسی ، ٤٨ . لاپەڕە . ٩٢ . ئەرشیفی میێری مێژوویی مەرکەزیی ، جورجیا ، یەکێتی کۆمارە شوورەوییەکان . بەشی . ٥٢١ . باسی . ٣١٠ ، (لەدووایدا ، تساگ نی ئا س س‌و) .

ئاف‌پ‌ر ، بەشی «خوانەکەی تورکیا (نوێ) » . ١٨٩٤ . باسی . ٣٦٠٠ . لاپەڕە . ١-٢ ، «خوانەکەی تورکیا (کۆن)» . ١٨٩٨-١٩٠٤ . باسی . ٣٦٠٠ . ٣٦١٢ . ٣٦٢٤-٣٦٢٧ ، ٣٦٣٠ . ٣٦٣٢ . ٣٦٣٣ .

٣ – ئاف‌پ‌ر . بەشی . «خوانەکەی تورکیا (نوێ)» . ١٨٩٩-١٩٠١ . . باسی . ٣٦٣٣ ، لاپەڕە . ١٠

٤ – هەمان سەرچاوە . ١٨٩٩ . . باسی . ٣٦٣٢ . لاپەڕە . ٣٢ ٣٣

٥ – هەمان سەرچاوە . ١٨٩٩-١٩٠١ . باسی . ٣٦٣٣ . لاپەڕە . ٨٩

٦ – سەیری ، تساگ نی ئا جورجیا . س‌س‌ر . بکە . بەشی . ٥٢١ . فایلی . ٢ . باسی . ٣٠٢ ، لاپەڕە . ٦

٧ – تساگ ف نی ئا . بەشی . ٤٥٠ . باسی . ٥٠ . تساگ نی ئا . جۆرجیا . س‌س‌ر . بەشی . ٥١٢ ، فایلی . ٢٠ . باسی . ٣٠٢ . لاپەڕە . ١ ـ ٦ .

٨ – تساگ‌ف‌ن‌ئا ، بەشی . ٤٥٠ ، باسی . ١٢٧ ، لاپەڕە . ٥٠

٩ – بۆرچێفسکی ، فەرماندەی هێزی یانزەهەمی پاراستنی سنووری موتەسەریفیەتی یەریڤان ئەنووسێت : جاران ، کاتێك سنوورەکانی نێوان رووسیاو تورکیا پاراستنیان نەبوو ، کوردەکانی رووسیاو تورکیا کە خزمایەتی‌یان لەگەڵ یەکدا هەبوو ، بەسەربەستی هاتوو چۆیان ئەکرد . ئەم هاتوو چۆیەش بۆ لەوەڕو سەرچاوەی ئاوو شتی‌تر بوو .

بەڵام لە مایسی ساڵی ١٨٩٩دا ، هێزێکی تایبەتی گەیشتە ناوچەی ئارارات‌و ئەو رێگایەی داخست کە لە هەمان کاتیشدا رێگایەکی گەورەی قاچاخ‌چێتیش بوو . لەم شوێنەدا بەیەکاچوون دەستی پی‌کرد . چونکە ناردنی ئەو هێزە بەدڵی کوردەکانی رووسیاو تورکیا نەبوو . (ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «خوانەکەی تورکیا (نوێ)» ، ١٨٩٩ . ، باسی ٣٦٣٢ ، لاپەڕە . ٢٧–٢٨) .

١٠ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «باڵیۆزخانە لە ئەستەمبوڵ» ، ١٩٠٥ . ، باسی . ٤٠٨٣ ، . لاپەڕە . ٢٨–٣٦ .

١١ – ك . ن . سمیرنۆڤ ، گەشتێك بەباکووری کوردستاندا ، – «دەنگ‌و باسی بەشی قەفقاس ، ن‌رگ‌ئۆ» ، بەرگی . ١٧ . ١٩٠٤ . . لاپەڕە . ٣٢٦ .

١٢ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «باڵیۆزخانە لە ئەستەمبول» . . ١٩٠٥ . . باسی . ٤٠٨٤ . لاپەڕە . ٣٢–٣٣

١٣ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» ، ١٨٩٧ . . باسی . ٣٩ ، لاپەڕە . ٢٣–٢٤

١٤ – هەمان سەرچاوە ، باسی . ٤١ ، لاپەڕە . ٢ ، ١١ . ١٢ .

١٥ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «باڵیۆزخانە لە ئەستەمبول» . ١٨٩٨–١٩٠٩ . . باسی . ٣٧٠٦ ، لاپەڕە . ٦–٧

١٦ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» . ١٨٩٦ . . باسی . ٩٨٧ . لاپەڕە . ١٦٤ ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی کاروباری دەرەوە» . ١٨٩٥ . . باسی . ٢٧ . لاپەڕە . ١٢ . بەشی . «خوانەکەی تورکیا (نوێ)» . ١٨٩٤ . . باسی . ٣٦١٠ . لاپەڕە . ٤–٥

١٧ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی کاروباری دەرەوە» . ١٨٩٨ . . باسی . ٢٨ . لاپەڕە . ٣٨–٣٩

١٨ – هەمان سەرچاوە ، ١٨٩٩ . . باسی . ٢٦ . . لاپەڕە . ٧٤

١٩ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «خوانەکەی تورکیا (نوێ)» . ١٨٩٩ . . باسی . ٣٦٣٢ . لاپەڕە . ٦

٢٠ – هەمان سەرچاوە . ١٨٩٩–١٩٠١ . . باسی . ٣٦٣٣ . لاپەڕە . ٥٤

٢١ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی دەرەوە» . ١٨٩٩ . . باسی . ٢٧ . لاپەڕە . ٨٦–٨٧

٢٢ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . « باڵیۆزخانە لە ئەستەمبول» . ١٩٠٥ . . باسی . ٢٦٧٣ . لاپەڕە . ٢٠–٢٢

٢٣ – تساگ‌ف‌ن‌ئا ، بەشی . ٤٥٠ (کۆمەڵە کەرەستەی کۆکراوە دەربارەی مێژووی رووسیا) ، باسی . ١٢٧ . لاپەڕە . ١–٦ . ٩–١٠ .

٢٤ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی . .» . ١٩٠٠ . . باسی . ٢٩ . لاپەڕە . ٣٢٧ ٣٣١

٢٥ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» . ١٩٠٠ . . باسی . ١٦٣٦ . لاپەڕە . ٥٨ .

٢٦ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی . . .» . ١٩٠٠ . . باسی . ٢٩ . لاپەڕە . ٨

٢٧ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» . ١٩٠١ . باسی . ٥٦ . لاپەڕە . ٢

٢٨ – هەروا بە خۆڕایی نەبوو کە زینۆڤیف بە شانازی‌یەوە نووسی کە ئەم گفتوگۆیە تینو جۆشێکی «چۆن بە باڵیۆزخانەکەدا ، وەهاش دای بە کونسوڵخانەکەی ئەرزروم» . (ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارتی . . .» ، ١٩٠١ . ، باسی . ٢٤ ، لاپەڕە . ١٦٦ .

٢٩ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» ، ١٩٠١ ، باسی . ٥٧ لاپەڕە . ٩٢

٣٠ – هەمان سەرچاوە ، ١٨٩٨ . ، باسی . ٤٣ ، لاپەڕە . ٩٩

٣١ – هەمان سەرچاوە . لاپەڕە . ١٠١

٣٢ – هەمان سەرچاوە ، لاپەڕە . (١٣٨–١٣٩

٣٣ – هەمان سەرچاوە لاپەڕە . ١٤٦

٣٤ – هەمان سەرچاوە ، لاپەڕە . ١٨٩–١٩٠

٣٥ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی . .» ، ١٨٩٩ . . باسی . ٣٥ . بەرگی . ١ ، لاپەڕە . ٢٧١

٣٦ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» . ١٨٩٩ . . باسی . ٤٧ . لاپەڕە . ١٠٠–١٠٤

٣٧ – هەمان سەرچاوە ، باسی . ٤٨ . لاپەڕە . ٣–٤

٣٨ – هەمان سەرچاوە ، لاپەڕە . ٥

٣٩ – هەمان سەرچاوە ، لاپەڕە . ٨–٩

٤٠ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «باڵیۆزخانە لە ئەستەمبول» . ١٩٠١–١٩٠٤ . باسی . ٤٤٩٢ ، لاپەڕە . ١٩–٢٠

٤١ – هەمان سەرچاوە ، ١٩٠٥ . باسی . ٤٠٨٣ . لاپەڕە . ٣٤–٣٦

٤٢ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» . ١٨٩١–١٩١٤ . . باسی . ٢٩٤٥ . لاپەڕە . ١

٤٣ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی . .» . ١٩٠٣ . . باسی . ٢٨ . لاپەڕە . ٢٧٢–٢٨٢ .

٤٤ – پ . ئا . تۆمیلۆف ، لەو رایۆرتەیا کە دەربارەی گەشتەکەی بەکوردستاندا کردی لە هاوینی ساڵی ١٩٠٣دا بەم جۆرەی خوارەوە ئەنووسێت : « . . کێشەی نەتەوەیی لە تورکیا . لە رووی پەیوەندی جەنگی‌یەوە ، دەورێکی گرنگ بگرە یەکالاکەرەوەی هەیە .» . (تێبینی‌یەکانی موقەدەم تۆمیلۆف دەربارەی گەشتەکەی بە ئاسیای تورکیادا ساڵی ١٩٠٤ – بارەگای گشتی – بەشی . ١ . س‌پ‌ب . ،(لاپەڕە . ٤)

٤٥ –

(Documents diplomatiques francais 112 – me serie, vol. I. P. 614

٤٦ –

ibid . PP. 664 – 665

٤٧ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی . .» . ١٩٠٤ . . باسی . ٢٦ . لاپەڕە . ٥٥–٥٦

٤٨ – تساگ ن‌ئا ، جورجیا س‌س‌ر . بەشی . ٥٢١ . فایلی . ٢ . . ١٩٠٤ . باسی . ٣١٠

٤٩ – ئاف‌پ‌ر . بەشی . «ئەوراق وەزارەتی . .» . ١٩٠٤ . باسی . ٢٦ . لاپەڕە . ١٧٠ . باسی . ٢٧ . لاپەڕە . ٧٨ . باسی . ٢٩ . لاپەڕە . ٤٥٠–٤٩٩ . بەشی . «ئەرشیفی سیاسی» . ١٩٠٤ ، باسی . ١٦٤٠ ، لاپەڕە . ٦٢

٥٠ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . « خوانەکەی تورکیا (نوێ)» . ١٩٠٥ . باسی ٦٩٦٨٠ . لاپەڕە . ١–٥ ، بەشی . «خوانەکەی ئێران» . ١٩٠٥ . . باسی . ١٦ . لاپەڕە . ٢ . ٤

٥١ – ئاف‌پ‌ر ، بەشی . «ئەوراق وەزارەتی . .» . ١٩٠٤ . . باسی . ٢٦ . لاپەڕە . ١٧٠–١٧٤

# هەندێ زانیاری ی تازەی مێژوویی لەبارەی نەورۆزەوە

**کەریم مستەفا شارەزا**

**پێشەکی :-**

نەورۆز لە سەردەمێکی یەگجار کۆنەوە وەك جەژنێکی گەورەو شکۆدار لەناو کوردو کۆمەڵە نەتەوەیەکی ئاریایی‌دا بلاوبۆتەوە ، هەر کۆنبووەو نوێبۆتەوەو ، هەموو ساڵێك لەگەڵ نەمانی سەرماو سۆڵی زستانو بووژانەوەی گژوگیاو درەختی قەدپاڵو دۆڵو دەشتو دەر ، وەك رۆژێکی خۆشی پڕ خێرو فەر گەڕاوەتەوەو خەڵکیش لە هەموو لایەکدا بەزمو ئاهەنگی شادیی بەهارو سەری ساڵی تازەی ژیانیان بۆ گێڕاوە .

هەر نەتەوەیە بە جۆرێك لە بنجو بناوانی ئەو جەژنە دێرینە وردبۆتەوەو بردوویەتیەوە سەر جۆرە رەگ‌و ریشەیەکی ئەفسانەیی یا سروشتی یاخود مێژوویی . زۆربەیان بردوویانەتەوە سەر رەگی سروشتیو بە رۆژی نەمانی سەرماو سۆڵی زستان سەختی پڕ لە زەبرو زەنگیو ، بە رۆژی داهاتنی وەرزی بەهاری خۆشی پڕ زیندەگانی داناوە .

هەیە ئەو رۆژە بە یادی ئەفسانەکەی زاڵبوونی هێزی خوداوەندی خێرو رووناکی بەسەر هێزی شەڕو تاریکی‌یان داوەتە قەڵەم ، هەشە بە رۆژی نوێی ساڵی ی تازەی هەتاوی داناوەو ، لەلای هەندێ نەتەوەی دیکەش نەورۆز بە رۆژی سەرکەوتنی هێزی میللەتی زۆرلێکراو بەسەر هێزی ستەم‌و زۆرداری‌یان داناوەو ، بۆ زانینی داهاتنی ئەو رۆژەش لە شەوی جەژن‌دا ئاگریان لەسەر چیاو شوێنە بەرزەکان کردۆتەوە تاکو هەموو کەسێك بزانن سبەی جەژنی نەورۆزە . لەلای نەتەوەی کورد ئەم بۆچوونەی دوایی لەپاڵ رەگە سروشتی‌یەکەی ئەو جەژنەدا ، لە هەموو بیرو بۆچوونێکی دیکە بەهێزترەو ، لە سەردەمێکی گەلێك کۆنەوە هەر بەو ناوەوە یادی ئەو رۆژە پیرۆزە کراوەتەوە .

**نەورۆز لە سەردەمی ساسانی‌یەکاندا :**

هەرچەندە مێژووی پەیدابوونی نەورۆز گەلێك بە پێش سەردەمی ساسانی‌یەکان دەکەوێتەوەو لە هەندێ سەرچاوەی مێژوویی‌دا سەرهەڵدانی ئەو جەژنە دەبەنەوە بۆ سەردەمی جەمشیدی شای پیشدادی‌یەکانو[1] لە هەندێ سەرچاوەی تریش‌دا دەبرێتەوە بۆ راپەرینەکەی کاوە لە دژی ئەژدەهاکی زۆردار . بەلام تاکو ساسانی‌یەکان نەهاتنە سەرحوکم (٢٢٦-٦٤٠ز) و حوکمرانی ی عیراقو ئێرانی کۆنیان نەگرتەدەست نەورۆز گرنگی‌یەکی ئەوتۆی پێنەدراو نەبوو بە

جەژنێکی ڕەسمی . هەموو ساڵێ شایەکانیان ڕاستەوخۆ چاودێری بەزمو ئاهەنگ‌گێرانی ئەو ڕۆژەیان دەکردو لە نەورۆزی بەهارانو ڕۆژانی میهرەگانی پایزاندا باجێکی تایبەتیان لە وەرزێرو جووتیارەکان وەردەگرت ، پێیان دەگوت «باجی نەورۆزو میهرەگان»[٢] .

بەو بۆنەیەی کە عیراق بەشێك‌بوو لەو وڵاتانەی کە ژێردەستی ساسانی‌یەکان بوو ، ئەو باجەیان وەکوو یەك لە عەرەب‌و غەیرە عەرەبەکان وەردەگرت‌و دەیان خستە ناو گەنجینەی خۆیانو هەموو تەنگوچەڵەمەیەکی ئابووری‌ی دەوڵەتیان پێ چارەسەر دەکرد ، ئەو دابودەستووری باج‌وەرگرتنە تاوەکوو هاتنی ئیسلام بۆ عیراق‌و ئێرانو لەناوچوونی حوکمی ئەو دەوڵەتەی ساسانییان هەر بەردەوام‌بوو .

**نەورۆز لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدی‌یەکاندا :-**

لەگەڵ پەیدابوونی ئایینی ئیسلامو سەرکەوتنی عەرەبە موسڵمانەکانو لەناوچوونی دەستەڵاتی ساسانی‌یەکان لە عیراقو ئێرانو کوردستانو خوراساندا ، بیرو باوەڕی ئەو ئایینە نوێیە هەموو بیرو باوەڕێکی پێش خۆی نابوودو پووچەڵ‌کردو پەردەیەکی ئەستووری بەسەرداداند ، یەکێك لەو دابونەریتانە جەژنی نەورۆزو بوو قەدەغەکراو بەجۆرە پاشماوەیەکی نەریتی ئایینی کۆنی لەڕووەت‌کەوتووی پێش ئیسلام درایە قەڵەمو خەلیفەی دووەمی ڕاشیدی (عومەری کوری خەتتاب (١٣-٢٣ك) کە کارو فرمانی موسلمانانی گرتەدەست باج‌وەرگرتنی نەورۆزو میهرەگانی قەدەغەکرد[٣] ، چونکە بە دابونەریتێکی لە ڕووەت‌کەوتووی پێش ئیسلامی داناو ، ئیسلامەتیش کە هات (چەندان عادەت‌و دەستووری عەرەبەکانی لەگەڵ خۆی‌دا سەپاند بەسەر نەتەوە نا عەرەبەکان‌داو ، هەرچی شتێك نەك هەر بەگوێرەی ئایینی ئیسلام ، بەڵکوو بەگوێرەی ئەو عادەت‌و دەستوورە عەرەبیانەیش کە لەگەڵ زەوقی عەرەبەکان‌دا نەدەگونجا نابوودکراو ، هەرکەسێ باسی بکردایە سزادەردراو ، ڕەوشتی بە پێچەوانەی ئیسلام لەقەڵەم‌دەدرا)[٤] .

ئەو پەردە بەسەرداداند و قەدەغەکردنەی نەورۆزبە درێژایی ماوەی حوکمرانی خەلیفە ڕاشیدی‌یەکان بەردەوام‌بووەو ، ڕێگە نەدراوە یادی ئەو ڕۆژە بکرێتەوە ، تەنها لەدوادوای سەردەمی خەلیفایەتی (ئیمامی عەلی کوری ئەبو تالیب) نەبێ ، وەك هەندێ لە نووسەرە کوردەکان بۆیان ساغ‌بۆتەوەو ، دەڵێن : «ئیمامی عەلی لە مزگەوتی کووفەدا ڕێگای‌داوە بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە شیرینی بەسەر نوێژکەرەکان‌دا دابەش‌بکرێت»[٥] . ئەو ماوەدانەی خەلیفەی چوارەمیش لە قاڵبێکی تەسك‌دا بووە ، تەنها ڕێگەی شیرینی دابەش‌کردنی داوەو بەس ، بەبێ ئەوەی ڕێگەی ئاهەنگ‌گێرانو ئاگرکردنەوەی شەوانی نەورۆز بدرێ‌و . باجی دەستدیاری نەورۆز لە ڕۆژی جەژن‌دا لە خەڵکەکە وەربگیرێت .

**نەورۆز لە سەردەمی ئومەوی‌یەکاندا :-**

لە دوای شەهیدبوونی ئیمامی عەلی کوری ئەبو تالیب حوکمی خەلیفە ڕاشیدی‌یەکان بەسەرچووو ، ئومەوی‌یەکان لە ساڵی ٤١ی کۆچی‌یەوە هاتنە سەرحوکمو ، لەبەر هەندێ هۆی ئابووری ئەو باجەی کە لەسەردەمی حوکمرانی‌ی ساسانەکان بە ناوی باجی نەورۆزو میهرەگانەوە لە خەڵکەکە وەردەگیرا خەلیفە عومەری کوری خەتتاب قەدەغەی‌کردبوو لەسەردەمی ئومەوی‌یەکان دووبارە دەست کرایەوە بە کۆکردنەوەی‌و[٦] وردە وردە نەورۆزیشی پێ‌ژیایەوە .

موعاویەی کوری ئەبوو سوفیان یەکەمین خەلیفەی ئومەوی (٤١-٦٠ك)و ، یەکەمین حوکمران‌بوو لە ئیسلام ئەو باجەی نەورۆزی بەهارانو میهرەگانی پایزانی ژیاندەوە . هۆی ئەو ژیاندنەوەیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تەنگوچەڵەمە دارایی‌یە توندو تیژەی ~~لە تەنجامی~~ سیاسەتە نەرمو شلەکەی‌دا تووشی‌بووبوو . چونکە کە هاتە سەرحوکم خەڵکێکی زۆر لە دژی وەستان بە تایبەتی خەواریج‌و عەلەوی‌یەکان . ئەمیش بۆ ئەوەی حوکمەکەی سەربگرێ‌و بچەسپێ ، هەستا دەستەیەکی لە

بەهێزترین میرو والی لە وولاّتەکانی ژێر حوکمی خۆی دامەزراندو ، مەرج و پەیمانی نووسراوی پیّدان کە هەر خەرج و باجێکی لەو وولاّتانەیان دەستدەکەویّ بۆ خۆیان بیّ و[٧] ، تەنها لە خوتبەی رۆژانی هەینی ناوی «موعاویە» وەك خەلیفەی موسڵمانان بێت ، لەو میرو والی یانەی کە پشتی پیّبەستن «عەمری کوڕی عاص» بوو کردی بە والی میسرو ، زیاد کوڕی (أبیە)یشی کردە والی بەسراو[٨] باج و خەراجەکەی ئەو وولاّتانەی لەقەبەڵ کردن .

موعاویە بۆ وەرگرتنی باج و خەراج تەنها وولاّتی شامی بەدەستەوە بوو ، ئەوەی دەستیشی دەکەوت بەشی هەموو مەسرەفێکی دەربارو بەهێزکردنی حیزبی ئومەوی و پێکەوەنانی سوپای بەهێز بۆ داگیرکردنی وولاّتانو بلاّوکردنەوەی ئایینی ئیسلامی نەدەکرد[٩] . جا بۆ چارەسەرکردنی ئەو تەنگوچەڵەمە ئابووری یە توندوتیژەی ئەم هەنگاوانەی نا :-

(١) - پێشخستنی کشتوکالّ لە رێگەی دابەش کردنی زەوی زار بەسەر هەندیّ پیاوی دەستەلاّتدارو وەرزێران داو ، گرنگی دان بە جۆگەو بناوان هەڵبەستن و بەراوکردنی زەوی پشت ئاو ، بەم هەنگاوەیشی سوودێکی زۆری لە پارەو پوولی باج و خەراجی ئەو زەوی زارە کشتوکالی یانە وەرگرت[١٠] .

(٢) - بڕیاری دا هەر والی یەك لە هەر وولاّتێکی سەر بە دەوڵەتی ئومەوی بمریّ ، ئەوا جگە لە پارەی گەنجینەی دەوڵەت ، دەبوایە نیوەی پارەی میراتی تایبەتی ئەو والی یە بۆ گەنجینەی تایبەتی خەلیفە بیّ[١١] .

(٣) - دانانەوەی دابو دەستووری وەرگرتنی دەستودیاری و بەخشیش لە خەڵکەکە ، لە جەژنەکانی نەورۆزو میهرەگاندا[١٢] :- ئەم هەنگاوەی موعاویە لەهەموو هەنگاوەکانی تری زووتر هاتەبەر ، بە دانانەوەی باج وەرگرتن لەو دوو جەژنەداو ، بەم شیوەیەی خوارەوە ئەو دابودەستوورەی ژیاندەوە :-

موعاویە لە گەرمەی ئەو تەنگوچەڵەمە دارایی یە توندوتیژەی کە تووشی بووبوو ، پرسیاری لە هەندیّ پیاوی پیری دنیادیتەی وولاّتانی عیراق و ئێرانکرد لەبارەی سیاسەتی شایە ساسانی یەکانو چۆنیەتی خۆرزگارکردنیان لەو تەنگوچەڵەمە دارایی یانەی کە تووشیان دەبوون . لە وەلاّمدا پێیان گوت : « جاران لە سەردەمی پێش ئیسلامدا ، شایەکان جگەلە خەراج وەرگرتن لە زەوی وزاری کشتوکاڵی ، بۆ راستکردنەوەی باری لاسەنگی ئابووری یان ساڵیّ دووجار دەستودیاری و بەخشیشیان بەبۆنەی جەژنەکانی نەورۆزو میهرەگانەوە لەخەڵکەکە وەردەگرت و گەنجینەی خۆیان پیّ دەوڵەمەنددەکرد» . کە موعاویە ئەمەی لیّبیستن ، بیری لە گەڕاندنەوەی ئەو جۆرە رەسم و باجە کردەوەو ، بۆی دەرکەوت کە نەورۆز هەرچەندە دابونەریتێکی پێش ئیسلام بووەو ، لە سەرەتای بەهاراندا کراوەو میهرەگانیش لە پایزانداو ، ئایینی ئیسلامیش قەدەغەی کردوون ، بەلاّم چونکە ماوەیەك بەسەر بلاّوبوونەوەو چەسپانی ئەو ئایینەدا رۆیشتبووو ، جەژنەکانیش پتر پەیوەندییان بە باری سروشتی ی زەوی و گۆرانی ئاووهەواو ژیانی ئادەمیزادەوە بووەو ، هیچ مەترسی یەکیان لەسەر بیرو باوەری ئیسلام نابیّ گەر زیندووبکرێنەوە ، بۆیە (بڕیاری دا کە سەرلەنویّ باجی دەستودیاری نەورۆزو میهرەگان لەسەرخەڵکەکە دابنرێتەوەو فەرمانی بە والی یەکانی دا تاکو ئەو باجەی بۆ وەرگرن و بۆی بنێرن و هەر جارەی لە نەورۆزدا (١٠ ملیۆن درهەم)و لە میهرەگانیش دا هەمان گوژمە پارەی بۆ بنێردری)[١٣] .

هەر لەبارەی ژیاندنەوەی دابونەریتی نەورۆزو کۆکردنەوەی باجی دەستودیاری یەکانی یەوە ، موعاویە لەسەر والی بەسرا عەبدورەحمان کوڕی (أبی بکرە)ی کردو فەرمانی پیّدا کە دەبیّ (٥٠ ملیۆن درهەم )ی لە خەراجی وولاّتی بەسراو (١٠ ملیۆن درهەم)ی لە باجی دەستودیاری یەکانی نەورۆزی بۆ بنێری[١٤] .

بەم جۆرە موعاویە بۆ هەموو والی یەکانی رۆژهەلاّتی ئیمپراتۆری یەتی ئیسلامی نووسی و پیّی راگەیاندن کە دەبیّ ئەو

باجه لەسەر خەڵکەکە دابنرێتەوەو ، دەستودیاری‌یەکانی (نەورۆز)و (میهرەگان)ی بە تەواوی بۆ کۆبکرێتەوەو بۆی بنێردرێتە شام .

موعاویە بەو بڕیارەی وەرگرتنی باجی دەستودیاری نەورۆزو میهرەگان ، نەك هەر تەنها ئەو ڕەسمە کۆنەی ژیاندەوە ، بەڵکو جەژنەکانیشی بایەخ‌پێدان‌و ژیاندنیەوە ، بەتایبەتی (جەژنی نەورۆز) ، چونکە دەکەوتە سەرەتای وەرزی بەهارو سەرەتای ساڵێکی تازەی ژیانی ئادەمیزادو بە ڕەسمی ڕێگە بە خەڵکەکە دەدرا ئاهەنگ بەو بۆنەیەوە بگێڕن‌و لە شیعرو ئەدەبیاتی سەردەمی ئومەوی‌یەکانیش‌دا تەنها ناوی نەورۆز ڕەنگی داوەتەوەو بە (النیروز) دەریان‌بڕیوەو (میهرەگان) ئەو ڕەنگدانەوەی لەناو چامەی شاعیرانی ئەو سەردەمەدا نەبووە .

بەم جۆرە دەبینین (موعاویە) نەورۆزی بە هەموو دابونەریتێکی‌یەوە ژیاندەوە بەرانبەر بە وەرگرتنی «ڕەسمی ڕێگەدان»ی یادکردنەوەی‌و ئاهەنگ‌گێڕانی خەڵکی ئەو وولاتانەی کە نەورۆزیان لی‌دەکراو ، ئەو جۆرە «ڕەسم»ەش بوو بە باجێکی نوێی تایبەتی لەسەردەمی حوکمی ئیسلام لەپاڵ (خەراج)ی زەوی‌وزاری کشتوکاڵی‌و باجی (جزیە) کە لە ناموسڵمانەکانی وەکوو جولەکەو دیانان وەردەگیرا .

دوابەدوای «موعاویە»ش خەلیفەکانی تری دەوڵەتی ئومەوی ڕێگەی جێ‌بەجێ‌کردنی دابونەریتی نەورۆزیان داوەو باجی خۆیان وەرگرتووە . هەروەك عەبدولمەلیکی کوری مەروان (٦٥–٨٦ك) کە هاتە سەرحوکم والی‌یەکانی راسپارد ئەو باج‌و ڕەسمەی بۆ وەرگرن ، یەکێك لەوالی‌یە هەرە بەهێزو ناودارەکانی «حەججاجی کوری یوسفی سەقەفی» بوو ، زۆر بە گەرمی‌یەوە ئەو ڕەسمەی لە عیراق‌و ئێران‌و خوراسان‌دا کردەوە بە عادەت‌و لە نەورۆزو میهرەگان‌دا دەست‌و دیاری‌و بەخشیشی وەرگرت»[١٥] . نەك هەر هەندە بەڵکو کە شاری «واسیت»ی بنیات‌ناو کردی بە پایتەخت ، یاساو نەریتی نەورۆزی لە کۆشکەکەی لە شاری «واسیت» بووژاندەوە[١٦] .

هەموو خەلیفە ئومەوی‌یەکان پەیڕەوی موعاویەی بنیات‌نەری دەوڵەتی ئومەوی شامیان کردو ، بە ئاشکرا ڕێگەیان‌دا یادی نەورۆز بکرێتەوەو باجی دەستودیاری‌یەکانی ئەو جەژنانەشیان وەرگرت ، تەنها خەلیفەی هەشتەم عومەری کوری عەبدولعەزیز «٩٩–١٠١ ك» نەبێ ، ئەو ڕەسمەی نەویست‌و نەورۆزی قەدەغەکردەوە[١٧] . چونکە گوتی : (مادامکی لەسەردەمی خەلیفە راشیدی‌یەکان‌دا ئەو ڕەسمە نەبووەو ، ئەو باجە وەرنەگیراوە ، منیش نامەوێ‌و پەیڕەوی ئەوان دەکەم‌و لە ڕەوشتی ئەوان لانادەم) . هەر بۆیەش‌بوو بەو خەلیفەیەیان دەگوت «خەلیفەی راشیدی‌ی پێنجەم» ، چونکە ڕەوشت‌و سیاسەتی وەکوو ئەوان بوو .

بەلام کە خەلیفەی نۆیەم ، یەزیدی کوری عەبدولمەلیك (١٠١–١٠٥ ك) لە دوای عومەر هاتە سەرحوکم یەکسەر والی‌یەکانی ئەوی لەکار دەرکردن‌و خۆی والی تازەی لە جێ دامەزراندنەوەو ، دووبارە جەژنەکانی نەورۆزو میهرەگانی ژیاندەوەو دەستی‌کردەوە بە وەرگرتنی باجی دەستودیاری‌یەکانیان[١٨] .

**نەورۆز لەسەردەمی عەبباسی‌یەکان‌دا** :–

لە دوای نەمانی حوکمی ئومەوی‌یەکانی شام‌و هاتنی عەبباسی‌یەکان جەژنی نەورۆز پتر بایەخ‌و گرنگی پی‌دراو ، نرخ‌و ڕووەتێکی وەکوو سەردەمی پێش ئیسلامی پی‌درایەوە ، نەك هەر لەلایەن والی‌یەکانی وولاتەکانی ڕۆژهەلاتەوە چاودێری دەکراو باجی ڕێگەدانی ئاهەنگ‌گێڕانی وەردەگیرا ، بەڵکوو خەلیفەکان خۆیان گرنگی‌یان پی‌داو ، پیرۆزبایی شاعیران‌و سەرجەمی خەڵکەکەیان قبووڵ‌دەکرد .

لەوانە خەلیفەی حەوتەمی عەبباسی‌یەکان ئەلمەئموون (١٩٨–٢٢٨ك) نەك هەر بە ڕەسمی ڕێگەی خەڵکەکەی‌دا ئاهەنگی نەورۆز بگێڕن ، بەڵکوو خۆیشی لەهەموو کەسێکی دیکە زیاتر ئاگاداری بن‌و بنچینەی مێژووی پەیدابوونی جەژنی نەورۆز بوو[١٩] . لە دوای ئەویش خەلیفەو کاربەدەستانی

عەبباسییان بییریان لە ڕۆژێکی دیاریکراوی نەگۆڕاو دەکردەوە تاکوو بیکەن بە سەرەتای کاتی باجو خەراج کۆکردنەوە لە خەڵکەکەو ، هەر لە ئەنجامی ئەوە بوو ، خەلیفە ئەلموتەوەکیل عەلاڵلا (٢٣٢–٢٤٧ ك) لە ساڵی ٢٤٢ی کۆچی‌دا فەرمانی دەرکرد کە دەبێ دەست‌پێ‌کردنی خەراج‌کۆکردنەوە بخرێتە ڕۆژی نەورۆزەوە[٢٠] . هۆی ئەو بڕیاردانەیشی دەگەڕێتەوە بۆ داهاتنی ڕۆژی نەورۆز لەهەموو ساڵێك‌دا لە کاتێکی دیاریکراوی نەگۆڕدا ، چونکە پێشتر «خەرج» رسومات لەسەری ساڵی کۆچی‌دا کۆدەکرایەوەو ، هێنراو گۆردرا بە ڕۆژی نەورۆز[٢١] .

ساڵ بە ساڵ پتر گرنگی دەدرا بە نەورۆز تاکو لەسەردەمی خەلیفەی بیستو حەوتەمی عەبباسی ئەلموقتەدی بیئەمریللا «٤٦٧–٤٨٧ك»و لە کاتی دەستەلاتداریەتی سوڵتان جەلالوددەولە[٢٢] (مەلیکشای سەلجوقی)دا تەقویمیان گۆڕیو نەورۆزیان بەسەری ساڵی تازە دانا ، کە ئەو کات ڕێکەوتی ١٥ی مارتی ساڵی ١٠٧٩ ی زایینی ئەکرد[٢٣] .

بەم جۆرە دەبینن نەورۆز پێ‌بەپێ ڕووەت‌و نرخی جارانی ، لە سەردەمی ئیسلام‌دا پەیداکردەوە ، دوای ئەوەی کە لە سەرەتای پەیدابوونی ئەو ئایینە نوێیەوە تاکوو دوادوای سەردەمی خەلیفایەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ، نەورۆز وەك دابونەریتێکی کۆنی سەر بە ئاینێکی بەتاڵ‌کراوی پێش ئیسلام سەیرکراوەو کەم‌و زۆر ماوە بە کەس نەدراوە ناوی بێنێ‌و یادی بکاتەوە . ئیمامی عەلیش کە هەستی‌کرد ئایینی ئیسلام بە چاکی چەسپاوەو مەترسیی دابونەریتی کۆنی لەسەرنەماوەو ، زۆربەی لایەنگیرەکانی لە خەڵکی عیراق‌و ئێران‌و خوراسان حەز بە یادکردنەوەی نەورۆز دەکەن ، کەمێك نەرمی نواندو ڕێگەی بە خەڵکەکەدا ، بە شیرینی بەشینەوە لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا یادی‌بکەنەوە . بەڵام کە موعاویە هات لە ڕێگەی باج‌وەرگرتنەوە ماوەی یادکردنەوەو ئاهەنگ‌گێڕانی نەورۆزی داو لە سەردەمی عەبباسی‌یەکانیش‌دا نەورۆز نەك هەر لەناو خەڵکەکەدا ژیایەوە ، بەڵکوو گەیشتە کۆشك‌و دەرباری خەلیفەو دەبوایە لە هەموو لایێکی وولاتی ئیسلامەوە خەڵکەکە پیرۆزبایی جەژنی نەورۆز لەو بکەن‌و نایابترین دەستوودیاری پێشکەش‌بکەن .

**پەراوێزو سەرچاوەکان :–**

(١) – المسعودی – مروج الذهب – ج ١ ، القاهرة ١٩٤٨ ، ص ٢٢٣
(٢) – وزارة التربية – تأريخ الحضارة العربية الاسلامية – ط ٦ بغداد ١٩٨٢ ص ١١٤
(٣) – هەمان سەرچاوە ، ل : ١١٤
(٤) – شوکور مستەفا – نەورۆز لە ئەدەبی گەلان‌دا – دەفتەری کوردەواری – ب ٢ ، بەغدا ١٩٧٠ ، ل : ٤٥
(٥) – د . کامل بصیر – کوردایەتی جەژنی نەورۆز – ڕۆشنبیری نوێ – ژمارە ١٠١ بەغدا ١٩٨٤ ، ل : ٧٦
(٦) – لجنة من وزارة التربية – تأريخ الحضارة العربية الاسلامية – ط ٦ بغداد ١٩٨٢ ص ١١١
(٧) – أحمد ابن واضح اليعقوبي – تأريخ اليعقوبي – ج ٢ بيروت ١٩٦٠ ، ص ٢٠٦
(٨) – د . عواد مجيد الأعظمي – الزراعة والاصلاح الزراعي في عصر صدر الاسلام – بغداد ١٩٧٨ ، ص ١٠٤ ، ١٠٥
(٩) – د . عبدالعزيز الدوری – العصر العباسي الأول – بغداد ١٩٤٥ ، ص ٨ ، ٩
(١٠) – د . عواد مجيد الأعظمي – الزراعة والاصلاح الزراعي في عصر صدر الاسلام ، ص ١١٠
(١١) – احمد ابن واضح اليعقوبي – تأريخ اليعقوبي – ج ٢ ، بيروت ١٩٦٠ ، ص ٢١١
(١٢) – د . عواد مجيد الاعظمي – الزراعة والاصلاح الزراعي في عصر صدر الاسلام ص ١٠٨
(١٣) – احمد ابن واضح اليعقوبي – تأريخ اليعقوبي – ج ٢ ، بيروت ١٩٦٠ ، ص ٢١٧
(١٤) – هەمان سەرچاوە – ل : ٢١٨
(١٥) – شوکور مستەفا – نەورۆز لە ئەدەبی گەلان‌دا – دەفتەری کوردەواری – ب ٢ ، بەغدا ١٩٧٠ ، ل : ٤٥
(١٦) – د . کامل بصیر ، کوردایەتی جەژنی نەورۆز – ڕۆشنبیری نوێ – ژمارە (١٠١) بەغدا ١٩٨٤ ، ل : ٧٦
(١٧) – احمد ابن واضح اليعقوبي – تأريخ اليعقوبي – ج ٢ – بيروت ١٩٦٠ ، ل : ٢٢١ – تأريخ الحضارة العربية الاسلامية – بغداد ١٩٨٢ ، ص ١١٤
(١٨) – د . عواد مجيد الأعظمي – الزراعة والاصلاح الزراعي في عصر صدر الاسلام – ص ١٣٦ – احمد ابن واضح اليعقوبي – تأريخ اليعقوبي – ج ٢ ، بيروت ١٩٦٠ ، ص ٣١٣
(١٩) – شوکور مستەفا – دەفتەری کوردەواری – ب ٢ ، ل : ٤٥
(٢٠) – هەمان سەرچاوە – ل : ٤٧
(٢١) – غەفووری میرزا کەریم – نەورۆز لە بڕبڕەی پشتی مێژوودا – ڕۆشنبیری نوێ – ژمارە «١٠١» بەغدا ١٩٨٤ ، ل : ٨٦
(٢٢) – ابن الكازروني – مختصر التأريخ – تحقيق د . مصطفى جواد – بغداد ١٩٧٠ ، ص ٢١١
(٢٣) – غەفووری میرزا کەریم – ڕۆشنبیری نوێ – ژمارە «١٠١» ، ل : ٨٧

-عبدالقادری دەباغی-

# چەند دێڕێك لە مێژوو

بەشی یەکەم

مێژوی خوێناوی نەتەوەی کورد زۆر کارەساتی بە خۆیەوە دیوەو سینگی پڕ لە بەسەرهاتە ، گەرچی بەهۆی تێکۆشانی مێژوو نووسانی دڵسۆزو دڵمەند بەرابوردوی نەتەوە زۆربەی کارەساتە خوێناویەکان ، لاپەڕەی کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامەکانی وەك بەختی خاوەن مێژووەکە ڕەش کردۆتەوە .

گەرچی بەتەوهیمەتی مێژوو نووسانی بە وەجو نیشتمان پەروەر درۆوو بوختانی مێژوو نووسانی داگیرکەران یا ڕوانگەی چەوتی گەریدەکانی هەندەران بە درۆ خراونەتەوەو ڕوانگەی دوژمنانەیان بە مەنتیقو ڕاستی ئاشکرا کراوە ، بەڵام لەبەر نەبوونی دەرەتان بۆ نووسەرانی کورد لەبەر دەسەڵاتی بێ سنوری دوژمنان بەداخەوە تیشکی ڕوناکیو ڕاستی نەیتوانیوە بە تەواوی دڕ بە تاریکی بداتو ڕوداوەکان بەراستیو بە و چەشنە کە بوون بکەوێتە بەر چاوی کۆمەلانی خەلکەوە .

خوێنەری ئازیز :-

پتر لە حەفتا ساڵە کارەساتێکی دڵتەزێن لە کوردستانی ئێراندا قەوماوە ، ڕوداوێکی گرینگی مێژوویی کە لەوانەبوو - ئەگەر سەرکەوتوبوایە - نەخشەی خۆر هەلاتی ناوەڕاست بگۆڕێ ، هاتە مەیدانو کتو پڕیش لە ناوچوو . چوار کوردی دلێرو دلسۆزبوون بە قوربانی ئەو نەخشەیە . چوار گەورە پیاوی ناوداری کوردستانی ئێران بە سێدارەی بێ دادی دوڵەتی عوسمانی داگیرکەر هەلاوەسران . ئەو کاتەش وشەی پیرۆزی -ئیسلام- دار دەستی خەلیفەو هۆی وێرانیو خوێن ڕێژیو قاتو قڕیبوو . هەر وەك ئێستا کە تاقێ دین فرۆشی بێ دینو شەڕ فرۆش ئێرانیان بەم دەردە بردو سەدان هەزار لاویان بە کوشتن داو سامانی ولاتیان لە تەنووری شەڕی بێ هودەدا سووتاندو هێشتا هەر دەنگی شوومی شەڕ ، شەڕو هەر شەڕیان گوێی ئینسانیەت ئازا دەدات .

ئەو کوردە ئازادی خوازانەش بە تاوانی دژایەتی لە گەڵ شەڕی رووسو عوسمانیو بە تاوانی ئەوەی کە بۆیێك هێنانی کوردستانێ کە نە مەحکوومی عەجەمو نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بێ هەولیاندداوە .

شەهید کرانو قارەمانانە گیانی شیرینو گشت سەروەتو سامانیان پێشکەشی نەتەوەو نیشتمانکرد . بەلام سەد موخابن لەم ماوەی حەفتا ساڵەدا جگە لەیەك دوو جێ نەبێ ناوێ لەو شەهیدە ئازیزانە نەبراوەو چۆنایەتی ئەو دیاردە مێژووییە نە نووسراوە .

لەبەر ئەوە گەرچی دەستم بە هیچ سەرچاوەیەکی ئەوتۆ ناگاتو لێکۆلینەوە لە مەسەلەیەکیوا ، لە حکومەتی شوومی ئاخوندی ڕەگەز پەرست بە کوفر لە قەلەم دەدرێ لە ژێر هارەی فڕۆکەو گرمەی تۆپو شریخەی تفەنگی پاسدارانی تاریکیو نەزانیدا ، هەر ئەوەندەم توانی کە چەند دێڕێ لەو بەسەرهاتە تاڵە بنوسمو ئەوەندەی لە وزەمدابوو هەوڵی بۆ بدەم . هیوام وایە سەرنجی بەرەی نوێ بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی ڕاکێشێو ڕۆلە دلسۆزە نیشتمان پەروەرەکان هەوڵ بدەن ناتەواوی تەواو بکەن . بۆ پیرۆزیو فەر باسەکەم بە باسی قەلەندەرێکی دلّ سوتاوی کورد کە جەرگی بە ئاگری پیرۆزی ئەشقی یەزدانیو ئەوینی نیشتمانی سووتابوو ، بە باسی شێخ بابای غەوس ئابات دەرازێنمەوەو هیوام وایە پەسەند بکرێ .

**«شاعیرو عاریفی شەهید شێخ بابای غەوس ئاباد»**

لە کوردستانی ئێراندا ناوچەی موکریان مەڵبەندی زانایانو شورشگێرانەو لە گشت دەورو زەمانێکدا بە هۆی باری ستراتیژیو دەشتی پڕ پیتو بەرەکەتو کانیاوو روبارو بەندو جۆبارو کوێستانی بەرزو سەرکێشو پڕ گوڵو گیاو لەوەرگەی زەنوێرو لە برێ شوێندا لێرەوارو دارستانو باخ وباخاتی ڕازاوەو جوان کانگای شاعیرانی دڵتەڕو ناسك خەیاڵو مەقام بێژانی دەنگ خۆشو بە کوردیو بە کورتی ، ناوەندی نیشتمان پەروەریو دڵداریو کانگای سەفاو وەفابووە . داخی گرانم بە هۆی زاڵ بوونی ڕژێمی فیودالیو دەرەبەگیو شەڕی ناوخۆو هێرشی پەیتا پەیتا نێوانی ڕۆمو عەجەمو ڕووسو عوسمانیو ئێران ، زۆربەی زۆری بەرهەمی ئەدەبیان فەوتاوە . یا بە نرخێکی هەرزان فرۆشراوە . یا بە دەس نەزانانو داگیرکەرانەوە تالأن کراوەویاشا ردراوەتەوەو لەبن زەوی یا لە شاخو ئەشکەوتا ڕزاوە .

یەکێ لەو شاعیرە عاریفانەی کە هۆی شانازی کوردە ، نیشتمان پەروەری پایە بەرز شێخ بابا سەعید «صدر السادات»ە کە بە شێخ بابای غەوس ئاباد بە ناوبانگە . بە داخەوە سەبارەت بەو زانا پڕ هەستەو لە چاپ‌دانی بەرهەمەکانی لە هیچ لایەکەوە هەنگاوێ هەڵنەگیراوەو هەوڵێ بۆ بڵاو کردنەوەی نەدراوە ، گەرچی چەند دەرفەتی لەباریش ڕەخساوە . منیش هەرچەند گەڕامو پرسیارمکرد ، جگە لە ڕۆژنامەی -کوردستان-ی سەردەمی کۆمار ، کە خوالێخۆش‌بوو - سید محمد حمیدی - لە زنجیرە وتارێ لە ژێر سەر دێڕی - زانایانی کورد دا بڵاوی دەکردەوە هیچ بەڵگەیەکی نووسراوم وەدەست نەکەوت . وام بە باش زانی کە بەکەڵك وەرگرتن لەو تاقە سەرچاوەو قەسیدەیەکی بەرزو شاکاری ئەدەبی بە ناوی «بەرەو موکریان»و پرسیار لە شارەزایانو پیران ، بۆ ناساندنی ئەو ئەدیبە شەهیدەو هاوڕێیانی سەرنجی لاوانی دڵمەندو پێگەیشتوو دڵسۆزانی بە ئەمەكو تێگەیشتوو دڵسوتاوانی مێژوی خوێناوی نەتەوەی کورد بە تایبەتیو بەسەرهاتی ئەدیبانو عاریفانو نووسەرانی گەلو فیداکاریو نیشتمان پەروەری باوو باپیران بە گشتی ڕاکێشم وەبەبڵاو بوونەوەی ئەم وتارە لە گۆڤاری هێژای - کاروان-ی ئازیز چاوەڕوانم خوێنەرانی خۆشەویست هەر کەسە لە ئاستی خۆیەوە بەرهەمی بڵاونەکراوەی هۆنەرانی هونەرمەندو ون ناو بۆ کاروان بنێرن . بەڵکو بەو خزمەتە گەنجینەی ئەدەبیاتو وێژەی کوردی دەوڵەمەندوترو گیانی پاکی شەهیدان زیاد شاد کەن .

بە باشم زانی دەقی تاقە بەڵگەکەم وەك خۆی بنووسمو خرە دەسکاری نەکەم .

ڕۆژنامەی -کوردستان- ژمارە - ١٥ ساڵی یەکەم ، شەموی -٢٧-ی ڕێبەندانی (١٣٢٤) بەرامبەر بە -١٦-ی فوریە ١٩٦٤ی زایینی . «زانایانی کورد» .

**-شێخ بابا سەعید .        نووسینی - سید محمد حمیدی-**

«شێخ باباکوڕی شێخ سمایلی کلاو قوچ ، کوڕی سید محمد کوڕی بابا سعیدەو بە -صدر السادات- ناوبانگی ڕۆیشتوە . شێخ بابا لە حدودی ساڵی (١٢٥٣) هەق لە دێی قولەری ناوچەی بۆکان لە دایك‌بووە . سەرەتای خوێندنی لای - میرزا سەلیم -ی شاعیر بوەو لە کن - مەلا عەلی قزڵجی - لە تورجان - ومەلا - عبدالله پیرباب -و - لە وەتەمیش - خوێندویەتی . عیرفانی لە خزمەت (کاك ئەحمەدی سلێمانی) خوێندەوەو ئیجازەی ئیرشادی لە شێخ مارفی کانی کەوەیی وەرگرتو بەو کارەوە زۆر خەریك‌بوو .

موریدێکی زۆری ئێستاش ماون . شێخ بابا بە هاودەستی شێخی شەهید - شێخ عبدالقادری نەهریو سیف‌الدین خانی سەقزو حەمە خانی بانەو حەمە حوسەین خانی سەردار ، زۆری لەسەر سەربەخۆیی کوردستانی زەحمەت کێشا . لەم بابەتەوە دەگەڵ ئیمپراتۆری ڕوسیەی تەزاری عەلاقەیەکی باشیان هەبوو . بەلأم وەلأمی ئەم عەلاقەیەیە بە - عومەر ناجی بەگ -

فەرماندەی تورکان گەیشتو ئەویش شێخ بابای بە دیل گرتو بێ موحاکەمە لە دێی -کەرێزەی گڵی- لە قەراخ قەبرستان نەوەرزی -١٣٣٣ -هـ. ق - وەكو باقی هاورێکانی هەڵواسیو هەر لەوێ شاردراوە . پاش هەشت مانگ کە عوسمانیەکان توون بە توون چوون جەنازەکەیان بەدێ - قولەر - نەقڵ کردو دەفنیان کرد . شێخ بابا لە شاعیرە بەرزەکانی چەرخی چاردەهەمی هیجریە . دیوانی - سعیدیەو مەعنەویەی چاپ نەکراون . لە فەنی تەبابەتدا زۆر بە لەد بووەو بە کوردیو فارسیو عەرەبی شیعری گوتوە . ئەم شیعرانە نمونەی شیعری کوردیەتی :-

«بە شەمعی مەعریفەت خانوی دڵم ڕۆشن نەکەم چبکەم
بە نووری عیلمی وەحدەت ، بەدەن مەخزەن نەکەم چبکەم
لەبەحری مەعنەوی دورڕی مەعانی دەست گیروم‌بوو
بە دورڕی مەعریفەت ساحڵ هەموو گوڵشەن نەکم چبکەم
لە بادەی وەحدەتی جانان وەها سەرمەستی تەوحیدم
گوڵستانی هەموو عالەم ئەگەر گوڵشەن نەکەم چبکەم»

لەم شیعرانەی ژێرەوەدا ئیشارە بە تورکانو شەهادەتی خۆیو هاورێکانی دەکات :-

تیغی جەللادی بەدەستو دامەنی هیمەت بەبەر
کەس نەماوە نەیکوژێ وێستا کە خۆی غافڵ دەکا
مەزهەبت وایە ئەگەر عاشق بە تۆبم بکوژی
یاوەلی ئیحسانە ، بۆیە کاری خۆی عادڵ دەکا
شاهیدم تێر نابێ ، بۆ قەتڵی شەهیدان دەم بە دەم
چبوە چاوی قاتڵە جەللادی خۆی واصل دەکا
شەربەتی شەهدی شەهادەت هەرکەسێ نۆشی بکا
واسڵی مەعشوقە ئەو ، مەقتولی خۆی قاتل دەکا

سەبارەت بە گۆڕی پیرۆزی ئەو شەهیدە نووسەری وتار تووشی هەڵەبووە . چونکە جەنازەکەیان هێناوەتەوە بۆ گوندی غەوس ئابادو ئێستاش موریدانی ئەو بنەماڵە دەچنە زیارەتو گومبەزو بارەگای هەیەو تەکیەی ئاوەدانەو قۆناخی ڕێبوارانە .

بە سەرنج دانێ لەو چەند شیعرە کە دوو غەزەلە وە هەڵبژێراوە ، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە چ لەباری ئەدەبیو چ لەباری عیرفانەوە هاوتای موحویو لە کۆڕی عەشق یەزدانیو ئەوینی نیشتمانی ، مەنسوری حەللاجو عین القضاتی هەمدانی کوردە ، کە گیانی شیرینی فیدای ئامانجە بەرزو پیرۆزەکانی کردووە . غەزەلی هەوەڵی سەبكو شێوەی دارشتنی چەشنی غەزەلە بە ناوبانگەکەی مەحوییە کە فەرموویەتی :-

«بە نووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چبکەم
بە شەمعێکی وەها چاری شەوێکی وانەکەم چبکەم»

بەڵام ڕێبازی تەریقەتەکەیان جیاوازە . مەحوی شاعیرو عاریفی نەقشبەندیە کە لە عاریفانی وەك - مەولانا خالیدی شارەزوریو مەولانای جامی وخواجەی عەتتارو شێخی سەعدیو شاهی نەقشبەندو دەیانو سەدان عاریفی شاعیری فارسی بێژە فەیزو بەرەکەتی ڕۆحی وەرگرتووە . مەلایانە ئەو گەوهەرانەی هۆنیوەتەوەو سۆفیانەو لە سەرەخۆ دەریای مەنگی بیری وردی شەپۆلی داوە . بەڵام شێخ بابای شەهید دەروێشی قادریو ڕێبواری ڕێگای سور خەڵاتی وەك (محی الدین ابن العربیو عین القضاتو سهروردیو مەنسوری حەللاجو ئاشق عبدالقادری کەیلانی بوە .

وەك بولبولی شەیدا چریکاندوویەتیو لە بازاڕی ئەشق پیرۆزی یەزدانیو ئەوینی پاکی نیشتمانی شێرانەو کوردانە نرکاندویەتی کە دەڵێت :

«لە بادەی وەحدەتی جانان وەها سەرمەستی تەوحیدم
گولستانی هەموو عالەم ئەگەر گوڵشەن نەکەم چبکەم»

ئەو دەربڕینە لە قاموسی تەسەوفو عیرفاندا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو شاسوارە خۆی بە پلەی هەرە بەرزو لوتکەی -وەسڵ- گەیاندوەو لە گەل نوری خودا تێکەڵ بوەو توانای گەیشتۆتە ڕادەیەك کە دڵی وەك خونچە گولێ ڕێبوارانی دیکەش بە گەرمای ئەوینی یەزدانی بپشکوێنێو باخچەی دەروونیان چەشنی گوڵشەن برازێنێو بە وەسڵی دڵداری بگەیێنێ ، بەڵام

ئەو خۆ بە خەڵك ناساندنو ڕازی نهێنی دەربڕینە لە قانوونی عاشقاندا کوفرەو بەو تاوانە چەندەها ئاشق دڵسوتاو شارەزای ڕێگا وەك مەنسوری حەللاج بە فتوای زانایانی ڕواڵەت بینو حاکمانی بێ‌دینی دین فرۆشی هەڵواسراونو خوێنیان ڕژاوە . بۆیە شێخ بابای شەهیدیش بەڕاشکاوی باسی شەربەتی شەهدی شەهادەت دەکاو خۆی بەشۆڕە شواری ئەو ڕێگایە نیشان دەداو دەزانێ تاوانی ئەو تاوانە زمان بڕینەو بە سێدارەی بێ‌دادی نەزانان هەڵواسینو شەربەتی شەهدی شەهادەت نۆشینە . دەزانێ کە مەلەوانی دەریای بێ‌لێواری خۆشەویستی –مەحەبەت– تافانی نەبێ بە عالەمی بەقاو ژیانی هەتا هەتایی ناگات . بەڵام بەسەر بەرزیەوە بەرەو پیری دەچێت :–

«لەسەرخۆ چوونە ، شەیدابوونە ، قوربانە ، سووتانە
هەتامردن – محبت– ئێشی زۆرە ڕێژی لێ ئەگرم»

دەزانێ چەشنی مەنسوری حەللاجو گیان بازەکانی دیکە ، بۆ کوێ دەچیو ئاکامی چی‌یە ؟ ! ناترسیو مەردانە ڕێ دەگریو ناپاڕێتەوەو پەژیوان نابێتەوەو ناڵێ :–

«سەزای کوفری (انا الحق)بوو کەوا مەنسور بێ‌سەربوو
بە ناحەق بێ – انا الحق– بۆ لە جێی مەنسوری سەردارم»

ئەویندارن بە –انا الحق – گوتن شانازی دەکەن و بە کوفری نازانن . حەق وێژیو حەق ویستن بە حەق خۆیان دەزانن‌و بە شانازیو تاسەوە هەناسەی بۆ هەڵدەکێشنو هیچ کاتێ لەسە ختی ڕێگاو هێرشی پەیتا پەیتای نەفسو هەوا ناسڵەمێنەوەو بەرەو ئاسۆی خوێناوی بەڵام ڕوون دەڕۆنو بایەخێ بۆ گیانی شیرین دانانێن .

شێخ بابای شەهید پزیشكو چازانێکی باشو شارەزای نەخۆشیەکانی وڵاتبووەو لە گوڵو گیای کوێستانە بە فەڕو پڕییتو بەرەکەتەکەی کوردستانی ئازیزی کەڵکی وەرگرتووەو بە هۆی ئەوانەوە نەخۆشیو بڕینی لەشی هاونیشتمانانی چاكو سارێژ کردووەو بە سۆزی عەشقی یەزدانیو عیلمی تەسەوفو عیرفانەکەشی هەتوانی دەردە دەروونیەکانی گەلی داوە . تەنانەت بۆ لابردنی ناتەباییو نێوان ناخۆشیی میللیو ئاینی کە بە هۆی دوژمنانەوە ببوە زامێکی سەختیی کۆمەڵایەتی ، زەحمەتی کێشاوەو چۆتە نێو ئازەربایجانیو مەحەبەتو خۆشەویستی خستۆتە نێوانیانو هێشتا لە شاری ئازەر شەهردا گومبەزێ بە ناوی «گومبەزی شێخ بابا» ماوە . سەرەڕای ئەوەش خۆش‌نووسو ئەدیبێکی ئەوەندە لێ‌هاتوو بووە کە تا ئێستاش چەند نامەیەکی بۆ وێنەی خەت خۆشیو شارەزایی لەئەدەبیاتی فارسی لە شاری تەورێز ڕاگیراوە .

نموونەی شیعری فارسی ئەو شەهیدەم دەست نەکەوت بە خزمەت مامۆستا – مەلا ڕەحیمی عەبباسی –گەیشتمو باسەکەم دامەزراند فەرموی کە دوو غەزەلی فارسیم لایە کە – دەروێش سمایلی سەرمابردوو – بە دەنگە خۆشەکەی بۆی خوێندۆتەوەو بەداخەوە ناتەواون . ئەوەندەی لە وزەمدابێ بە پێی توانای کەمی خۆم بە کوردی شی دەکەمەوەو لەسەری دەڕۆم :– لە دێڕی یەکەمدا دەفەرموێ ، هەمیشە بە دەورو بەریماڵێ کە هۆی مەستیو سەربەستیم پێك دێنێ ، یا پێکی هێناوە ، دەگەڕێم ، چونکە عاشقمو مێشکم پڕ لە ئەوینەو بە شوێن دڵدارمدا دەسوڕێمەوە . خانەی خومار لە قاموسی عارفاندا ئەو شوێنەیە کە پیری تەریقەتی لێ‌یە مەبەستی ئەوە یە کەرابیتەی یاری ڕاگرتووەو دڵی زیکری ئەو دەکاو بە چاو تروکانیش لێ‌ی دوور ناکەوێتەوە . لە دێڕی دوهەمدا هۆی ئەو ئەوینە ئاگرینو بە تینە بەم شێوەیە دەردەخاکە یار –خودا– خۆی لوتفی کردووەو هەر لە ڕۆژی بەرینەوە منیان لە شەرابی یەکتایە ڕەستی مەستی هەتا هەتایی کردووەو بەو مەستیشەوە هێشتا بەوریایی دەگەڕێمو ئاگاداری کارو بارم . مەبەست لە ئەزەل ئەو کاتەیە کە خودا گیانی هەموو ئادەمیزادی کۆ کردۆتەوەو فەرمویەتی – الست بربکم – . دەستەی بروا پێکەران بە جوابێ –بەڵێ– کرنۆشیان کردوە . ئەبەدیش ڕۆژی مەحشەری گەورەیە کە تەواوی ئادەمیزاد زیندوو دەبنەوەو نامەی کردەوە بەسەریاندا دابەش دەکرێو چاکەو خراپەیان لێ مەعلوم دەبێ . سێخی شەهید

دەیێ لە ڕۆژی بەرینەوە بە پێکی عەشقی یارەوە مەستیان کردومو ئەو سەرە خۆشیە تا ڕۆژی قیامەت ناپسێتەوەو دوایی نایەت. بەلام هەر وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ – پیاوی واهەن کە لە بازاڕی جیهاندا مامەڵەو ساتو سەوداو کە چی دڵیان هەر لای خودایە – ئەو تاقە سەربەستو سەر مەستانە لە گشت دەورێکدا لە لایەن وشکە سۆفیو زانایانی ڕواڵەت بینەوە کەوتونەتە بەر لۆمەو توانج بۆیە هەموو کەسێ نەی توانیوەو نەی وێراوە ئەشقی خۆی دەربڕێو بێ پێچو پەنا بانگی سەرەخۆشی بدات بەلام شێخ بابا بەڕاشکاوی هاوار دەکا کە ئەوەندە مەستم کە لە تانەو لۆمەی زاهیدی وشكو عالمی ڕواڵەتبین ناترسمو بێ ترسو خۆف لە بازاڕی ئەشقو مەستیدا دەگەڕێم ، هەروەها ئیشارەیە بەو وشکە سۆفیانە کە کاکڵی دینو مەبەستی بەرزی ئاین فڕێ دەدەنو توێکڵی ویشکی ڕواڵەت –ظاهر– لەبەرچاو دەگرنو تێگەیشتوانو پێگەیشتوانی عشقو سەربەست هەراسانو جاڕز دەکەن تەنانەت شاعیرێکی غەیرە سۆفی بەلام جوان پەرستی وەك حەزرەتی –نالی – دەهێنێتە نالین :–

«بڕوانە وشکە سۆفیو ڕەقسی بەهەڵهەلە
دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە»

بەلام عاریفی شەهیدی ئێمە گەیشتۆتە ئەو قۆناغە کە لە تانەو لۆمەی ئەوانە باکی نی‌یە ، وەك لە قورئاندا – باسی ئەو تاقە ئاشقە دەکا کە لە لۆمەکاران ناترسن :–

لە دێڕی چوارەم کە بە لای منەوە کەرتی هەوەڵی هەڵەیەو ڕاستەکەی ڕەنگە بەم شێوەبێ «نەدر کعبە شوم زاهد نەدر بتخانە شوم عابد»ە . بەهەر لەونێ بێ مەبەستی ئەوەیە بە غەیری یاری خۆشەویستی کاری بەکەس نەماوە . نە لە کابەدا عیبادەت دەکاو نە لەبێتخانەدا بەڵكو بە شوێن یار لەو شوێنانە دەگەڕێو هاتو چۆیان دەکات هەر وەك عاریفێکی فارسی بێژ گوتویەتی «مقصود تونی کعبەو بتخانە بهانە» . ئامانج بە یار گەیشتنە ئیدی کابەو بتخانە بیانووە

لە دێڕی پێنجەمدا وەك ئاشقێ کە بە یار گەیشتیێو لە کانیاوی –بەقا– تێراوبووبێ گەف لێدەداو لە پلەیەکی هەرە بەرزەوە لە لوتکەوە دەی گۆڕێ کە بە گوتنی وشەی –انا الحق – ئەو ڕاستیە دەسەلمێنم کە جێداری بەر حەقی مەنسوری حەللاجمو سەرداری ئاشقانمو سالاری ئەویندارانی شاو خاوەن دەسەلاتی کیشوەری دەروون سووتاوانم ، مەقامو پلەی سەرداریش ڕۆیشتنی سەرداری پێ دەوێ کە وەك دەی بینن بەسەربەرزی‌یەوە هەلاوەسراوی دەمبینن .

خوێنەری بەڕێز :– ئەوە هەڵبەستێ نیە کە شاعیرێکی ناسك خەیالێ بە بالای یاری نازداریا بۆ ڕەزامەندی شۆخی عەییار هەڵی بەستێ . بەڵكو ئەوە وێنەیەکی جەزبەو شۆری عاشقانەی مەولانای ڕۆمیە ، چەشنی داخی دەروون هەڵڕشتنی ڕەندانەو قەلەندەرانەی – حافزی شیرازی‌یە – قسەی دڵێکی پێکراو بە دوو تیرو زامار بە دوو شمشێرە . کە بە داڕشتنێکی کوردانەو ساکار عاریفانەو زۆریش پڕ ناوەڕۆك لە ناخی دەروونی دێتە دەروو لاپەڕەی نامەرەشو خاکی نیشتمانی ئازیزی بە خوێنی گەشو ئاڵی دەڕەنگێنیێو ناوی پیرۆزی بە شانازەیەوە لە لاپەڕەکانی مێژوی ئەوینداران‌و نیشتمان پەروەراندا هەر دەمێنێ . ئەو چەن دێڕە ، غەزەلی دووهەمی داخی گرانم ناتەواوەو چەن جێگەشی نەخوێندرایەوە کە نوختەم داناوە لە پێشدا ، ئەوەندەمان کە بۆ ساخ بوەوە هەر بە شێوە فارسیەکەی دەی نووسم بەڵكو لای دەروێشانو دڵسۆزان تەواوی غەزەلەکە وەچنگ کەوێ :–

فرو رفتم بحر معرفت جاناخدا حافظ
شدم جویا برای در لایفناخدا حافظ
نهادم سر به خاك مقدم جانان شدم محرم
. . . . به کوی مظهر تور سیناخدا حافظ
جهان ماتحت خودم دیدم خودم مافوق عالم‌را
نظر کن برخطاب سر کرمنا خداحافظ
. . . . که اند مجلس ساقی شدم محرم

. . . . . . سر شهر اعطینا خدا حافظ
بەمعراج مقام‌من ، من رانی بو سعیدم رفت
تجلی زد به کوەو شهر سینا خدا حافظ

لە شێوەی دارشتنی ئەو شیعرانە دەردەکەوێ کە لە حاڵی شۆرو جەزبەدا وتراوەو هاوتای حاڵەتی مەولانای رۆمیو شەمسی تەورێزیە . لە کاتێکدا فەرمویەتی ، کە لە گرتوخانەی عوسمانیەکانەوە بۆ گۆرستانەکەی گوندی – کەرێزەی گڵی – براوەو لە لایەن جەندرمەکانی عوسمانیەوە ئەتکی پێ‌کراوە ، گوایا لە سەر تێکۆشان بۆ پێك هێنانی کوردستان لە ئاین لای داوە . ئارمانی کۆشكو قەلاکەی سەرداری شەهیدی لە پێش چاوە . بەلام سەرمەستی بادەی مەحبەتی یەزدانو گیانی فیدای نیشتمان ناپەشۆکێو نالەرزێ ، رۆڵەی کوردەو دلێرەو نابەزێ ، دەزانێ‌کە خوێنی پاکی خاکی کوردستان دەرەنگێنێ بەلام بەو پەری قارەمانتیەوە حەماسە دەخوڵقێنێو بە غەزەلێکی پر ناوەرۆکی عاشقانە نەریتی ماڵ ئاوایی بەجێ دێڵێ . بەر لە شی‌کردنەوەی غەزەلەکە سەرنجی خوێنەران بۆ ئەو قانونە رادەکێشم کە لە قاموسی عاریفاندا وشەی ساکاری وەك ، یار ، دڵدار ، محبوب ، خاڵ ، چاو ، برۆ ، لێو ، بادە ، مەیو ساقیو هەر کامە مەعنای تایبەتیان هەیە . زمانی عاریفانی ئەدیبو نووسەر زمانێکی پر لەرەمزو کینایەیە . چونکە لە ترسی لۆمەی وشکە سۆفیو زاهیدی رواڵەت بینو حاکمانی بە رواڵەت دیندارو لەپەردەدا بێ‌دین ، ناچار بوون هەستی دەروونیان بەرەمز بگەیەننو بەلێ پرسینەوەی حاکمو دارۆغەو قازیو مەلا کۆتایی بێنن .

هەر لەبەر ئەو رەمزو کینایەتەیە کە دەیانو سەدان کتێب سەبارەت بە –تصوف–و عرفان بە فارسیو عەرەبی نووسراوەو دەیان شەرحو حاشیە لە سەر مەسنەویو مەولەویو حافزو کراوە . تەنانەت عاریفی شاعیر – شێخ محمود سبستری – مەسنەویەکی بە ناوی –گلشن راز – بۆ شی‌کردنەوەی ئەو رەمزانە داناوە . لە بەر ئەوە لە شی‌کردنەوەی شیعرو پەخشانی شاعیرانی عاریف یا عاریفانی نووسەرو شاعیری وەك مەولانا خالدی شارەزووریو شێخ عومەر ضیاءالدینی بیارەو مەحوی گەورەو شێخ عبیداللەی شەمزینیو شێخ بابای شەهیدو . . هتد .

دەبێ ئەو قانونە لەبەر چاو بگیرێو ئارادەی پێویست ئاگامان لەو رەمزو رازانە بێ ، دەنا بە هەڵەدا دەچینو بە مەبەست ناگەین چونکە بازارەکە یەك بازارەو کالاش هەر ئەو کالایەیە بازاری ئەشقو ئەوینەوشەورستە رەنگینە . بولبول بە دیتنی سوورە گوڵ دەچریکێنێو شێر لە بێشەلاندا دەنرکێنێو ئاشقی پێکراوی مژۆڵی یار دەناڵێنێ . ئەو باسە دوورو درێژە باشتر وایە نەختێ لە سەر رازی عاریفێکی کوردی بە هەق گەیشتوو لە سەر هەق رۆیشتوو برۆینو بزانین کاتێ کەشێرە پیاوی مەیدانی خواپەرستیو زانای ئاینیو دەروێشی قادری دەگاتە ئەوپەری ئاواتو لە پلەی –فەنا– تێ‌دەپەرێو لە کانیاوی –بەقا–سەرمەست دەبێ . بەلام لەم دنیاش بێ ئاگا نیە . دەبینێ کوردستانە ئازیزەکەی بەدەست داگیرکەرانی رۆمو عەجەمەوە دەناڵێنێ ، دایکی نیشتمان بە گریانەوە هاناو هاواری بۆ دێنێ . لێرەدایە کە قارەمانی زانا ، تەسەوفی وشکی رەهبانیو تەرکی دنیا فرێ دەداو پاڵەوانانە دێتە مەیدان و لەگەڵ حاکمانو دەستەلاتدارانی سەقزو بانەو بۆکان پێك دێتو وادەردەکەوێ کە شێخی نەمریش لەوکەینو بەینە ئاگاداری بووە هەر وەك لە وتارەکەی رۆژی ١٥ی تەشرینی یەکەمی (١٩٢٢) لە شاری سلێمانی فەرموی «ئەوەش بزانن بۆ ئازادیمان لە گەڵ رووسەکانیشدا دریغم نەکرد ، بەلام شۆرشی ناو خۆی کەوتە پێش ئاواتەکەی ئێمە» . گەلالەکە زۆر رێكو پێك بووە چونکە لەو سەردەمەدا لە –سورکێو–ەوە تا سنوری بادینانی ئێرانی دەگرتەوەو ئەو ناوچەیەش لە ژێر نفوزی شێخی شەهید – عبدالقادری شەمزینی – دابووە . بەلام بەختە رەشەکەی کورد پیلانەکەی تێك‌داوە .

مورشیدی تەریقەتی قادری ، زانای پایە بەرزی ئاینی ،

خۆش نووس‌و نووسەری بە ناوبانگ ، پزیشك‌و چارانی ێ‌هاتوو شاعیری عاریفی زانا ، دلێ بەتیری ئەشقی یەزدانی پێکراو ناخ‌و دەروونی بە قوری نیشتمان پەروەری شێلراو ، چاوی بە کلی سینای نووری خودا ڕۆشن‌کراو ، لە دوور یانە ماوەتەوە ، یادەبێ دوژمنی لە گەڵ خەلیفەی ئیسلام‌دا بکاو یا کڕنۆشی بۆببا یا بەهانای دایکی نیشتمانەوە بێ‌و هەڵمەت ببا .

ڕێگەی پڕ خۆف‌و مەترسی گرتە بەرو ئێستاش ڕێبوارانی ئەو ڕێگە پیرۆزە بەردەوامە . شێخ بابای شەهید وەك بڕیاری دابوو کە تادوا هەناسەی ژیان‌و تادوا تنۆکی خوێن بۆ ڕزگاری کوردستان گیان بازی بکات ، لەسەر ئەو بەڵێنە لەو کاتە بە هەیبەت‌و سامەدا پێ‌یان گوت ئەگەر بچێتە ژێر ئالای عوسمانی کڕنۆشی بۆ بکری ڕزگار دەبی ، بەلام عاریفی زاناو نیشتمانی پەروەری بە توانا ، بە زەردە خەنەیەکی پڕ ماناوە ئەو پێشنیارە سەر شۆڕانەی ڕەت کردەوەو وەك مامۆستای فیداکاران شیعری خودا حافزی لە گەل‌و نیشتمان هۆنیەوەو فەرمووی :— ئەوا من چوومە قولاپی بەحری بێ لێواری خوا ناسیەوە کە ئەو گەوهەرە نایابەی هەر گیز نافەوتێ‌و هەر باقیەو بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە . ئیدی کارم بە دنیاو خەڵکی دنیا نەماوە خوداتان لەگەڵ . وامن سەرم نایە خاکی بەرپای یارو بووم بە مەحرەم‌و هاوراز ، وەك حەزرەتی موسا لە کێوی سینادا تەجەللای خودای دەبینێ ، منیش لەو ژوانگەیەدا هاودەنگی یارم . لە دێری سێ‌یەمدا پەردەی مادی لە بەرچاو هەڵگیراوە ، لەسەر هەق‌بووەو بۆ ئەستاندنی هەق هەستاوە . بە هەق گەیشتوە ، لە گەڵ نوری هەق تێکەڵ‌بووە بۆیە لەسەر سێدارەی عوسمانیەوە خۆی بە بەرزترین دادەنێ‌و کە دنیا وەك شتێکی بێ نرخ لەبەر پێ‌ی داکەوتوە . ڕەمزی ئایەتی قورئانی پیرۆز — ولقد کرمنا بنی ادم» لەو پلەدا دەبینێ کە ئیشارەیە بە پلەی —صفوت—واتا پاك‌بوونەوە لە گشت گەردو تەپ‌و تۆزی ماددی‌و لەو مەقام‌و پلەدا لە کۆڕی — ساقی — کە مەبەست زاتی — خودا — یان پێغەمبەرە «د .خ» بوومە مەحرەم‌و لە دەست ساقی‌و لە کانیاوی بەهەشتی — کەوسەر — تێراوو سەرمەست‌و سەربەست بووم . بە ڕەمز ئەتکی عوسمانیەکان دەکاو ڕای دەگەیەنێ کە وەجاخ کوێری دیناو قیامەت هەر ئێوە داگیر کەرانی نیشتمان‌و خوێن ڕێژانی نائینسانن . ئێمەی بە ڕواڵەت کوژراو ژیانی نوێمان پێ دەبەخشرێ‌و ناومان لە دڵی نەتەوەو مێژوودا هەر دەمێنێتەوە . لە دێری ئاخری ئیدی هیچی تیا ناهێڵێتەوەو بە جارێ پەردە لەدەدا چوونە سەر سێدارەکەی بە میعراج دادەنێ هەروەك پێغەمبەر —د .خ— لە میعراجەکەی‌دا زۆر شتی نهێنی پێ گوتراوەو بە چاو زۆر شتی بینی . شێخی شەهیدیش وشەی — من رأني بو سعید —ی بیستوەو نهێنیەکانی دیتوە . ئەو دەنگە هەزار ئاهەنگە خۆشەی بیستوەو بەو ئەوینە پیرۆزەوە مەلی بەرزەفڕی گیانی بۆ ئەبەدیەت هەڵفڕیوە ماڵ ئاوایی لە گەل خواستوەو یارانی بە خودا سپاردوە .

خوێنەرانی خۆشەویست : ئەوە قسەی گوێ ئاگردان‌و گیرو گیڤی ڕۆشنبیران‌و گەف‌و لاف شاعیران‌و خۆ بادانی سەر شەقام‌و خیابان نیە . ئەوە بازاڕی گەرمی ئەشق‌و ئەوینی بەڕاستیەو گەرمترین‌و بێ بەها ترین شت ، گیانەو بەخت کردنی ژیانە . چاو پۆش‌کردن لە ژن‌و منداڵ‌و سەروەت‌و سامانە ، سەردانەواندن بۆ چەوسێنەران‌و داگیرکەرانی کوردستانە . بەداخەوە سەبارەت بەو کارەساتە دڵ تەزێنانەو ئەو کۆڕو کۆمەڵ‌و ڕێکخراوانە نووسراوەیەکی مێژوویی نەنووسراوەو لە چلۆنایەتی سیاسی‌و ئابوری‌و کۆمەلایەتی ئەو سەردەمەو ژیانی هاوڕێ‌یانی شەهیدی شێخ بابا زانیاریەکی ئەو تۆ بلاو نەکراوەتەوە چونکە قات‌و قڕی‌و گرانی‌و سەفەر بەر کۆچ‌و کۆچباری دەورەی گلاوی عوسمانلی کارێکی وای کردوەکە زیندوان ئاواتیان بە مردوان خواستوە .

ئەگەر تەمەن ماوە بدات لەداهاتودا دیسان سەبارەت بە شەهیدانی دیکەمان دەدوێین‌و سەرتان دێشێنم ! .

**شەهید حەمە حوسێن خان سەرداری بۆکان**

بەر لە لێکۆڵینەوەی ژیانی پڕ لە شانازی ئەو سەردارە

شەهیدە بە پێویستی دەزانم کورتەیەك لە چۆنیەتی پێکهاتنی ئەو بنە ماڵە هەڵکەوتووە بنوسم .

بەڵکو شارەزایانی دیکەش تەو بنوێنن‌و ئەوەی نەمزانیوەو ئەوان دەزانن ، روونی بکەنەوەو بە مێژووی کوردوستانی پێشکەش بکەن .

بنەماڵەی سەرداران : ئەو بنەماڵەیە بە هۆی سەردار عەزیز خانی موکوری‌یەوە ناسراوەو دامەزراوە ، سەبارەت بە کەسایەتی‌و زانایی‌و لێوەشاوەیی‌و ئازایی ئەو سەردارە هەڵکەوتووەی سەردەمی خۆی بە چەند مێژووی زەمانی قاچارو هەروەها مێژووی دەسەڵاتدارانی ئێران‌دا ناوی بە باشی‌و بەرزی براوەو رێزی لێ‌گیراوە .

کاك (محەمەد رەوف توکلی) بانەیی لە کتێبی (جوغرافیاو تاریخ بانە) بە زمانی فارسی بە کەڵك وەرگرتن لەو سەرچاوانە دەنووسێ «عەزیز خانی سەرداری موکری لە پیاو ماقووڵان‌و دەسەڵاتدارانی بە ناوبانگی دەوری قاجەری‌یەکان وزاوای میرزا تقی خان ، امیر کبیر ، صدر أعظم (سەرەك وەزیران)ی ناسرەدین شایە کە لە سەرەتای پاشایەتی «محەمەد شاه»ی قاجار هاتە ریزی فەرمانبەرانی دەوڵەت‌و لە ناوەراستی پادشایەتی پادشای ناوبراو ، تانیوەی پادشایەتی ناسرەدین شا ، ووردە ووردەو پلە بە پلە سەرکەوت‌و زیاتر لە «٣٠» ساڵ کارگەلی گەورەی بەدەستەوە بووەو چوار رێیانی سەردار (لە خیابانی حافظ)و ئاوی سەردار لە تاران یادگاری ئەون ، عەزیز خان کوری محەمەد سلطان وەکو بیستوومە خاوەن موڵکی نەستان‌و سێ سێرو لەوێوە ماڵی هاتۆتە سەردەشت و عەزیز خان لە ساڵی ١٢٠٧هـ لە شاری زەردەشت لە دایك‌بووەو لە ساڵی ١٢٨٧ لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا لە تەورێز دەمرێ‌و لە لای ئیمام زادە هەمزەوە دەنێژرێ . سەردار عەزیز خان کاتێ لە لایەن (صدر اعظم)ـەوە ئەرکی کوژاندنەوەی ئاگری (بابیگەری) لە زەنگانی پێ سپێردرا ، هەر لەو کاتەدا (ئەلکسەندەر نیکلاویچ) وەلی عەهد واتا جێگری ئیمپراطۆری روسی هاتە «قەفقاز» فەرمانی پێ‌دەدرێ کە بۆ راگەیاندنی پیرۆزبایی بچێتە لای‌و دیاری‌یەکانی شەهەنشای ئێرانی پێشکەش بکا .

سەردار ئەو ئەرکەشی بە باشی بەجێ هێنا ، (وابزانم لەو چاوپێکەوتنەدا عەلاقەی تایبەتیان پێك هێناوە) سەردار عەزیز خان پیاوێکی زاناو ئەدیب‌و خۆش نووس‌و ئازاو دلێرو جوانمێربووە ، ئەگەر ژیان نامەی کۆ بکرێتەوەو لێ‌بکۆڵرێتەوە مەعلوم دەبێ کە هەڵکەوتوویەکی کووردە کە لە نەداری‌و لێ‌قەوماوەیەوە دەستی پێ‌کردەوە ووردە ووردە سەرکەوتووەو بە پلەی هەرە بەرزی سەردار کولل‌و فەرماندەری گشتی هێزەکانی ئێران (وەزیری بەرگری) گەیشتووە ، لە گەڵ بنەماڵە ماقولێ‌و کاربەدەست‌و دەسەڵاتدارەکانی ئێران‌دا خزمایەتی‌و دۆستایەتی بەتینی پێك هێناوەو کوری وەك سەردار سەیفەدین خان)ی پێگەیاندوە کە ئەویش پیاوێکی زاناو لێ‌هاتوو بووەو بۆکان‌و دێهاتی دەوروبەری کریوەو بە شێوەیەکی دادپەروەرانە ئاوەدانی کردۆتەوە .

لە لایەن حکومەتەوە نازناوی سەرداری‌و حکومەتی موکوریانی پێ بەخشراوە وەك بیستوومە سەردار سیف‌الدین خان کوری لێ‌هاتوو نیشتمان پەروەری خۆی واتا سەردار حەمە حوسێن خانی بۆ خوێند نی زانستی نیزامی‌و سیاسی‌و بۆ سەلماندنی دڵمەندی بنە ماڵەیی بە دزگای ئیمپراتۆری روسیای تزاری ناردۆتە پترسبۆرگ (لینین گراد) پایتەختی ئەو زەمانە ئیمپراتوری روسی‌یە حەمە حوسێن خان قەڵای بۆکانی بە شێوەیەکی نوێ دروست کردەوەو ئاوی (حەوزی گەورەی) بە (تولپا) بۆ نێو حەوشی قەڵا راکێشا کە لەو دەمەدا جێگای سەر سوورمانی خەڵك بووەو ئێستاش شوێنەواری ماوە هەروەها مزگەوتێکی گەورەو حەمامێکی بۆ خەڵکی درووست‌کرد .

سەردار حەمە حوسێن خان ، میرێکی دادپەروەرو بەزیبك‌بوو وەج‌و رەفتاری وەك شازادەیەکی زانای روسی‌یەو لە جوانمێری‌و میوانداری‌دا وەك شوالی‌یەکانی فەرەنساوی‌بووە ، تاقێ لاوانی هەڵبژاردوەو مامۆستای تایبەتی بۆ هێناون‌و فێری

مۆسیقای سووپایی کردوون ، مۆزیك‌و باڵه‌بانی سەرداری ۆکان ناوبانگی بۆ هەنداران رۆیشتووە . بە داخەوە شیعرو ؛هەنگەکانی فەوتاون ، جل‌و بەرگی کوردی بە شێوەی سووپای رووسی یەك دەست‌و یەك رەنگ بۆ نۆکەران‌و کاربەدەستانی تیبەتی خۆی دروست کردوە .

سەرداری خوێندەوارو زاناو هەندەران دیتوو شارەزای سیاسەتی جیهانی خاوەن هەستی کوردایەتی‌و نیشتمان پەروەربووەو بۆ سەر بەخۆیی کوردستان گەلاڵەیەکی زانستی‌یانەی دارشتووە ، بە ئاگاداری لە وەزعی نێوخۆیی دوو حکومەتی بەرواڵەت گەورەو بێ ناوەرۆك کە رۆم‌و عەجەمن کە یەکێ بە ناوی دین‌و یەکێ بە ناوی هاورەگەزایەتی گەلانی کوردو عەرەب‌و کەمایەتی‌یەکانی دیکەیان دەچەوسانەوە ، و بە شارەزایی ئەو راستیە مێژوویی‌یە کە دەردی گەورەیی نەتەوەی کورد ، ناتەبایی‌و دووبەرەکی ناو خۆیەوەو دەرمانی یەکیەتی‌و برایەتی‌و نەهێشتنی ناتەبایی‌یەکانە .

سەردار بە دڵنایی لە پشتیوانی ئیمپراتۆری روسی‌یە کە کوردستانی سەربەخۆو لایەنگری ئەوان ، بە قازانجی‌یانە بۆ بەدی هێنانی گەلاڵەکەی دەکەوێتە تێکۆشان‌و لە گەڵ زانای نیشتمان پەروەر شێخ عبدوالقادری شەمزینی پێوەندی دەگرێ‌و هاوپەیمانی ئەوزاتە گەورەیە چنگ دێنی .

لەو سەردەمەدا ، قەلەندەرێکی دڵپاك‌و نوورانی کە تەریقەی قادری‌و پەروەردەی دەستی کاك ئەحمەدی سلێمانی‌و لەبنەماڵەی پیرۆزو ناوداری بەرزنجەیی گوندی غەوس ئاباد بە ناوی حەزرەتی شێخ عبدوالقادری گەیلانی‌یەوە ئاوەدان دەکات‌و تەکیەو بارەگای لەوێ دەبێ ، خاوەنی موریدێکی زۆرەو هەستی نیشتمان پەرستی بەتینە ، ئەو دوو عاشقی کوردستانەش واتا شێخ بابای غەوس ئابادو سەرداری بۆکان یەك دەگرن‌و پەیمان دەبەستن .

بۆ نەهیشتنی ناکۆکی‌و ناتەبایی‌و پێك هێنانی یەکێتی‌و برایەتی لە بەینی حاکمانی سەقزو بانەو ئاغاو دەسەلاتدارانی موکریان‌و پەرە پێدان بە کۆمەڵەکەیان . سەردار دەکەوێتە تێ‌کۆشان‌و کچی خۆی لە کورە گەورەکەی (حاجی ئیلخانی) واتا مەحمود ئاغای حەمامیان مارە دەکات‌و بە ناوی چاوپێکەوتن‌و دیدەنی‌و میوانی هات‌و چۆی گشت لایەك دەکاو ئەوانەی کە ناحەزی یەك بوون ، دەیانباتە ماڵی یەکتری بە داب‌و نەریتی کوردەواری ، ئیدی ناخۆشیان نامێنێ ئەوانیش بۆ ماڵی خۆی کەدەزگای شاهانەو وەك حاتەمە بانگ هێشتن دەکا بیستوومە بە سوارەی بەشکۆو تایبەتی‌و مۆزیك‌و باڵەبانی سەر داری‌یەوە گەرەکیەتی بێتە سەقز ، سیف‌الدین خانی ئەردەلان حاکمی سەقز تا گوندی سەرا بەروپیری دەچێ‌و لە وەختی نان خواردنی نیوەرۆ لە سەر بریارو ئەمری سەردار خزمایەتی لە نێوان حاکمی سەقزو حەسەن ئاغای سەرا پێك دێ کاتێك کە سوارێك خەبەری هاتنی سەردار لە سەراوە بۆ سەقز بە خەڵك رادەگەیەنێ ، خەڵکی شار بە ژن‌و پیاوەوە تا گوندی ساڵحاوا بەرەو پیری دەچن‌و بە خێرهاتنی دەکەن ، ئەورۆژە وەك رۆژی جەژن ، هەر شایی‌و خۆشی‌و هەڵپەرکێ بووە لە سەر ئەمری سەردارحەمەخانی بانەیش دێتە سەقزو لەلایەن سیف‌الدین خانەوە میوانداریەکی شاهانەیان لێ دەکرێ . پاش چەند رۆژێك سەردارو سیف‌الدین دەچنەوە بۆ بانە .

بیستومە کەلەو زەمانەدا رەسم وابووە کە جوولەکە نیشانەیەکی (شین) بەسەر شانیانەوە بێ کە لە ئیسلام جۆی ببنەوەو سەرانەیەکی تایبەتیش بدەن بەلام سەرداری ئازادیخواز ئەو ، داب‌و سەرانەی لەسەر مووسایی‌یەکان لابردووە وەك برایەکی خۆی تەماشای کردوون .

ئەو گەرانە سیاسیانەی چەند ساڵ بەر لە شەری جیهانی هەوەڵ بە توندی لە لایەن کۆمەلانی نەتەوەی کوردو کەمایەتی‌یەکانی دانیشتووی کوردستان پشتیوانی لێ‌دەکرا و ناوی بەرزی سەردار وەك پێك هێنەری ئاشتی‌و داد بەرێزەو دەبرا .

لە باری کۆمەلایەتی‌یەوە شەرو کێشەو تالان‌و برۆ بەجارێ فەوتابوو ، لە باری ئابووریشەوە بە هۆی ئارامیشەوەبازرگانی

ڕەونەق پەیدا کردو لە گشت لایەکەوە ، لە موسل‌و کەرکوك‌و سلێمانی‌و تاران‌و تەورێزو هەمەدان‌و زەنگان‌و دیار بەکرو ئەرەزروم‌و وانەوە بازرگان بە ئەمینی‌و سلامەتی دەهاتنە مەهابادو سەقزو بانەو بە قازانج‌و بە خۆشی دەگەڕانەوە کشت‌و کاڵ‌و ئاژەڵ داری بە شێوەیەکی بەرچاو سەرکەوت‌و داهاتی گوندنشینان چووەسەرەوە .

مەسەلەی کوردستانی سەربەخۆ بە ڕواڵەت تەواوو هۆیەکانی ئامادەببوو ڕۆم‌و عەجەم بێ یارمەتی کوردی نیشتمان فرۆش توانای شەڕیان نەبوو ، بەو یەکێتی‌و خزمایەتیەش کە پێك هاتبوو نیشتمان فرۆشێکی واناودارو بە دەسەلاتیان بۆ نەمابوو کە بتوانی کارێکیان بۆ بکات ، چونکە ئەگەر عوسمانی بیویستایە هێرشیان بێنێتە سەر ، دەبوو حکومەتی ئێران ڕازی بکات ئەو کاتەش ئەگەر لە باشورەوە هێرشی هێنابا ، کوردەکانی تورکیاو لەسەر ئەوانەوە بنە ماڵەی پیرۆزی شەمزینی بەرهەڵستیان دەبوون عەسکەری تورکی‌ماندو شڕو شرۆڵ بە تەنیا کارێکی پێ نە دەکرا ، ئەگەر لەلای باکورەوە هێرشی هاوردبا ، خۆ شێخ مەحمودی بەرزنجی یاریەی نەدەدان ، بەلام لە بەختی ڕەشی کورد لە ساڵی ١٩١٤ زایینی شەڕی گەورەی جیهانی دەستی پێ‌کردو حکومەتی عوسمانی بە یارمەتی ئەڵمانی قەیسەری دژی ڕووس‌و بەریتانیا چووە نێو جەرگەی شەڕەوەو لاپەڕەی مێژوو هەڵگەڕایەوە ، سوڵتانی عوسمانی بە ناوی خەلیفەی ئیسلام‌و جێ‌داری پێغەمبەر (د.خ) بانگی جیهادی داو شەڕی کوفرو ئیسلامی بە تەواوی موسوڵمانان ڕاگەیاندو داوای لە گشت موسوڵمانان کرد کە بۆ پەرەپێدانی ئایینی ئیسلام‌و ڕاگرتنی حکومەتی ئیسلامیەوە دەبێ بچنە شەڕو لە ژێر ئالای خەلیفە ڕابجەنگێن و بکوژرێن‌و بچنە بەهەشت ! ! ! تەنیا ئالاکەی پێغەمبەر دێنمە دەر . ئەو ڕاگەیاندنەی غەزاو جیهادە کاری خۆی کرد . کۆمەڵانی دڵپاك‌و ساویلکەو بێ ئاگا لە فرۆفێڵی سیاسەت بە گشتی ئامادەی غەزابوون ، مەوعیزەی مەلابوو بە باسی ئەجری غەزاو تاریفی خۆشی بە هەشت‌و جوانی‌و ڕازاوەیی حۆریەکانی کە بە هەزاران ئامادەن‌و چاوەڕوانی شەهید دەکەن ، بیستومە کە سۆفیەکی ساویلکەی بانەی تەنیا (باسقەندە) یەکی دار بەلاڵۆکی ئەستوورو درێژی دەبێ ، لە کاتی مەوعیزی مەلا دێتە جۆش‌و بەگریانەوە دەڵێ (یاشەهید دەبم ، یابەم باسقەندەیە لە دەروازەی مۆسقو دەدەم و ئەوەندە تالان دێنمە وەبەشی حەوت پشتم بکا) لەو هەول‌و مەرجە دژوارەو لە گەڵ ئەو هەستە بەتینە بێ‌هەوسارە ، دژایەتی لە گەڵ حکومەتی ئیسلام بۆ هیچ کوردێك نەدەکراو سەرداری زاناش چاوەڕوانی هەل ، بەرواڵەت بێدەنگ دانیشت .

کاربەدەستانی عوسمانیش تەنیا لە کەڵکی خراپ وەرگرتن لە هەستی ئایینی گەلانی موسڵمان وەستابوون‌و توانیان بە قازانجی گلاوی خۆیان ئیسلام بکەن بە بیانوو مشایخان‌و مەلاکان هان بدەن‌و بیان هێننە ، کۆڕی غەزاوە ، کۆمەڵانی میلیونی گەلانی کوردو عەرەب وەشوێن خۆیان ڕاکێشن .

خوێنەری بەرێز ! ڕەنگە لێرەدا تۆیش تووشی بەراوردکاریەك هاتبی‌و وەزعی ئێستای کۆماری دژی ئینسانی‌و بە ناو ئیسلامی ئێران ، هاتبێتە بەرچاوت ، ئەوە تاوانی من نی‌یە ، کارەساتی مێژووە ، بزانین حیزب‌و تاقمەکەی سەرداری شەهید چیان کردو وەزعیان چۆن هەڵسەنگاندوە ، لە ناوچەی موکریان داچی قەوماوە چی هاتوەتە مەیدانی سیاسەت ؟

بە لەبەرچاو گرتنی ئەو ڕاستیە کە وەزعی حکومەتی تاران وەك حکومەتی عوسمانی‌وە بگرە زۆر زیاتریش شپرزەو شپریۆبووە . بنەماڵەی بەرتیل خۆرو نازناو فرۆشی قاجاری بە هۆی پەرەپێدانی دەرەبەگایەتی‌و فرۆشتنی ئیمتیازات بە بەریتانیاو ڕوسیای تەزاری وەك نوێنەرو کوێخا بە ناوی شاهەنشاوە حکومەتیان دەکرد .

سەرداری شەهید بە هۆی دۆستانی وەك (ئەمین الدولة) باوکی دکتور عەلی ئەمینی‌و ئەوتاقە بە دەسەلاتەی کە لە مێژووی ئێراندا بە «ڕوسوفیل» ناو نراون ئاگاداری وەزعی حکومەتی بێ ناوەرۆکی شاهەنشابووە .

لام‌وایە نەخشەکەیان وابووبێ کە لە کاتی دیاری کراودا بانگی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان راگەیەنن‌و حکومەتی روسیای تەزاریش بە رەسمی بنیاسیێ‌و پەیمانی یەکێتی لە گەڵ دابەستێ‌و ئەگەر پێویست‌بوو یارمەتی سوپای بدات ناوچەی بادینانی کوردستانی ئێران بە هۆی لەشکری جەلالی‌و شکاك‌و لەشکری شیخ عبدالقادری شەمزینی‌و لەشکری سەرداو هاوپەیمانانی لەمەهابادو بۆکان‌و سەقزو بانەو تیلەکۆواوێ دەچێ ئەردەلانەکانی سنەش بە هۆی سیف‌الدین خانی ئەردەلانەوە بریاری هاوکاریان دابێ ، کوردستان لە ئێران بە ئاسانی جوێ بکەنەوە چونکە سەردارو هاوەلانی بە باشی دەیانزانی کە حکومەتی تاران بێ هاودەستی‌و یارمەتی کوردە نیشتمان فرۆشەکان نەی توانیوە بە سەرسوپای کوردا زال‌بێ دیارە سام‌و شکۆی ئەو دەستە بە هێزە ئەوەندەبوو کە نە خەیانەتی نیشتمان فرۆشان تارادەیەکی زۆر دڵنیابن .

بەلام بە داخەوە روو دانی شەری گەورەو هاتنە مەیدانی مەسەلەی (غەزا) ئەو پرۆژەو گەلالەیەی تێك‌داو عومەر ناجی بەگ فەرماندەری گشتی سوپای تورکان لەم بەشەی کوردستانەوە زۆر زیرەکانە کەڵکی خراپی لە ئایین وەرگرت گەرچی حکومەتە شرەی تاران بێ لایەنی خۆی لەو شەرە سامناکەدا راگەیاندبوو . بە گوێرەی قانوونی نێو نەتەوایەتی دەبوو وولاتەکەی بپارێزرێ‌و نەبێتە کانگای شەر ، بەلام هەر لە هەوەڵ رۆژی شەردا سوپای عوسمانی کەوشەنی بری ولە سنورتێ پەری لە باشوورو باکورەوە ناوچەی شکاك هەرکی‌و شنۆو لاجان‌و مەهابادیان گرت‌و لە سلێمانیشەوە بە دوو قۆڵی هەم لە مەریوانەوە بۆ لای سنەو هەم لە بانەوە بۆ سەقزو موکریان ، هێرشیان هێناو بە ناوی غەزاوە دەستیان بە کوشتن‌و تالان‌کرد ، سوپای روسیش ئازەربایجانی گرتەوەو تەورێزی گرت بە ناوەندی فەرماندەری .

وەکو گوتمان عومەر ناجی وەك دەرسی لە لای مەلای خەتی خوێندبێ دینی‌کرد بە قەڵغان یا پەیژە بۆ مەبەستی سیاسی‌و نیزامی بابی عالی . کوردی بەراستی موسڵمان‌و ساویلکە بە بروای بەتینی‌یەوە بۆ چوونە بەهەشت لە عەسکەرە شرەی خەلیفە بە پەلەترو بە لەزتربوون . دەگێرنەوە کە عومەر ناجی بەگ دەچێتە لای جوانمێر شاعیری شەهید (قازی فەتاح) کە فەرمانی جیهاد بە خەڵکی شارو عەشایری دەوروبەری مەهاباد بدات بەلام قەولی ناداتێ ، فەرماندەری فێلاوی بۆ بەیانی پیاوماقوڵ‌و مەلاکانی دەم راستان‌و ریش سپی‌یەکان بۆ مەحکەمەی قازی موحسن بانگ دەکاو قازی فەتاح ناچار بە بەشداری لەو کۆبونەوەیە دەکات ، رۆڵەی ئازاو بەوەجی کورد قازی فەتاح دەڵێ ئێمە وەك دەوڵەتەکەمان بێ‌لایەنین‌و شەری ئیمپراتۆری روس بە ئێمەی بێ چەك‌و تفاق ناکرێ‌و دەرەقەتیان نایەین ، حاجی ئەحمەد باوکی حاجی رەحمەتی شافعی پشتیوانی لە قسەکانی قازی فەتاح دەکا بەلام دەستەی تورك خوازو تاقێکی زۆری ساویلکەی ئاشقی بەهەشت قسەی لە دەم دەبرن‌و بە جەزبەو حاڵ‌و گریانەوە بریاری غەزا دەدەن ، ئیحاسات جێی‌مەنتق دەگرێت‌و قازی فەتاحیش چاری نامێنێ ، لەوزەستانە سەختەدا شەر دەست پێ‌دەکات‌و لەشکری عوسمانی پاش چەند سەعات پاشەکشە دەکەن‌و روسەکان سابلاغ دەگرن‌و کوشتارێکی سامناکی لێ دەکەن‌و تالانیشی دەکەن لە ساتەکانی ئاخری شەردا جوانمێری شەرەفمەند قازی فەتاح شەهید دەبێ .

لەو هەڵ‌و مەرجەدا بووە کەیاسەردارو شێخ بابا پیاویان ناردوە یا ئەمرەکە لەلایەن ئیمپراطۆرەوە گەیشتووەتە تەورێزو بۆ راگەیاندنی مەبەستێکی هەرگرینگ لە تەورێزەوە تەترو قاسیدی بەرەو بۆکان وەرێ دەکەوێ ، ئیدی مەعلووم‌نی‌یە چۆن بووە کە ئەو پەیامە دەکەوێتە دەست عومەر ناجی بەگەوە کە لە سەقز دەبێ‌و دەس بەجێ سیف‌الدین خان دەگرێ‌و رەوانەی مەراغەی دەکا ، ئەفسەرێك بۆ بانە دەنێرێ کە بە گورجی حەمەخانی یونس خان گوللەباران‌کەن ، ئەفسەرێکی دیکەش دەنێری‌و سەردار لە بۆکان دەگرن ئەویش بۆ مەراغە بەرێ دەکەن‌و هەردوکیان لەوێ شەهید دەکەن ، تەرمی

پیرۆزیان دەهێننەوە بۆ سەقزو بۆکان .

سەرداری شەهید کوڕێکی هەبوو بە ناوی سەردار عەلی خان کە وەجاخ کوێر بووەو بە . . مردنی ئەو تۆماری بنەماڵەی سەردارەکانی موکریان پێچرایەوە .

سەبارەت بەبنەماڵەی سەردارانی موکریانی زۆر پرسیارم بۆ هاتۆتە پێش‌و هەرچەندە تێکوشاوم نەم توانیوە وەلامی دەس خەم ، هیوادارم لاوانی تێکوشەرو نیشتمان پەروەری موکریان ، کەم‌و کوری‌یەکان پڕکەنەوەو بتوانن مێژووی ئەو بنەماڵەیە بۆ ئاگاداری نەتەوەی کورد بنوسن .

دەزگای شێوە میری (سەردار)ی بۆکان بە هۆی عەسکەری رووت‌و برسی حکومەتی خەلیفەی ئیسلام تالان‌کراو هەر لەئەسپە رەسەن‌و تایبەتی‌وُ زین‌و بەرگی نایاب‌و بەزێرو زیو نەخش‌کراو ورەختی زیوینی ئەسپەکانەوە تا فەرش‌و مافورە بێ‌وێنەو شاهانەی بەگشتی بەش‌و رەش‌کرا ، بەلام ئەوەی زۆر جێی داخەو برینێکی ناسۆرە کە هەرگیز سارێژ نابێ‌و خەسارێکی گەورەی ئەدەبی کوردە ، تالانی کتێبخانە بە ناوبانگەکەی سەردارە ، بیستوومە کە سەردار زۆری حەز لە کتێب خوێندنەوەو راگرتنی بووە ، سەدان کتێبی فارسی‌و عەرەبی‌و کوردی دەسنووسی بە بەهای زۆر کڕیوەو خۆش نووس‌و دەنگ خۆشی خۆش ویستووەو نەوازشی کردوون .

شانامەیەکی دەسنووسی هەبووە کە شەڕو شۆرەکانی تێدا نەخش‌کراوەو زێر گفت‌و سورنج‌و زۆرەنگی دیکەرەنگ کراوە کە لەو زەمانەدا هەزار زێر خەرجی هەلگرتووە .

کردەوەکانی شەهیدی سەربەرز هەمووی ئامۆژگاری بۆ نەتەوەی کوردە ، هەر ئەوە کە کەوێکی بە ناوبانگی بە چل زێر کڕیوەو بە گورجی ملی هەلکەندوەو فڕێ داوەو فەرموویەتی . کە سێ هاوڕەگەزی خۆی بخاتە داوی دوژمن نەمانی باشترە . پەندێکی گەورەو بەنرخە ، شاعیران‌و زانایان لە لای سەردار ماقول‌بوون‌و ڕێزی لێ گرتون‌و دەیان مەلای چاك‌و سەدان فەقێ بە خەرجی سەردار پێ‌گەیشتوون .

ڕەخنەو لێکۆڵینەوە

# لێك ترازان و

«ئەم نووسینە تێبینی‌و سەرنجی
تایبەتی خۆمن . ناچنە خانەی ڕەخنەوە»

گۆتەیەك هەیە دەلێ : «هەر کتێبێك کە چاپ کراو بێ چەندو چۆن لە سەر کردن ، چووە نێو کتێبخانەوە ، ئەو کتێبە بە کتێبێکی مردوو دەژمێردرێ» ئەو قسەیە ئەگەر بۆ بازاری ئەدەب‌و ڕەخنەی هەر نەتەوەو ولاتێکی تر ڕاست‌و لە جێ بێ ، ئەوە بۆ ئەمڕۆی ئەدەبی کوردی نابێتە یاساو ناتوانین بەو چاوەوە تەمەشای کتێبی کوردی بکەین . سالانە چەندین کتێبی باش دەکەوێتە بازار . . چ لە دانراوو کۆ کراوە چ لە وەرگێران . بەشی زۆریان هەلدەگرن لە سەریان بنووسرێ‌و هەلبسەنگێندرێن ! بەلام وەکو دەبینین ! ئەو کتێبانە بە کڕی دەچنە نێو کتێبخانەوە .

هەتا چەند ڕەخنەگرێکی لێ‌هاتووی کورد پەیدا دەبن‌و دەتوانن ، لە سەر ڕێبازێکی زانستی ڕەخنەی کوردی بێننە کایەوەو ڕێبازێکی ڕەخنەیش تایبەت بە ئەدەبی کوردی‌سەر هەلدەدا ، خراپ نیە نووسەران خۆیان بارو سەرنجی تایبەتی خۆیان لە سەر بەرهەمی یەکدی بلاوبکەنەوە . با ئەو نووسینانەش نەچنە خانەی ڕەخنەی زانستی‌و لە سنووری ڕای




# ناکۆکی خێزان

مەولود ئیبراهیم حەسەن .

تایبەت بووەستن . خۆ زۆر جار وا بووە نووسەران ، لەم نووسینانە شتی وایان گوتووە ، کە پاشتر ڕەخنەگران سوودی زۆریان لێ بینیوە ! ئەم نموونانەش لە ئەدەبی جیهانی زۆرن . زۆر نەتەوەو وڵات هەیە ، لە گەڵ ئەوەی ڕەخنەشیان شان بە شانی ئەدەبەکەیان دەڕوا هێشتا نووسەرانیان لا بە لا ئەم سەرنجو بۆ چوونە تایبەتی یانەی خۆیان بڵاو دەکەنەوە . بۆ ئەمرۆی ئەدەبی کوردی ئەم کارە ئەگەر جیێ ڕەخنەش نەگرێتەوە ، ئەوە زەمینەیەکی لە بار بۆ دروست بوونو سەر هەڵدانی ڕەخنە دەسازێنی .

منیش ئێستا هەر بەم تێڕوانینو بۆ چوونە کە لە خوێندنەوەی (لێك ترازان) بوومەوە ، سەیرم کرد هێڵ کێشانو خستنە نێو کەوانەیەکی بەر چاو لە نێو لاپەڕەی چیرۆکەکاندا پەیدابووە . حەزم نەکرد ، ئەم هێڵو کەوانانە لە خوێندەوارو کاك سەلاح بشارمەوە ، بەو هیوایەی سوودێك ببەخشێ .

کاك سەلاح عومەر چیرۆك نووسێکی گەنجەو چەند ساڵێکە چیرۆك بڵاو دەکاتەوە . چیرۆکەکانیشی خوێندەواری خۆیان هەیەو پێشوازی دەکرێن . بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە ، کە بێ ئەوەی کاك سەلاح خۆی ئاگاداربێو کاکە براڵەی لە گەڵ کەس هەبێ ! چیرۆکەکانی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی ، ئێستاش کە (لێك ترازان)ی چاپو بڵاوکردووتەوە ، خوێندەوار دەتوانی یەك پشی کۆمەڵێك چیرۆکی کاك سەلاح بخوێنێتەوەو لە پەنایانەوە خەمو توانای نووسینی چیرۆك نووس بناسێ .

* * *

خوێندەوار کە لە خوێندنەوەی چیرۆکەکان دەبێتەوەو بیر لە هەموو چیرۆکەکان دەکاتەوە ، هەست بەوە دەکا ، کە کاك سەلاح باسی خێزانێك دەکاو یەکە یەکەی ئەندامەکانی ئەو خێزانەو کەسەکانی چیرۆکەکان کاکی نووسەرن .

لەوەش خۆشتر خوێندەوار واتێ دەگا ، کە پاڵەوانی هەموو چیرۆکەکان یەك پاڵەوانن ! ئەوەتە لە چیرۆکی (ڕق)و (دەمامك) هەردوو پاڵەوان یەك مەبەست دەر دەبڕن . لە چیرۆکی ڕق دەنووسێ (وا دیارە لە بیرتان چۆتەوە ئێوەش لە گۆشتو خوێنو ئێسقان دروست بووینە ، وەکو منتان لێ دێ . . چاوەڕێ بن . . بڕۆن نەعلەتتان لێ بێ . .) ل٨٦[١] دیسان لە دەمامك دەنووسێ : (قەیدی نیە ڕاوەستێ ، ڕۆژێ دێ ئێوەش لە ناو خۆتان پێك نایێن ، ئێوەش تێك بەر دەبن .

گەورەتان بچووکتان دەخوا .) ل ١٦٠ .

کاك سەلاح لە چیرۆکی (ئەم‌و ئەو) باسی ژان‌و باری ژیانی سەرداری ماڵێك دەکات . کە بە بەر چاوی‌یەوە ژنەکەی خۆی‌و ماڵەکەی بۆ کورێکی نمەك بە حەرام دەرازێنێتەوە ، بە بەر چاوی مێردە نەخۆشەکەی سێبەری هەردووکیان دەبێ بە یەك ! ؟ !

ئێمە نازانین هۆی نەخۆشی کابرا چیە ؟ لەوەش ناچێ هێندە بەتەمەن بێ‌و بە دەردە پیری کەوتبێ ! بەلاّم هێندە هەیە نەخۆشەو دکتۆر دەستی لێ شوشتووەو ئەو قسەیەش بەر گوێی ژنە کەوتووتەوە ، ژنەش کە شتێکی لە دەست چووە ، هەوڵ دەدا بە شێوەیەکی تر پەیدای بکاتەوە .

دکتۆرە نەوال سەعداوی دەڵێ : (بەشی زۆری ژن‌و مێردی رۆژ هەلاّت تەنیا کاغەزی مارەبڕینیان دە بەستێتەوە)[٢] زۆر راست دەکا ئەوە تە ژنە کە چەند منداڵێکیشی لە کابرای نەخۆش هەیە هەر زوو لە خزمەت کردنی مێردەکەی بێزاردەبێ‌و پشتی تێ دەکا . لەوەش خراپ‌تر . زەق‌و زەق بە بەر چاوی‌یەوە . دەست لە گەڵ ئەو کورە تێکەڵ دەکات کە ماوەیەکی زۆر نیە هاتوو چۆیان دەکا . ژنە هەر بە کاغەزی مارەبڕی‌یەکە ژنی کابرایە دەنا هیچ رێزو خۆشەویستیەك لە نیوانیان دا نیە !

ژنەش شەرم لە کەس ناکات‌و کەسیش نیە لێی بترسێ ! چۆن زۆر ژن‌و مێرد هەن هەر لە ترسان پێکەوە دەژین . . جا ئەو ترسە لە یەکتر بێ یان لە خزم‌و کەس‌و کۆمەڵ یان ترسی بەرژەوەندی‌و ئابووری بێ ! ! ژنەش ئەگەر رێزو خۆشەویستی مێردەکەی لە لای ئەوەندە نیە کە لای کەم راوەستێ‌و چاوەڕێی مردنی مێردەکەی بکات . جا ئەو دەمە شوو بکاتەوە یان هەر چی بکا ! ! لە کەسیش ناترسێ !

جا لە کێ بترسێ ؟ ئەوە نیە شوو براکەی خەبەریشیان بۆ ناردووە هەر نایێ ! لێرە کابرای نەخۆش بە دەم هورێنە کردنەوە . هۆیەکی ترمان بۆ دەست نیشان دەکا . کە بوویتە هۆی ئەوەی ژنە تۆڵە لە مێردەکەی بکاتەوە ! ئەویش ئەوەیە کە (مێردەکەی) رۆژانی زوو (پاڵەوان)ی یەتیەکی خۆی بۆ ژنەکەی گێراوەتەوە ، کە چۆن ژنێکی وا لێ کردووە شەوانە لە باوەشی ئەو نە بێ خەوی لێ نە کەوێ ! لێرە کابرا پێی لە هەڵەی خۆی دەنێ . هەر دکتۆرە نەوال سەعداوی دەڵێ : (زۆری پیاوان وەکو نەعامە وان ، سەری خۆیان لە ژێر خۆڵ دەنێن و لایان وایە کەس نایانبینێ ، خۆیان بە شانازی‌یەوە چەندین پاڵەوانی‌یەتی خۆیان لە گەڵ ئافرەتانی دی دەگێڕنەوە کەچی لایان وایە ژنەکانیان دەست نوێژیان لە خۆیان نە بێ لە کەسی دی نەشکاوە) لە کوردەواریش لە مێژە گوتویانە (هەر کەسێ دەرگای خەڵکی راهەژێنی کەسێکیش دەبی دەرگای ئەو راهەژێنی !) .

ئەو ناپاکی‌یە لە چیرۆکی (کلۆڵ)یش دا هەیە ، بەلاّم بە بارێکی تر . ئەوەتە کچێکی گەنج لە ئامۆژگا دەخوێنی ، کەچی لە بەر نەزانی‌و هەژاری زۆر بە سادەیی بە داوی کورە دەوڵەمەندێکی نامەرد وە دەبێ ! بە ناوی خۆشەویستی‌یەوە لە خشتەی دەباو بێ بنی دەکا ! ئێستاش خۆی لێ خستوتە سەر پشت‌و هەر ناشی ناسێ . کچەش پاش چەند هەوڵدان‌و پارانەوە کە چاری نامینێ دێتە سەر ئەوەی سەری خۆی هەڵگرێ‌و بروا ، لەوەش مام سۆفی‌یەکی لێ راست هاتووەو رێگایەکی بۆ دۆزیوەتەوە ، ئەویش پاش ئەوەی مام سۆفی چەند جار دەچێتە لای کورەو تکای لێ دەکا ! کورە هەرگوێشی ناداتێ ، پاشان مام سۆفی پارێزەریش دەگرێ ! ! ! کەچی راپۆرتی دکتۆر پشتی کورە دەگرێ‌و کچە هەناسە سارد دەکات . کچەی بەستەزمان‌و هەژاریش لە ترسی براکانی‌و بە هۆی ناموس چوونیەوە . بریاری هەلاّتن دەدا . بە قسەو نامەی مام سۆفی رێگای دوورو سەر سنوور دەگرێتەبەر . بۆ ئەوەی لەوێ لە لای باوکی (محۆ) بحەوێتەوەو محۆش مارەی بکا ! ؟

کچە زۆر سادەو هەژارانە تووشی ئەم کەتنە هاتووە ، ئەم

جۆره کچانه زۆر زوو بە دوای دەوڵەمەندان وەدەبن ! ئەو کوره دەوڵەمەندە بێ زاخانەی کە ئەگەر دەوڵەمەندی کەیان لێ بستێنیەوە ، هیچ زانستو هونەرێکیان پێ نا مێنیو ئاوه رووت دەبن . شتێکی دیەیان نیە شانازی پێوە بکەن تەنیا لە پەنای دەوڵەمەندییەکەیان وەکو ماری سر بە هەزاران وەدەدەنو گۆران گوتەنی : دەخشێنەوە کونێ :

هەژاریش ئەگەر نەبێتە خەم . خەمیش نەبێتە هۆی بیرکردنەوە ، بیرکردنەوەش نەبێتە هۆی کارو کاریش نەبێتە هۆی گۆران ، ئەوە کچی هەژار ئاوا بە سەر دەردی گران دا دەکەوێ !

دیارە کورە دەوڵەمەندییەکەی هەر تەنیا کچەی هەڵنەخەڵەتاندووە ، بەڵکە حەقیقەتو ڕاستی بە پارێزەرو دکتۆریش گۆڕیوە ، سوێند خۆرانی ئەم پیشە پیرۆزەشی بە پارە لە خۆکردووتە پەنا ، لە سەر خۆ پشت ئەستوور بە پارە بە هەژارو بێ دەستان وە دەدا ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کچە ئامۆژگا بەجێ بێڵیو ڕووەو ئاوارەیی سەر هەڵگرێ ، کورەش شارەزایانەو کەمۆیانە تر سرە لە کچانی تر بگرێ ! ؟ !

لە (هەگبەی پیاوێکی پیر)یش چیرۆك نووس پیرێکمان بۆ بە قسە دێنی ، کە ژنەکەی مردووەو کچو کورەکانیشی شوویان کردووەو ژنیان هێناوە ، هەر چەندە لە لای کورەکانی دەژی ، بەڵام وا دیارە کورەکان هەر ئەوەتە دەری ناکەن ! هەرکە دەچێتە سەردانی کچەکانی هەتا دێتەوە بووکەکانی ژوورو ماڵەکەی وا دەگۆڕنو تێك هەردەشێڵن هیچ تێبینییەکیش بۆ هەستو نەستی ئەو ناکەن ! نەك هەر ئەوە . . ئەگەر ڕێزو خۆشەویستییەکی ئەوتۆشی لە لایان نیە ، داوای ئەوەشی لێ دەکەن کە جلی کوردیش لە بەر نەکا ، چۆن سەردەمی بە سەر چووە ! !

چیرۆك نووس زۆر چاکی کردووە باسی ئەو پیرە مێردەی هێناوەتە نێو ، ئەمرۆ هەر ماڵێکی پیرێکی ئاوای تێدا بێ ، ئەم جۆرە کێشەو هی دڵتەزێن تریشی تێدایە . هەر لە دەوری ماڵەکەی خۆت چاو بگێڕەو هەست ڕاگرە ، بزانە چەند دایكو باوك لە دەست کچو کورە بووکیان بە دادە دادن ! کە ئەم جۆرە هەڵسو کەوتانەش لە منداڵەکانیان دەبینن سوویان لە ماندوو بوونی خۆیان دەبێتەوەو کە بۆ کچو کورەکانیان کێشاوەو نا چار بە خۆ ناوەستنو دەکەوتە پرمەو پرتەو ڕێنە کردن ، بەرە بەرە ئەمە لێیان دەبێتە نەخۆشیو یەکجاری لەگەڵ دەورو بەرو کۆمەڵ لێك دەترازێن ! !

چەندم حەز دەکرد ئەم چیرۆکەی کاك سەلاح ناوی (بێوە مێرد) بوایە ، بۆ ئەوەی لە گەڵ (بێوە ژن)ەکەی کاك (شێرزاد حەسەن)ی چیرۆك نووس لێکمان مارە کردبان . بە ڕاستی کاك شێرزادیش زۆر جوان باسی مەسەلەیەکی کردووە . کە هەزاران ساڵەو هەزاران ئافرەت پێیوە دە تلێنەوە . ئەویش مەسەلەی شوو نەکردنەوەیە ! ئەو بێوەژنەی چیرۆکی بێوە ژنی کاك شێرزاد ، وەختی مێردەکەی دەمرێ تەمەنی بیست ساڵان دەبێ ! ! ئەو کورەش کە (لە ئێستای چیرۆکەکە) تەمەنی سی ساڵە ، ئەو وەختە دەڵەمەبووە لە سکی دایکی . بەڵام خزمو کەس لێ ناگەڕێن ئەو بیست ساڵانەیە مێرد بکاتەوە ! ئەویش بە ناچار بە سی ساڵ بێوەژن کۆشی . کورەکەی پێ دەگەیێ ، کەچی کورەکەشی پاش ئەو هەموو خۆ بەختکردنەی دایکی ، کە بۆنی قسەیەکی وادەکا . ڕوو لە دایکی دەکاو زۆر دڵرقانە پێی دەڵێ : (شەرم ناکا . . بە پیری خۆی تەڕ دەکاتەوە . . ؟ !) ل ۷۷ تەنیایی [٣] .

زۆر ژن هەن ، سەر بەرزانەو ڕوو سوورانە بە سەر منداڵەکانی خۆیان دانیشتوونو بە قەناعەتو باوەری خۆیان ، جوانی خۆیان بە قوربانی منداڵەکانیان کردووەو ئەگەر تەنیا یەك منداڵیش بێ لە دەست زڕ بابیان نەناون . بەڵام ! ئافرەتێك لە ترسی کەسو کارو دەورو بەر شوو نەکاتەوە . ئازارو ژانی زۆر لەوە گرانترە کە ئافرەتێك بە قەناعەتی خۆی دادەنیشێ . بە پێچەوانەی کەللە ڕەقی کوری بێوەژنێ ، کورەی سەفەر کردووی چیرۆکی کاك سەلاح نەك هەر پێی ناخۆش نیە کە

دیکی شووی کردووتەوە . بەڵکە زۆر بە هەستێکی جوان داك براکانیشی خۆش دەویٚو حەزدەکا بیانبینیٚ پێی وایە کە شێوەیان لە شێوەی خوشكو براکانی تری دەچیٚ .

شتێکی تر هەیە کە خۆشەویستیو ڕێزی کورەی سەفەرکردوو بۆ دایکی زۆر بە هۆی ئەوەیە ، کە ئەوو دایکی هەردووکیان زۆر لێکراون . ئەوەتە دایکی ژنی بە سەر هاتووەو دەرکراوەو لە منداڵەکانی خۆی دوور خراوەتەوە . کورەش لە ماڵ دەرکراوەو ناچار بووە دە ساڵ شاران بگەڕیٚو دەردی غەریبی بکێشیٚ .

ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی دایکی زیاتر خۆش بوویٚو ڕقیشی لە باوکی ببێتەوە ! !

ئەم ڕق لە باوك بوونەوەیە پەڕیوەتە نێو چیرۆکی (تەرم)یش بەڵام ، بە شێوەیەکی تر . کورە نایەویٚو ناشویریٚ شەو بە تەنیا لە دیار جەنازەی باوکی ئێشك بگریٚ . بە تەنیاو لە ژووریکیشدا . چونکە نابیٚ بنێژریٚ . هەتا مامی نەیەت ، کام مام؟ ئەو مامەی دوو مانگەی براکەی لە نەخۆشخانە کەوتووە ، کەچی زەحمەتی سەردانێکی نەکێشاوە ! ! ئێستاش بە پیٚی ڕەسمو عادەت دەبیٚ جەنازەکە تەقەت نەکەن هەتا برای لە دیار نەبیٚ .

لەم چیرۆکە کاك سەلاح لە سەر دوو شت زۆر پیٚ دادەگری . یەك مەسەلەی باری خزمایەتی‌یە ! بە ڕاستی لەوەش کاك سەلاح چاکی کردوە ئەو مەسەلەیەی ورووژاندووە ، چۆن ئەمرۆ ئەم لێك ترازانەی ئەندامەکانی نێو هەر خێزانێکی گرتووتەوە

ئەوەتە پەڕیوەتە نێو خزمو کەسیش ! ئەو برایەی تائێستا هیچ برایەتیەکی بەرامبەریان نەنواندووە . دەبیٚ چاوە ڕیٚ بکریٚ ، تا دێت ئەوسا مەیت بنێژریٚ . بەم شەوەش تا دەگات دە بیٚ کورە ئێشك بە دیار جەنازەوە بگریٚ . بیٚ ئەوەی خزمو کەس (بە پیٚی چیرۆکەکە) کەسیان زەحمەتی ئەوە بکێشن شەو ئێشکی لە گەڵ بگرن ! ! کورەش زۆر بە ترسو بێزاری‌یەوە ڕقی لە مامو خزمەکانی دەبێتەوەو لە جەنازەی باوکیشی دە ترسیٚ ، ئەو ترسە هۆیەکی تریشی هەیە . ئەویش ئەوەیە کورە لە منداڵی‌یەوە دڵو مێشکی پڕ ترس کراوە . بە باسی مردنو گۆڕستانو ڕوحکێشانو ئەجندە !

لێرەش کاك سەلاح پەنجە بۆ هەڵەیەکی گەورەی پەروەردەکردن ڕادەکێشی . کەدایك و باوكو کۆمەڵ لە خۆڕا دڵی منداڵەکانیان هەر لە منداڵی‌یەوە ترس ئاژن دەکەن ، کورەش بەم نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەی سەردەمی منداڵیو بەم هەموو ناکۆکیو ڕقەی ئێستای . بیر لە شەوی ئێشك گرتن دەکاتەوەو دەکەوێتە هێنانو بردن ! هەتا دیٚ ڕقەکەی لە خزمەکانی ئەستوور تر دە بیٚ چۆن کە (مرۆڤ کە لیٚی قەوما خزمو دۆستی دێنە برانیٚ) ل ١٢٤ کوێخا سێوی[٤] کورە نە پێش نەخۆشیو نە لەوەختی نەخۆشی‌یەکەی باوکیو نە ئێستاش ، هیچ چاکەیەك لە خزمەکانیو مامی نابێنی ، بۆیە زۆری لە بار گرانە ، ئەو ئێشك بە دیار جەنازەی باوکی‌یەوە بگریٚ هەتا مامی دێت ! ! هەتا پتر بیر لیٚ دەکاتەوە ڕقەکەی ئەستوور تر دەبیٚ .

ئەوە هەر پاڵەوانی (تەرم) نیە ڕقی لە خزمەکانی دەبێتەوە ، ئەوەتە هێمنی شاعیر لە ترسی خزمی خوێریو ولاتەکەی بەجیٚ دێڵیو بە پیٚیان نەك بە سواری ماینی گویٚ لەق هەڵدیو هاوار دەکاو دەڵیٚ :

من لە داخی خزمی خوێریو ئاشنای ئەحمەق هەلاتم[٥] !

ئەم ڕقو بێزاری‌یە هەر تەنیا لە خزمو ئاشنایان نیە ، ئەوەتە جارێکی تر لە چیرۆکی (ڕق) پەڕیوەتەوە نێو ئەندامانی خێزانێك ، چۆن پاڵەوان لەو دیوی دەرگا گوێی لیٚیە لە نێوان خۆیان چی پیٚ دەڵێنو چۆنی باس دەکەن . ئەویش لە داخان بێزارو تورەتر دەبیو دەیەویٚ تۆڵەیان لیٚ بکاتەوە . تۆڵەش بە لای ئەو هەر بەو شێوەیە دەکرێتەوە کە وەکو ئەوانی لیٚ بیٚ ! یان ڕاستر ناتوانی وەکو ئەوانی لیٚ نەیەت .

دەڵیٚ : (منیش نا توانم نەبم بە جانەوەر بەکرم . . بە دار بە

بەرد . . بە دز بە درۆزنو تاوانبار . . منیش کرم . . مێشم . . مارم . . دوو پشکم ، جەردەم . . دڕندەشم . . دەبێ هەمیشە . . تاماوم بە گژ ئەوانی دی دابچم . . خەڵکیش چی دەڵێ با بڵێ گرنگ نی یە . . چونکە من ئەوەم مەبەستە وەکو ئەوانم لێ بێ . . من ئەوەم مەبەستە بگەم بە ئامانج . . تەنیا ئەوەم مەبەستەو بەس بۆ نا ئەی ئەوانیش وانین .) ل ۹۲ . بەڵێ ئەمانیش وان ! یان ڕاست تر وایان لێ هاتووە ، لە نێو کۆمەڵێك کە لە هەموو ڕوویێکەوە شیرازەی لێك دەترازێ ، کەسانی سادەو بەرگە نەگرو پشتی کورت زوو دەگەڵ ڕەوێ دەکەون ، پێیان وایە بەم جۆرە دەگەن بە ئامانج ! !

ئەگەر کەسەکانی تا ئێستا باسمان کردن لە خزمو کەسی خۆیان بێزار بوون ، ئێستا کابرای دەمامك لەوانیشو لە دەورو بەریش بێزارە ، نایەوێ ڕووی ببینن ! ! چۆن ڕووی بە هۆی هەندێ وردە ئاسنو شوشە لە بزربوونێکی دوومانگی گۆڕاوەو ڕووی بازاڕی پێوە نەماوە . دەورو بەریش ئاقلیان لە چاویانەو ڕووی دەرەوەیان مەبەستە چونکە (دیوی دەرەوەو دیوی ناوەوە بونەتە دوو شتی دژ بە یەك یەکتر ناگرنەوە ، یەکتر ناگرنەوە تا ڕۆژگارو خەڵکەکەی وابمێننەوە .) ل ١٦٥ ئیتر تا خەڵكو ڕۆژگاریش دەگۆڕێن ، ناچارە لەو ڕۆژگارە بژی (کە بەهێز لەم دنیایە دەژی ، بێ هێزیش هەمیشە بەزیوە . . مردووە . . تێ هەڵدراوە .) ل ۱۷۸ چۆن ئەوەتە بە هێزو پارە هەموو شتێك دەکرێ ! ! ئەوە ژنەی (چەند تابلۆیەك) حەفت ساڵە لەگەڵ مێردەکەی لێك دابڕاون ، ئەویش بە بێ کەسی منداڵەکەی بەخێو کردووە ، ئێستاش کار گەیوەتە دادگاو هەرەشەی ئەوەی لێ‌کراوە منداڵەکەی لێ بستێننەوە ، چونکە (بە پارە هەموو شتێ دەکرێ !) .

ئەم ترسو دڵە کوتێیە لە دڵی هەموو پاڵەوانەکاندا هەیە ، هەر یەکەو بە هۆیەك . پاڵەوانی (نهێنی) یش براو خزمو کەسو دکتۆریش تێی ناگەن ، هەرچەندە دەشڵێن : (تووشی نە درکاندنی حەزەکانی هاتووەو نهێنی‌یەك سەری لێ شێواندوە ، لە منداڵی‌یەوە هەر کە ویستویەتی شتێ بڵێ دەم کوت کراوە ، بۆیە هەنووکەش وا دەزانێ ئەگەر نهێنی‌یەکەی بدرکێنی لە دەمی دەدەنەوە .) ل ۱۳۱

ئەمەش دەزانن ، بەڵام ناتوانن چارە سەری بۆ بدۆزنەوە شتێك بکەن بە دڵی ئەو نەخۆشە بێ . دیارە نەخۆش بە پێی تێڕوانینی خەڵکەکە ! دەنا ئەو خۆی بە نەخۆشو شێت نازانێ ، بە پێچەوانەوە ، ئەو خۆی بە دکتۆر تێ دەگاو دەورو بەرەکەی بە نەخۆشو شێت . ئەم نەگونجانو لێك ترازانەی لەگەڵ خێزانو کۆمەڵ بە هۆی خۆشەویستی‌یەکەوەیە ، کە ئەوەی ئەو خۆشی دەوێ دەوروبەر ڕەتی دەکاتەوە ، ئەویش شڵکە داری نێوان دوو جەمسەری دژ بە یەکە ، نە دەتوانی بە دڵی خەڵکەکە ڕقی لە خۆشەویستەکەی ببێتەوە ، نە دەشتوانی وەکو خۆی خۆشی‌دەوێ بیکاتە ڕاستیو بیخوازێ . ئەم نە گونجانەی بە سەر دا شکاوەتەوەو بە چاوی خەڵکە ڕەمەکیەکە شێتو نەخۆشە ، ئەویش ئەوە ناسەڵمێنیو ناشتوانی بێ بەوەی خۆی دەیەوێ ! ئیتر هەتا دێ لە ناخی خۆیو خەڵکەکە دوور دەکەوێتەوەو لەگەڵ هەر دوو لا لێك دەترازێ !

* * *

کاك سەلاح چیروکەکانی لە کێشەی کۆمەڵایەتی دەدوێنو باسی ئەندامەکانی خێزان دەکەن ، ژنو مێرد ، باوكو کوڕ ، خوشكو برا نا تەبانەو یارمەتی یەکدی نادەنو تێك ناگەن ! !

کۆمەڵی ئێمە وا ڕاهاتووە حەز بە ئاوەدانی خێزانو هاتوو چۆی خزمایەتیو تێکەڵاوی گەرمو گوڕ دەکەن . ئێستاش ئەو واقیعەی چیرۆك نووس دەیبینێ و لە نێو ئەدەبەکەی ڕەنگی داوەتەوە وەك بیلخانۆفیش دەڵێ : (ئەدەبو هونەر ئاوێنەی باری کۆمەلایەتی‌یە .) ل۷[٦] ژیانێکی ترەو تامو خێزانو خزمو کەس لەگەڵ یەك ناکۆكو لێك دوورن . بە کورتی ئەو کۆمەڵەی کاك سەلاح دەیبینێ ! گۆڕاوەو گۆڕانێکی بە لێك ترازان ! ! ئەو لێك ترازانەش هەر ئەندامەکانی کۆمەڵی نەگرتووتەوە ، بەڵکە دەروونو روحی تاکیشی لێك ترازاندوە ، کاك سەلاح

هەر چەندە چیرۆکەکانی باسی لەم کێشانە دەکەن ، لە لێکدانەوەی مەبەستی لێك ترازانیش کە ناوێکی تایبەتە بۆ کۆمەڵە چیرۆکەکە هەر ئەوە دەنووسێ : (مەبەست لە لێك ترازان ، لێك ترازانی چەند قەوارەیەکی ئەندازەیی نی یە ، بەڵکو مەبەست لە لێك ترازانی هەڵس و کەوت و ژیانە ، تاك و کۆمەڵە مرۆڤ لە دەورو بەرەکەی هەر شتێ پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەبێ هەتا ڕۆحیشی .) ل ١٨٠

بە ڕاستی ژیان زۆر بە زەحمەت دەکەوێ . وەختێ پیاو هەست بە نامۆیی و لێك ترازان بکا ! ! بەرامبەر بە هەر شتێك کە پەیوەندی بەوەوە هەبێ . چ لەوە ناخۆشترە خێزان ناکۆك و ناتەبابێ ، کوردیش لە مێژە گوتویە : نە پێلاوی تەنگ . نە خانەی بە جەنگ . ئەوەتە بەشی زۆری کەسەکانی نێو ئەم نۆ چیرۆکە ، کەسی بە دڵسۆزی خۆیان نازانن و کەسیش پشتیان ناگرێ ، تەنیا لە نێو خەمی خۆیان دەتوێنەوەو زۆرتر بەرەو تەنیایی دەچن و لەخۆیان و خەڵك دادە بڕێن و دە بنە کەرستەی لێك ترازان ! !

شێوە :

حەسەن سلێمان لە (ئازادی هونەرمەند) دەنووسێ : (لە کاری ڕەسەن و سەر کەوتوو . شتێك نیە ، پێی بگوترێ ناوەڕۆك ، شتێکیش شێوە .) ل١٢٣ [٧] ئەو هونەرمەندە هەر چەندە لەم قسەیە زیاتر مەبەستی لە هونەری تەشکیلی یە ، بەلام ، ئەو قسەیە ئەدەبیش دەگریتەوە . من ناتوانم شێوەو ناوەرۆکی چیروکەکانی کاك سەلاح لێك جیاوازکەمەوە . ئەوە هەیە دەتوانین بڵێین : شێوەی نووسینی کاك سەلاح لە نووسینی ئەم چیروکانە ، چ بە شێوەو چ بە ناوەڕۆك پشت بە دەروون ناسی و تەوژمی هۆش دە بەستێ . لە شێوەی تەوژمی هۆش زۆر نزیکی لێ بوونەتەوە ، بە ڕای من کاك سەلاح زۆرتر تەوەژمی هەستی ئازاد . لەگەڵ فلاش باك و مەنەلۆژی ناوەوە بە کاردێنێ . تایبەت مەندی یەکی لە چیرۆکەکانی کاك سەلاح هەیە . ئەوەیە کاك سەلاح لە سایەی ئەوە کە پشت بە زانستی دەروون دەبەستێ ، زۆر لێکدانەوەو ورد بوونەوەی هەیە پێش ڕووداو دەکەوێ . یان ڕاستتر ڕووداو هەن ڕوویان نەداوە ، بەلام لای کاك سەلاح ڕوو دەدەن و هەستیشیان پێ دەکات . ئەوەتە لە چیرۆکی تەرم . هەست پێ کردنەکەی لە باری ئاسایی ڕەت دەبێ و زیندو دەبێ بە مردوو مردووش زیندو دە بێتەوەو . ئەم پێش کارەسات کەوتن و لێکدانەوەی بە سەرهات و هۆ دۆزینەوەی پاڵەوانەکان . بویتە هۆی ئەوەی کەسەکان چاك بناسرێن و هۆی کارو بە سەر هاتەکانیان بزانرێ .

پاڵەوانەکانی کاك سەلاحیش وەکو (مۆلی بلۆمی جێمس جۆیس) [٨] لەژوورەوەن و لە سەر جێگا ڕاکشاون و خەیاڵ دەیانباتەوەو دەکەونە هێنان و بردنی بەسەر هاتەکانیان و ئارەزوو خەمە بزرەکانیان . لە پەنای تێك هەڵشێلانی کات و شوێنە جیا جیا کان .

کاك سەلاح لەم جۆرە نووسینە زۆر لە خۆکردنی و پێوە دیار نیە ، چۆن لە سایەی زمانێکی ڕەوان و زانیاری یەکی فرەوان لە بارەی ڕووداوو کەسەکانی نێو چیروکەکان ، خوێندەوار وا لێ دەکا بە دوای دا بچێ و بکەوێتە سەر مەرەق . حەز بکا تەواو بن و تەواویش نەبن . سەیر کە کچەی (کلۆڵ) شەو لە نێو جێگا ، چ دنیایەك دێنی و دەبا ! خوێندەوار چەند حەز دەکا هەڵسێ و بەرێ کەوێ ، کەچی پشی درێژانە ! ڕات دەگرێ و بۆت دەدوێ . دیسان لە چیرۆکی (سەفەر) تۆ لە کونی دەرگاوە سەیری ماڵەوە دەکەیت و دەکەویە دڵە کوتێ ، دوا جاریش نە دەچیتە ژوورەوەو نە دەشگەڕێیتەوە . لە هەگبەی پیاوێکی پیر چەند بە دەسەلاتانە . نێوانی دەرگاو سویچی کارەبا لێك دوور دەخاتەوەو درێژە بە کاتەکە دەدا . یەك لە نیشانەکانی چیرۆك نووسی سەرکەوتوو ئەوەیە . خوێندەوار بخاتە ئەوبارە دەروونی یەی کە خۆی دەیگاتێ .

* * *

نووسین جۆرە شەڕێکە ! زانایەکیش لە بارەی شەڕ گوتویە : «پێش ئەوەی شەڕ دەست پێ بکا زۆر جۆر نەخشە

دەکێشرێ . بەڵام کە شەڕ دەستی پێ کردو تەقە گەرم داهات . هەر تەنیا دەستو چاو ئیش دەکەن .) .

واتە لە نووسینیش هەر چەندە نەخشە بکێشی لە وەختی نووسین . زۆر شت دەگۆڕدرێو زیاد دەکرێو لا دە بردرێ . (جیمس جویس)یش وا ئامۆژگاری برادەرێکی چیرۆك نووسی خۆی دەکا : کە هەر لە هەوەڵەوە نەخشە بۆ هەموو شتێك نەکێشێ . چۆن زۆر شت لە وەختی نووسیندا بۆ خۆی دێ) ل ٢٥١-٢٥٢[٩]

جێمس جویس لەگەڵ ئەوەی خۆی بەکات ژمێرو ڕاستەو پلان نووسینەکانی خۆی دەنووسی . هێشتا دەڵێ : (هەموو شتێك بە نەخشە ناکرێ) چونکە زۆر نووسین هەیە . پێشتر کلیشەی بۆ دادەنرێ . بەڵام . زۆر شلو خاو پێیەوە دیارە ، لێرە دەگەینە ئەوە بڵێین : کە ناوەرۆكو شێوە پێکەوە دێن . ئەو قسەیەش چەند لەگەڵ ئەو شیعرەی گۆرانی نەمر ڕێك دەکەوێ کە گۆران لە نەهاتنی شێعریکی تر نووسی . گۆران خەیاڵێك مەستی کردبوو ، بەڵام بۆی نە دەخرایە ناو چوار چیوەی هەڵبەست ! واتە ناوەرۆك – بیرو فیکرەکە – هەبوو ، بەڵام هێشتا ، ئەم ناوەرۆكو بیرو خەیاڵە شێوەو چوار چیوەیەکی بۆ خۆی نەدۆزیبووە ، کە ئەوەش نیشانەی ئەوەیە ، لای گۆران بیر شێوە لەگەڵ خۆی دێنی : ئەگەر وا نە بوایە ، دە بوو گۆران ئەو شاعیرە بە توانایە . مادام فیکرەکە بە خەیاڵ مەستی کردبوو . دە بوو توانیباشی بیخاتە نێو چوار چێوەی هەڵبەستێك .

بەڵێ هەرچەندی کرد بۆی نەخرایە ناو چوار چێوەی هەڵبەستێك ، بەڵام . ئەم (هەر چەند کردن)ەش بە خۆرا نە چوو ! بوو بە وەسفی بارێکی دەروونی بۆ هەموو کەسێك :

هەر چەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم ، بۆم ناخرێتە ناو چوار چێوەی هەڵبەستم !)[١٠] ئەم بارە دەروونی‌یە هەموو کەس لە ژیان توشی دەبێ . بەڵام گۆرانە گرێی دڵی هەموانی کردەوە ، هەر ئەو هۆیەشە کە ئەو شیعرەی خستووتە سەر زاران .

ئەم لێك چواندنو پێك گرتنەی قسەی جیمس جۆیسو شیعری گۆرانم بۆ ئەوە هێناوە کە بڵێم : کاك سەلاح لە نووسینەکانی زۆر لە خۆناکاو شتەکان بەکاتو شوێنو ڕووداوو کەسەوە بە ڕوونی دە بینیو ئاگاداری هەڵسو کەوتیانە .

شێوەی دوانی کەسەکانی کاك سەلاح هێندە پێك دەچن هەر دەڵێی هەموویان یەك کەسن دەدوێن کەسەکەش کاك سەلاحی نووسەرە . د . هـ . لۆرنس دەڵێ : (نووسەر نەخۆشیەکانی خۆی لە نێو نووسینەکانی دا تۆ دەدا) ل٧٨[١١]

نەك هەر نەخۆشیەکانی بەڵکە هەموو حەزو بیر کردنەوەو ئارەزووە سەرکوت کراوەکانی نووسەر لەم جۆرە نووسینانەکە پشت بە دەروون زانی دەبەستێ جوان بە دەر دە کەوێ .

زۆر نووسین هەیە . هەر زوو بە کاغەزەکەوە وەدەنووسێنو ڕەق دەبنەوەو وشك هەڵدەگەڕێن . تامو ڕەنگو بۆنێکیان پێوە نامێنێ . یا . هەر لە هەوەڵەوە نەیان بووە . بەڵام نووسینەکانی کاك سەلاح وانین . چۆن ئەو کەسەکانی لە نێو کۆمەڵ هەڵدەبژێریو نموونەی کەم بابەت نین . تۆ لە هەر کۆڵانێك دا بڕۆیو چەند منداڵێك ببینی کە لەتەك پەنجەرەیەك یاری دەکەن ، یەکسەرەوات بە خەیاڵ دا دێ کە لە نێو ئەم ژوورە پیاوێکی نەخۆشو پەك کەوتە هەیەو دەناڵێنیو ورێنان دەکا ، چونکە ژنەکەی بە بەر چاوی‌یەوە بە پیاوی نازانیو لە بەزمو ڕەزمی خۆی ناکەوێ ! ئەوە هەر تەرمو جەنازەیەکیش ببێنی یەکسەر خەمی شەوو ئێشك گرتن داتدەگرێ . ئەم نموونەو بارە تایبەتی‌یانەی زۆرنو دەروونی خوێندەوار جێ ناهێڵن .

شتێکی تریش لە چیرۆکەکانی کاك سەلاح زۆر دوو بارە دەبنەوەو بەردەوام لە دەروونی نووسەرو کەسەکان دایە ، ئەویش مەسەلەی مردنە ! ئەو مردنەی لەوەتەی مرۆڤ چاوی هەستی کراوەتەوە ، دوو چاری بووە ، وەکو واقعێکی تاڵو ترسێك چووتە نێو دڵی . هەر ئەو مردنەش بووەتە مۆتەکەی سەرسنگی بیر کردنەوە و نووسینی کاك سەلاح ، بە جۆرێك

ئەگەر بە ژمارەو ڕێژەو وەری بگری وشەی (مردن) و (ترس) لە هەموو وشەیەك زیاتر لە نێو چیرۆکەکاندا دوو بارە بوونەتەوە. دیارە هەر ئەوەنیە باسی مردن دەکا بەڵکە گلگامش ئاسا بە دوای چارە سەری و ڕزگاربوونیش دا دەگەڕێ. بەڵام دوا جار (مەر)ی قەدەر (برك)ی ماندوو بوونەکەی دەخواو گمگمتر و هەموو مرۆڤێك و خوێندەوارێك هەناسە سارد دەکات

چەند تێبینی یەك:

ئەم نۆ چیرۆکەی کە ١٨٠ لاپەڕەی قەبارە ناوەندی پڕ کردووتەوە. دیارە بە دەر خستنی چەند کەمو کوڕی یەك لە ڕووی زمانو هونەری چیرۆك نووسینەوە. چ لە نرخی چیرۆکەکان کەم ناکاتەوە. چۆن ئەمڕۆ هەر کتێبێکی بیگری دەتوانی چەند کەمو کوڕتی یەکی تێدا بدۆزیتەوە.

کاك سەلاح کە لە چیرۆکەکانی زۆر پشت بە – لا وعی. دە بەستی. دیارە هەر بەو بێ ئاگای یەش هەندێك شتی وردی بە سەر دا تێپەڕیوە!

ڕشاد ڕشدی دەڵێ: (هەرگیز ماقوول نیەو ناکرێ نووسەر نە چیرۆکێکدا هەموو کەسەکانی بەیەك شێوە زمان بدوێنی. بە تایبەت ئەگەر ئەو زمانەی پێ ی دەنووسێ ئەو شێوە زمانە نەبێ کە پێ ی دەدوێ) ل ٨٠[١٢]

کەسەکانی کاك سەلاح هەموویان بە یەك جۆر دەدوێن. پیاو هیچ جیاوازی یەکی ئەوتۆ لە نیوان پاڵەوانەکانو چیرۆکڤان نابینێ. ئەوە نەك هەر بە یەك شێوە زمان دەدوێن، بەڵکە بە یەك ئاستی زانیاریش دەدوێن و بیر دەکەنەوە. واتە بەزانیاری نووسەر قسەدەکەن. ئەوە لە زۆری چیرۆکەکانو پاڵەوانەکاندا دیارە. بە بێ گوێی دانە پلەی خوێندەواری‌و شوێنو تەمەنو هەموویان بە چاوی دەروون ناسی تەماشای ڕووداوو کەسەکانی تر دەکەنو هۆی ڕووداوان دەدەۆزنەوە.

ئەوەتە پاڵەوانی تەرمو نێنیو ڕقو دەمامك بە کورتی هەر هەموویان ئەوەیان پێوە دیارە. بە ڕای من هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوەیەی کە کاك سەلاح چیرۆکەکانی پێ دەنووسێ. چۆن لەم جۆرە نووسینە پاڵەوان لەگەڵ ناخی خۆی دەدوێ یان گوێگر دە دوێنی لەوەش هەر چیرۆك نووسە لە سەر زمانی پاڵەوانو کەسەکان دەدوێ‌و کاتە لێك جیاکان تێك هەڵدەکێشی. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە زمانی نووسەر ببێتە زمانی هەموو ئەو کەسانەی لە چیرۆکەکەدا دە دوێندرێن.

خۆ ئەگەر لە بەر چەند هۆیەك بمانەوێ بەیەك شێوە زمان بنووسین. دەبێ بزانین چۆنی بە کار دێنین ئەمەش کارێکی نەکردەنی نیە! بەڵام. ئەوەی ناکرێ ئەوەیە کە نابێ یەك ئاستی زانینو بیرکردنەوە بدەینە هەر هەموو کەسەکانی نێو یەك چیرۆك.

کاك سەلاح لە چیرۆکی (سەفەر) دە نوسێ: (لەو ساوە لێیان دا براوی. چەند ساڵە. هەژدەیە. بیستە. پترە نازانم چەندە) ل١٤٧ دیسان لە لاپەڕە (١٤٤) دە نووسێ: (بە پێ ی ساڵ بێ. دەبێ ئێستا سەردار دووی ناوەندی نازداریش چواری ئامادەیی بێ) لە لاپەڕە (١٤٩) دە نووسێ: (تەمەنم پازدە ساڵی دە بوو. دە ساڵیشی هاتووتە سەرێ. ئەوا دەکا بیستو پێنج) واتە کوڕە تەمەنی بیستو پێنج ساڵە. سەرداریش کە دووی ناوەندی بێ بە پێ ی تەمەن دەکاتە ١٤ ساڵ. نازداریش چواری ئامادەیی بێ دەکاتە ١٦ ساڵ. ئەگەر دایکیان هەژدە ساڵ بێ لێ یان دابڕابێ. چۆن خوشكو براکەی تەمەنیان ١٤ و ١٦ ساڵە؟!

خوێندەوار ئاگادارە ئەم چیرۆکە لە (عشرون قصة کردیة) کراوە بە عەرەبی‌و لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش زۆر باسکراوە بەڵام، کەسیان هەستیان بە تێك نە کردنەوەی تەمەنی سەردارو نازدارو دابڕانی دایکیان نە کردووە. جا ئەگەر ڕاستە خوێندەوار هەستی پێ نەکا کارێکی ئاسایی یە.

کاك سەلاح لە لاپەڕە ٣٤ ی چیرۆکی تەرم پاش شەشەمین دێر زۆر کتوپڕو بێ هۆ دەچێتە سەر باسێکی تر. کە دەبوایە لە گەرمەی قسەکانی پێشوو شتێکی هاوبەش ببوایە هۆی بەبیر

هاتنەوەی ئێشك گرتنەكەی .

هەر لەم چیرۆكە دە نووسێ . (لەشی ڕەق و ڕەپ وەستاوو چاوی زەق و نەقوچاو ئارامم لە بەر دەبڕێ) ل٣١ هەروەها دەنووسێ (بەرامبەر دارەبازەیەكی مردوو هەڵگر) لە نێو دارەبازە ، مردوو هیچ جێگای دیار نابێ و دا دە پۆشرێ ، چۆن چاوی زەق دیار دەدا ؟ بەڵام ئەوە لە نێو هەستی كاكی چیرۆك نووس دیاری داوەو بەهەست دەیبینێ نەك بە چاو .

هەر لەم چیرۆكە كێشە لە سەر ئەوەیە كوڕە شەو بە تەنیا بە دیار (تەرم)ەوە ئێشك بگرێ ! ئەوەی لە كوردەواری باوە مردوو ئەگەر شەو مایەوەو نە نێژرا مەلاو قورئان خوێن شەو لە سەری دە خوێنن . كەسێك بە تەنیا نابێتە ئێشكگر ، مەگەر زۆر لە بارێكی تایبەت .

لەچیرۆكی (كلۆڵ) كچە سەری خۆی هەڵدەگری و خۆی دەرباز دەكا قەیناكا . بەڵام ئەم هەموو خۆش خەیاڵییە بۆچ ؟ ئەوا گوتمان لە سەر قسەی مام سۆفی و نامەی ئەودەیحەوێننەوە هەر نەیس . بەڵام كێ دەڵێ (محۆ) مارەی دەكا : (ئاخر ئەوان ڕەوەندن ! مەسەلەی كچێنی و شەرەف لە لایان زۆر گرنگە ، ئەو هەموو خۆ هەڵخەڵەتاندن و ساویلكەییە بۆچی ؟ ! خۆ ئێستا (بە قوولی بیر دەكاتەوە) ل٥٨ .

هەندێ وشە هەیە مانای ئیدیۆم دەدا ، نووسەر لە كاتی بەكار هێنانیدا دەبێ وریاو ورد بێ بێ و لە جێگای خۆی بەكاری بێنی .

كاك سەلاح لە چیرۆكی (ئەم و ئەو) لە سەر زاری كابرای نەخۆش و ژن خراپ دەنووسێ (خۆم دەزانم چۆنی بۆ تێ دەكۆشم) ل١٥ ، بۆ تێكۆشین لەم جێگایە نابێ ، چونكە (تێ كۆشین) لە كاتێكدا دە گوترێ . كە كەسێك لە خۆڕا بۆ یەكێك تێ بكۆشێ ، یان زۆری باوێتە سەر . چ لە كن كەسێك ! چ لە لایەن میری . شكاتی لێ بكا ! بەڵام لێرە چ پێویست بەوە ناكا بۆی تێ بكۆشێ و بڵێ بۆی (تێ دەكۆشم) چۆن هەرچی بڵێ . لەوە پتر ناڵێ كە بە بەر چاوییەوە . كوڕێك دێنتە ژوورەوە .

دیسان لە چیرۆكی (كلۆڵ) كچە دەڵێ (چاكم بۆ تێكۆشیوە) ل٦١ ، ئاوێ بێنە دەستان بشۆ ! كچە كە بێ بن كراوە تازە چی بۆ تێ دە كۆشی ؟ ! گوناه لەوە گەورەتر دەبێ كچێنی نە هێڵی و خۆشی لێ بە خاوەن نەكات ؟ !

دیسان لە لاپەرە (١٤) دە نووسێ (خواردنی لە دەم دەپەستام) لەلاپەرە (١٧٠)ش دەنووسێ (ئێواران خۆم خواردنی لە دەم دەپەستم) لە دەم پەستین بۆ ئەم شوێنانە بەكار نابێ ، یەكێ ئەگەر یەكێكی خۆش بووی و نانی دەرخوارد بدا ناڵێ نانی لە دەم دەپەستم ! !

هەندێ ڕستەی لاوازیش هەن كاك سەلاح دەیتوانی بە ئاسانی بیان گۆڕی و بە هێزو جوانتریان بكات ، بۆ نموونە .

- بێزت لە قسەكانی دەهاتەوە - ل ١٤٠
- كە وەكو وان بوم . گام بە پێوە قوت دەدا - ل ٩٧
- بە هاوینانیش كورتەكەكەی دا ناكەنێ قیر بووە - ل ٦٦
- بریا هەر منداڵ بمێننەوە - ل ٩١ -

**سەرچاوەكان :**


١ - لێك ترازان - چیرۆك - سەلاح عومەر لە چاپكراوەكانی ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان - ١٩٨٦ .
٢ - ئەمانە قسەی دكتۆرە نەوال سەعداوین . ئەكرا بگەڕێمەوە سەر كتێب و لاپەڕەكان . وەرگێڕانەكەش دەقاو دەق نیە .
٣ - تەنیایی - چیرۆك - شێرزاد حەسەن . بغداد ١٩٨٣ .
٤ - كوێخا سێوی - ڕۆمان عەزیزی مەلای ڕەش - هەولێر ١٩٨٦
٥ - تاریك و روون . شیعر هێمن
٦ - جورج بليخانوف - الفن والتصور المادى للتاريخ - ترجمة جورج طرابيشى - بيروت
٧ - حرية الفنان - حسن سليمان - بيروت ١٩٨٣
٨ - تيار الوعى في الرواية الحديثة - ترجمة و قدم له وعلق عليه - الدكتور محمود الربيعى - مصر
٩ - موسوعة جيمس جويس - دكتور طه محمود طه - كويت
١٠ - دیوانی گۆران - بەرگی یەكەم . محمدی مەلا كریم كۆی كردوونەوەو پێشەكی و پەراوێزی بۆ نووسیوە . بەغدا ١٩٨٠ .
١١ - خمسة مداخل الى النقد الادبى . ترجمة وتعليق . د . عناد غزوان اسماعيل و جعفر صادق الخليلى . بغداد
١٢ - القصة القصيرة - دراسة ومختارات . د . طاهر احمد مكى قاهرة ١٩٧٨

سالح محەممەد ئەمین
سلێمانی ١٥-١١ ٩٨٦

# لەبارەی بەرگی یەکەمی رۆمانی «شار»ەوە



دەرگای زۆربەی ماڵەکان بەو پەڕی ڕێزەوە ، بۆ «شار» واڵا بوونەوە ، تا بە هەموو گەورەیی‌و مەزنی‌یەوە لی‌یانەوە ئاو دیوببێ . بەو پی‌یە «شار» کە بەدەستی خاوەنەکەیەوە بۆ چەند ساڵێك دەچێ جەڕی بوو ، بە ئامانو زامان لە دەستی دەرباز نەدەبوو ، ئەوەتا هەر چۆنێك بوو فرتەی کرد ، ئاهێکی سەرفرازی هەڵکێشاو کەمێك حەوایەوە ، جا ئیتر بۆ هێجگاری حەسانەوە لە دەرگای چەند سەد ماڵێکی داو ئەوانیش بە بزەیەکی شادمانی‌یەوە . دەرگایان بۆ خستە سەرپشت‌و لە ئامێزیان گرت ، نەك وەك گەلاوێژ خان کە لە هەڵاتنی یەکەم کەرەتی مریەمدا واقیان وڕبمێنێ :

(بۆ بەیانی هەر هێندەی باوکی پی‌ی لەماڵ بردە دەر ،

ئەمیش بەهەڵە داوان بەرەو لای گەلاوێژ ملی نا . کە خۆی کرد بەماڵداو پێی نایە حەوشەکەوە . بەر لەهەر کەسێکی تر ئەوی بینی کەلەژێر دارتووەکەدا دانیشتبوو . سەری بەسەر کتێبێکدا شۆڕ کردبووەوەو دەیخوێندەوە . بەبینینی دڵی پڕ بوو لەگریان . بەراکردن بەرەو رووی چوو . ئەویش هەر زوو لەم بەئاگا هات‌و واقی ورما ، بەتایبەتی کە ئەم چوو لەبەر دەمیدا بەچۆکدا هات ، سەری ئاخنی‌یە کۆشی‌یەوەو بە کوڵ دەستی کردە گریان ! . .)(۱)

خۆ «شار»یش وەك مریەمی بەسەر نەهاتبوو ، بەڵکو ئەم دەیزانی کە دەربازبوونەکەی یەکجاری‌یەو ، تازە ئەو رۆژگارە رۆیشت کە تیایاندا گیری خواردبوو .

دانیشتوانی ماڵەکان بەپەرۆشەوە گوێیان بۆ بەسەرهاتەکانی «شار» شل کردو شەونخونیان بەدیاری‌یەوە کێشا . . لەگەرمەی ئەو بەسەرهاتانەدا ، ئەوانەی کە ئاگاداری گەلێك باس‌و خواسی ترن قسەی رۆمان نووسێکیان بەبیر دەهاتەوە کە دەڵێ :

(- رۆمانی ئایندەم کتێبێکی راستەقینە دەبێ ، هەر لە رووی شێوازەوە نەبێ پێوەندی بەئەدەبەوە نابێ ، خۆکەسەکانی ئەوە لەژیانی راستەقینەوە هەڵیان دەبژێرم . ئەوانەی کە هەموو کەسێك دەتوانێ بیانبینێ‌و لە شەقامەکاندا سڵاویان لێ بکات . چونکە پاش خوێندنەوەی کتێبەکە دەیان ناسێتەوە . بەڵکو من جاروبار بیر لەوەش دەکەمەوە کە ناو نیشان‌و ژمارەی تەلەفوونەکا نیشیان بدەم .)(۲) . . ئەویش لەبەر ئەوەیە کە هەندێك لەوانەی گوێیان بۆ «شار» هەڵخستوە . لەقسەو باسەکانیا بەرووی خۆیان دەدی‌یەوە . هەندێکیشیان تارمایی خۆیانیان تیادا بەدی دەکرد . وەچەی نوێش . هەیانە گەلێکی لەو باسانە لە ، باوك‌و براو مام‌و خاڵ‌و خزم‌و ناسیاوی . لە خۆیان گەورەتر بیستوە ، بۆیە قسەکانی «شار» یان بەلاوە سەیری‌یە ، کەچی واش هەموو فزەیان لە خۆیان بڕیوە . تا بەچاکی بچنە رۆژگاری ئەو دەمەوەو ، تامی ئەو هەڵس‌و کەوت‌و جۆری پێوەندی‌یەی لەوکاتەدا ، لە نێوان خەڵکەکەدا هەبووە بچێژن . . خۆ «شار»یش بە جۆرێك دەست بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکان دەکات . کە زۆر بەتوندی هەست‌و نەستی خەڵکەکە هەر لەسەرەتاوە بۆلای باسەکانی بەکێش بکات :

(لە ئێوارەی رۆژێك لە رۆژانی بەهاری ساڵی ۱۹٤۲دا ، زەلامێك بەخۆی‌و کەرێکەوە کە هەرچی شڕەو پڕەیەکی هەبوو لێی بارکردبوو ، لەبەر دەرگای کۆنە خانوویەکی گەرەکی سەرشەقامدا راوەستا . دەرگاکە . لەو کاتەوەی رۆژ دەبووەوە دەکرایەوە ، ئیتر هەتا دنیا تاریك دادەهاتەوە ، **داخستن‌و بگرە پێوە دانیشی** بۆ نەدەبوو . چونکە **ناو خانووەکە . پوورە هەنگێك بوو** بۆ خۆی‌و پێوەدان‌و **داخستنی دەرگاکە ، دەبووە** کارێکی بێهوودە . .)(۳)

هەر بەوەندە ، «شار» **کۆمەڵێك پرسیاری لە مێشکی خەڵکەکەدا** وروژاند : دەبێ ئەو کابرایە کێ بێ لە کوێوە هاتبێ ؟ بۆچی ئەم خانووەی هەڵبژاردبێ ؟ ئەی ئەو پوورە هەنگەی ناوەوە ، دەبێ کێ رێکخەریان بێ ؟ . . تابەرە بەرە ، وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دەستگیر دەبێ ، ئاشکرا دەبێ کە ئەو زەلامە «سابیر»ی ناوە ، لەگەڵ هاوری‌یەکی ، گوندەکەی خۆیان جێ دەهێڵن بە هیوای ئەوەی گوزەرانی شاریان خۆشتربێت ، کە چی ئەوەتا دوای حەڤدە ساڵ ، لەباری‌کەرێك شڕەوپڕە بەولاوە هیچی تر شك نابات‌و لە شاریش‌دا بۆتە پشیلەی چاو نەپشکوتو . هەژاری ئەم کون‌و ئەوکونی پێ دەکات . . خانووەکەش چەند خێزانێکی کوشتەی دەستی هەژاری گرتۆتە کۆش . پوورە هەنگ ئاسا بەیەك‌دا دێن‌و دەچن ، بێگومان پوورە هەنگ بێ ، دەبێ بەمەل‌و لەش قورس لە خۆی نەگری‌و رێخەرێکی دڵسۆزیشی هەبێ ، ئەوەتا «میمکە حەلیم» بۆتە «شاژنی» ئەو پوورەیەو ، هەر کە هەست بەگێلی‌و لەش قورسی «سابیر» دەکات ، دێتە سەری‌و بۆ کارکردن هانی دەدا . .

«شار» بەو جۆرە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە ، بەڵام

هەر لەهەمان کاتدا ، بەدەم‌گێڕانەوەی بەسەر هاتەکانەوە ، کۆمەڵە پرسیارێکی تر دێتە ئاراوە . بۆیە خەڵکەکە بە پەرۆشەوە بەدەم شەوگاری پایزەوە . لە «شار» بێزار نابن‌و بگرە خوا خوایانە هیچ شتێك پشت گوێ نەخرێ‌و «شار» هیچ لەیاد نەکات کە نەیگێڕێتەوە . .

لە بەشی یەکەمدا «شار» هەر لەرێی پوورە هەنگەکەی میمکە حەلیمەوە دەسنیشانی گەلێك دەردی کۆمەلایەتی ئەو سەردەمە دەکات . هەر لە هەمان کاتیشدا . ئەو پێوەندی‌یە پتەوە دیاری دەکات کە ئەوکاتە لە نێوان خەڵکی لە جۆری کەسانی ئەو ماڵەدا هەیە . ئەوەتا میمکە حەلیم مشووری «خاوەر»ی بێوەژن دەخوات کە بیکاتە هاوسەری «سابیر» . بۆ ئەوەش وا لەگەڵ سابیردا دەدوێ :

١ – دەگوێ بگرە . . من لەلای خۆمەوە بووکم بۆ دەستنیشان کردوویت‌و ئامادەی گواستنەوەیە . تۆیش ئیتر خۆت‌و چالاکی‌و گورج‌و گۆڵیت . لە ئیشکردن‌و پاشەکەوتکردنی پارەیەکی وەهادا کە بەزووترین کات کارەکەی پێ مەیسەر بکرێ .)(٤)

بەو پێ‌یە لەوەوە تێ‌دەگەین کە ئەوسا خەم خۆری لێ‌قەوماو هەبووە . ئافرەتێك کە بێوەژن بکەوتایە یەکێك هەبوە کە بۆی ببێتە هەمووکەسی . دایك . باوك . برا . . .

بەیەکگەیشتنی سابیرو خاوەر لەوماڵەدا دەبێتە هۆی هاتنە دونیای کچێکی جوانکیلە . کە ماڵیان لێ‌پڕ دەکات‌و پێ‌ی شاگەشکە دەبن . بەلام . دەردی نەزانین‌و نەبوونی پزیشك‌و داودەرمان وەك پێویست . کاری خۆیان دەکەن‌و دەبنە هۆی ئەوەی هەر لەگەڵ دەرەوشاندنەوەی ئەستێرەی مریەمدا . ئەوەکەی خاوەری دایکی ڕوو لە کزی بکات . ئیتر چەند ساڵێك دوای ئەوە . خاوەر بۆ دواجار چاولێك دەنێ . گوێ لێ‌گرانی «شار»یش . پێشوەخت . دەیان پرسیاریان لێ‌قیت دەبوو . هەمووشی دەربارەی چۆنێتی ژیانی مریەم لەگەڵ ئەو باوکە گێل‌و نەمەل‌و نەوەزەلەدا . کەچی هەر زوو «شار» وەلامیان دەستگیر دەخات :

(میمکە لەو وەختەوەی تەرمی خاوەری تێدا ئاودیوی دەرگای حەوشەی مەملەکەتەکەی کرا . ئیتر نەیدەهێشت مریەمی بەسات لێ‌دووربکەوێتەوە . هەر بۆ رۆژی دواییش ، باسەکەی لەگەڵ باوکیدا بڕانەوە . .)(٥) . ئەگەرچی سەرەتا . گوێ لێ‌گرانی «شار» بەو کارەی میمکە حەلیم پشوویەکیان هات‌و ، کەمێك لە دوارۆژی مریەم دڵنیابوون ، کەچی دوای چەند ساڵێك لە بەخت‌و ناوچەوانی مریەم میمکەش خوا دەیباتەوە بۆ خۆی ، ئیتر بە مردنی ئەو نەك هەر سەر لەمریەم ، بەڵکو لە هەموو دانیشتوانی مەملەکەتەکە دەشێوی‌و هەموویان دوای ماوەیەك پەرش‌و بلاو دەبنەوە .

«شار» لێرەوە سەرەداوی باسەکە بەمریەم‌و باوکی‌یەوە دەبەستێتەوە . وەك کۆلارەیەك بەدەستی‌یەوە دەگرێت‌و لەبەر ئەوان ناپەرژێتە سەر کەسەکانی تری ناو مەملەکەتەکە ، بەتایبەتی کە خانووەکە میری دەستی بەسەردا دەگرێ‌و دەیداتەوە بەخزمێکی میمکە حەلیم . کەکەس لە ژیانی میمکەدا نەدیوێتی‌و نەزانیویشێتی خزمی وای هەیە . کەچی ئەوەتا دوای یەکەم سەردانی کە لەوێ لێ‌ی رادەپەڕن‌و . وەك دەڵێن «سەگی پێوە دەنێن» ئەویش :

(کابرا خۆی ئیتر بیرای بیر حاوی بە چاوی چ کەسێکی تری ناو مەملەکەتەکە نەکەوتەوە . چوو بەهۆی پارێزەرێکەوە ، رێگای دادگای گرتە بەرو سێ‌مانگی پێ‌نەچوو ، نەك هەر بریاری بۆدرا ، بەڵکوو گەیشتە ئەوەی پۆلیس بێنە گیانیان‌و داوای چۆڵکردنی خانووەکەیان لێ‌بکەن . ئەمان بروایان هەر نەدەکردو نەدەکرد ! . تا کاتێ داواکردن بووە هەرەشەی فڕێدانە دەرەوەی کەل‌وپەلەکانیان . ناچاربەرودوا کەوتنە چۆڵ کردنی . . .)(٦)

بەر لەوەی «شار» لەبەشی یەکەمی باسەکەی ببێتەوە ، ئێمەش گوێ لێ‌گرانی هەستمان کرد کە ئەو لەپاڵ هەژاری‌و بێ‌کاری‌و نەدارایی زۆربەی دانیشتوانی خەڵکی ئەوسای

شاردا ، پەنجە بۆ کێشەیەکی گەورەو ئاڵۆز درێژ دەکاتو ، بە دوو جۆر باسی لێوە دەکات . یەکەمیان ئافرەت لای کەسانی وەك سابیری حەماڵو دەروێش کەریم . هەروەك هەموو کەلوپەلێکی تر ، سەوای لەسەر دەکرێ . ئەوەتا سابیری حەماڵ ، مریەم بە دەروێش کەریم دەفرۆشێ بە (٥٠)دینار ، ئەویش دوای مشتومڕێکی زۆر ، کە لە (١٠٠) دینارەوە دێتە سەر (٥٠) دینارەکە ، بێ‌گوێدانە هیچ شتێکی تری وەك تەمەن یان قایل بوونو قایل نەبوونی کچە ، تا ئەو کارە دەگاتە ئەوەی کە شەوی بووکێنیو زاوایەتی ئەو دوو مرۆڤە ، لووتکەی کارەساتو بەسەر هاتەکانی بەشی یەکەم بێ ، ئەو شەوی بەیەك گەیشتنە بە جۆرێك پەردەی مێشکی گوێ لێ‌گرانی «شار»ی رووشاندوە ، کە ئەگەر هەموو شتەکانی تریان لە بیربچێتەوە ، ئەوا ئەو شەوەو دیمەنە سامناکە جەرگ بڕەکەیان هەرگیز لەبیر ناچێتەوە : (ئەم سەرنجێکی خێرای دایە . کە هیچ نیشانەیەکی سەرنج ڕاکێشی پێوە بەدی نەکرد . بە دڵنیایی‌یەوە هەڵساو چوو . کە هەنگاوی نایە ناو ژوورەکەوەو هەڵیڕوانی . دڵنیایی‌یەکەی لێ‌بووە ، واقوڕمانێکی پڕ لەترسو سام ! . سەیری کرد ژوور تێك شێوێنراوەو مریەم دیارنی‌یە ! . کاتێ باشتر چاوی گێڕاو ورد بووەوە . دیمەنێکی وەهای کەوتە بەرچاو کە هێندەی‌تر حەپەساندی . لە سووچی لای‌ڕاستی بنەوەدا ، ژوورێکی‌تری گچکەلە ، بەکەلوپەلەکان دروست‌کرابوو . سنووقە دوڵدوڵی‌یەکە ، کرابوو بە دیواری لای چەپی . هەردوو دیواری سووچەکە . بوو بوون بە دیواری پشتەوەو لای ڕاستی . هەرچی نوێنو بوخچەی جلو بەرگ هەبوو ، بۆی کرابوو بە دیواری چوارەمو دەلاقەیەکی وەك دەرگای ، تێدا هێڵرا بووەوە . هەرروو تێگەیشت مەسەلەچی‌یە . بەرەو ڕوو قەڵەمبازی داو پێشەکی ، بە پەشۆکاوی‌یەوە سەرنجێکی خێرای دایە ناوەوەی . بەو سەرنجە خێرایە ، سەرو ڕوخساری مریەمی لە ژێر پۆپە شمینێکەوە کەوتە بەرچاو کە بێ ورتەو جوولە ڕاکشابوو ! . بە پەلە خۆی گەیاندێو پۆپەشمینەکەی لەسەر لادا . بەڵام چی‌ببینێ ؟ ! جەستەیەکی لەناو قەدەوە بۆ بەرەو خوار خەڵتانی خوێنو ، وەك مردووی بێ‌جوولە دەم ئاخنراوو شەتەك دراو .

هەردوو دەست بەستراوو جەڕێنراو
لە پشتەوە ! . بەبینینی دیمەنەکە هەر تەواو زارەتەرەك بوو . لەو ساتەدا گومانی نەبوو کە کاکی گیانی لەبەر بڕیوە . بێ ئەوەی دەستی تێوە بدا ، پاشەو پاش کشایەوە . . .)[٧]

بەو جۆرە «شار» بەو باسەی وەك بەردێکی زبر بە دڵی گوێ لێ‌گرەکانیا بێنێو بەشێوەیەکی وا بیانڕوشێنێ کە هەموو بە دەموچاوێکی گرژەوە . بیریان لە بەناو خۆشترین شەوی ژیانی دوو مرۆڤ کردەوە . لەگەڵ ئەوەی مرۆڤی ئەو سەردەمە . هەمووی هەروانەبووەو ئەو کردارە نامرۆڤایەتی‌یە . مەگەر هەر لەکەسێکی وەك دەروێش کەریم وەشابێتەوە . بێگومان ئێستاش وێنەیان «ئەگەر چی کەمترە» بەڵام هەرماوە . بۆیە کێشەی ئافرەتانی چارە ڕەشی وەك مریەمیش هێشتا هەر لە ئارادایە . .

«شار» لەوبەسەر هاتەدا بەئاشکرا ئەوەی بۆ دیاری کردوین کە پیاوی چڵێسی وەك دەروێش . کۆمەڵگای دواکەوتووی چاونەکراوە ، بە پیت‌ترین زەمینەیانە . . ڕەنگە هەبێ بڵێ : لە هەموو سەردەمو وولاتێك‌دا مرۆڤی وا هەر هەبووەو هەیە ، بۆیە نابێ ئەم دەروێش کەریمە بکرێتە نموونەی سەردەمەکەی . . ئەم قسەیە بەجێ‌یەو جێ‌ی خۆیەتی . بەڵام ئەگەر ئێستا بەراوردێك لەنێوان «شار»ی ئەوساو «شار»ی ئێستادا بکرێ . ئاشکرا دیارە کە لەوسەردەمەدا پیاوی وەك ئەو دەگمەن نەبووە ، بەڵکو ڕەنگە زۆربەی خەڵکی ئەوسا لەم نموونەیان بەرچاو کەوتبێ یان بیستبێ . بەڵام ئێستا بوونەتە دەگمەن . . چونکە خاوەنی ئەو جۆرە ڕەفتارانە ئاسایی نینو پێویستیان بە چارەسەر هەیە .

بۆ سەلماندنی ئەوەی کە لە کۆمەڵگای دواکەوتوودا ، ئافرەت کردنەوەی گرێ‌ی بەختی لەدەست خۆی‌دا نی‌یە ،

لەوانەیە یەکێك دەست بۆکردنەوەی ئەو گرێیە درێژ بکات ، زۆر لەبارو گونجاو بێت بۆ کچەکە ، کەچی لێی دەبێتە گرێ کوێرەو بە ئامانو زامان کردنەوەی نابێ ، بەڵام یەکێکی تر ، کە هیچ پێوەرێکی ژیرانە ، هاوسەنگ رایان ناگرێ ، هەر لەگەڵ دەست درێژکردنیا ، گرێ لەخۆیەوە دەبێتە قوڵفەو دەترازێ ، زۆر هۆ هەیە دەوریان لە قوڵفە کردنی گرێکەدا هەیە ، کە لێرەدا بواری دەستنیشان کردنیان نییە ، بۆیە هەر بەم نموونەیەی کە پەنجەی بۆ ئەوە درێژ کردوە ، دەبیرێنینەوە :

(شەوێك بوو لە شەوە بە ناوبانگەکانی «تەلاری غەدیر» . هەر «عەدلە» خۆی وای بۆ چوو بوو کە کچە مردنی مسۆگەرە ، چونکە لەوە بچوکترو لاواز ترە کە بەرگە بگرێ . ئەگەر ئافرەتانی تر بۆیان هەبێ رملٚ لێدەن یان بۆچوونی تایبەتی دابنێن ، ئەوا «عەدلە» بروای تەواوەتی هەبوو ، بەلایەوە وابوو ، کە هەر قسەکردنو ئامۆژگارییەك بە کچەکە بڵێ سوودی بۆی نابێ .)

(– لەژوورە نزیکەکەدا مامەوە ، هەر دیوارێکمان لە نێواندا بوو . بەسزمانە دەترسا . ووتم دەیکوژێ ، یان هەر ترس دەیکوژێ ، لە جارێك زیاتر بە خۆم ووت : «عەدلە» مەترسە ، پشت بە خوا ببەستەو خۆت بکە بە ژووردا ، کە کاتەکە بە سەرچوو نەم وێرا ، ئیتر هەر کە گوێم لەزریکەکە بوو ، ئەوەی کە لە ژێرەی پشیلەیەك دەچوو لەقەیەکی پیادرا بێ . ووتم : گیانی دەرچوو ، کوشتی ، بەڵام خوای گەورە یاریدەی داو رزگاری کرد ، کە چوومە ژوورەوە دەلەرزیو لە خوێنو فرمێسکی خۆیدا نوقوم ببوو ، پێدەکەنیو دەشگریا . لێم پرسی : هیچ بەڵات لێیەماڵ کاول ؟ وەڵامی دایەوەو ووتی : پورێ نازانم . .)[8]

«شار» دوای ئەوەی لە گێرانەوەی ئەو بەسەرهاتە جەرگ برە بۆوە ، ووچانێکی دا . ئەمجا کەوتەوە قسە ، تا لە پرێکا زەردەخەنەیەك هەموو رووی گرتەوە کە دەیووت :

(لە بەرەبەیاندا ،کاتێ کاکی تاقو توقی بەردایە ناو ماڵەکە ، ئاهێکی پێداهاتەوەو کەمێ دڵی حەوایەوە . کاك لەسەر پیشەی رۆژانەی . لەژوور بەدەرکەوتو چووە ناو حەوشەکە . ماوەیەك هاتو چوو . ئینجا لایدایە بەر بەلووعەکەو کەوتە دەسنوێژ گرتن .)[9] ! !*

«شار» بەو زەردەخەنەیەی غەفلەتی نووسەرەکەی ئاشکرا کرد ، چونکە دەیزانی کە دەروێش دوای ئەو شەوە ناهەموارە ، بەر لە دەسنوێژ گرتن کارێکی تر هەیە دەبێ بیکات ، کە ئەویش خۆ لە حەوزی مزگەوت هەڵکیشانە .

لە لایەکی تریشەوە «شار» بەم شێوەیە لە ئافرەتێکی تری خێزانێکی تر دەدوێ :

(گەلاوێژ لەو بابەتە مرۆڤە بوو کە هەرچییەکی لە دووتوێی کتێبدا دەربارەی زوڵمو زۆرو چەوساندنەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە دەخوێندەوە ، یا هەرچییەکی لە کۆبوونەوەکانیدا لەم رووەوە بۆ باس دەکرا ، بەر لە هەرشتێك لە ژیانی رۆژانەی خۆیدا جێبەجێی دەکردو بەدیی دەهێنا . . .)[10]

بەو پێیەی «شار» باسی دەکات ، لەو دەمەشدا ئافرەتی رۆشنبیر «نەك خوێندەوار» هەبوو ، کە لە کۆڕی تێکۆشانی ئەو کاتانەدا ، بەوپەری لە خۆبوردنەوە بەشداری کردوە ، ئەگەر چی وێنەیان ئەوسا کەم بووبێ ، بەڵام سەنگی تایبەتی خۆیان هەبووە . .

لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا . هەندێ کەس لەیەك رووەوە بەووردی سەیری ئافرەت دەکەن . ئەویش ئەو لایەنەیە کە «دەروێش کەریم»ی لە مەڕ «شار» هەوڵی بۆ دەدا ، ئیتر رووەکانی تری مرۆڤایەتی هیچ ، خۆ کاتێکیش ئەو دەروێشەو نموونەکانی وەك ئەو لەو رووەوە لە ئافرەتێك تێر دەبن ، ئەوسی هی تر دەیابنزوێنێ . . پیاوی ئەم کۆمەڵگایانە «عەلی وەردی» ووتەنی :

(کورانی عێراق لە رواڵەتدا دەکرێ بە «جێنمس ستیوارت» دابنرێن بەڵام وەك تر «حاجی علیوی» یەکن بۆ خۆیان . .)[11] . «شار»یش هەر وەك ئەو لە مەجی کاکی

ئەختەر دەدوێ : ( . . گرفتەکە لە وەدایە کە بۆ نموونە کاکم ، بەلایەوە دەشێ کە خۆی حەز لە دە خوشکی دە کەس بکاو پەیوەندی‌یان لەگەڵدا ببەستێ ، کەچی ئەگەر یەکێك حەز لە خوشکەکەی خۆی بکاو پەیوەندی‌ی لەگەڵیدا هەبێ ، دەبێتە کفری حەوت مەزەبو گۆشاو گۆش سەربڕینی ، بە ئەرکی پیرۆزی سەر شانی خۆی دەزانێو گوایە ، پێ‌ی شەرمەند دەبێ ! . . .)(١٢)

«شار» بۆ باس‌کردنو دەستنیشان کردنی کێشەکان بە گشتیو کێشەی ئافرەت بە تایبەتی ، پەلی گوێ لی‌گرانی دەگرێو ، لە دەرگای چەند ماڵێکەوە ، دەیانکات بە ناو ئەو خێزانانەدا ، لە باسەکەیەوە ، وای لێ تێ‌دەگەن کە : چارەنووسی ئافرەت لە هەموو خێزانێکدا بە ڕەفتاری پیاوەکانیانەوە بەندە ، نەك بە ڕەفتاری ئافرەتەکە خۆیەوە ، جا ئەگەر ئافرەتێك بەختەوەر بێتو لە ماڵی پیاو چاکێکی وەك «حاجی مەحموو»ی عەلاف‌دا بێت ، یان خوشکی یەکێکی وەك ئەورەحمان یان خورشیدو زۆراب بێت ، یان کچی وەستا تایەر بێت ، ئەوا مرۆڤ ئاسا دەژی . . خۆ چارە ڕەشەکانیشیان ئەوانەن کە لەگەڵ کەسانی وەك دەروێش کەریم یان زایەر یان مەجی یان . . دا لەبن بانێك‌دا بژی . . ئەگینا ئەگەر وا نەبێ ، ئەوەتا ئەختەر قوتابی‌یەو لە ڕیزی ڕۆشنبیرانیش دایەو کەچی ئەوە حاڵێتی بە دەست کاکە مەجی‌یەوە ، ڕاستە دەڵێن : ئەوە نی‌یە مل بۆ بڕیارە چەوتەکانی کاکی نادا ، ئەگەر وا نەبوایە ، لە وانەبوو بە هەموو قسەیەکی کاکی قایل بێ . ئەمە ڕاستە ، بەلام خۆ «مریەم» منداڵێکەو ئەو چاوکراوەیەش نی‌یە کەچی دواکات ، سەر پێچی لە چارەنووسەکەی خۆی دەکاتو پێ‌ی قایل نابێ ئەگەرچی ئەو سەر پێچی‌یە لە ئەنجامی ئەو ئازارە زۆرە دەروونیو جەستەیی‌یەوە هاتوە کە دەروێش پێ‌ی گەیاندوە ، بەلام هەر چۆنێك بێت ، هەر سەرپێچی‌یە .

ئەو پیلانەی کە زایەر لە ئەورەحمانی کردو بە گرتنی‌دا ، ئەویش لە ئەنجامی ئەوەی کە قایل نەبوون ئاسکۆڵی بدەنێو دایان بە ئەورەحمان ، ئەوەش کارێکی وایە کە هەر لە مرۆڤی خوێڕیو سووکو خۆفرۆشی وەك زایەری سیخور دەوەشێتەوە . بە هیوای ئەوە ئەورەحمان بە گرت‌دەدا کە گوایە ڕێ‌ی بە یەك‌گەیشتنی خۆیو ئاسکۆڵ خۆش کات . نازانێ بەوە قینی زیاتر لە ناخی ئاسکۆڵو کەسو کاری‌یەوە شین دەبێو زایەر گلاوتر دەبێ لایان .

«شار» کە باسی کەسانی وەك ، میمکە حەلیم ، حاجی مەحموودو خێزانەکەیو گەلاوێژی کچی ، ئەورەحمان ، خورشید ، حەمەشین ، زۆراب . نەوزاد ، وەستا تایەر ، ئەختەر ، فەرهاد ، دایکی نەوزادو . . ئەمانەی دەگێڕایەوە ، شادی لە ڕووی گوێ لی‌گرەکانیا دەنەخشاند . ئەوەش قسەی ڕۆمان نووسێکی دەهێنانەوە یاد کە دەڵێ : (زەوی بەشەو سەنگی لاشەی مردووەکان دەیسوورێنێ ، قورسایی زیندوەکانیش بە ڕۆژ دەیگێڕن ، بۆیە کاتێك مردوو زۆر دەبێ ، دەبێتە شەوێکی تاریكو نوتەكو هەرگیز ڕۆژ نابێتەوە . .)(١٣) . گوێ لی‌گرانی «شار» کە قسەکانیان دەبیست ، هەر بە تەواوەتی قسەکەی ڕۆمان نووسەکەیان دەسەلماند ، بۆیە لە ڕۆژ بوونەوەی ئەو شەوە دڵنیا بوون . خۆ هێنانەوەی تەرمەکەی شێخ مەحموودی نەمر ، تەواوی ئەو ڕاستی‌یە دەردەخات کە زیندوەکان زۆر لە مردووەکانی ئەو دەمە زیاترن :

(سەرجەم خەڵکی شار ، درێژایی ڕۆژێکی ڕەبەقیان ، لە چاوەڕوانکردندا بردبووە سەر . هەموو هەر لە بەیانی‌یەوە ، وایان لە دڵ گرتبوو کە تەرم لە نیوەڕۆدا دەگاتە جێو لە عەسردا ، بەرەو دوا مەڵبەندی بەرێ دەکرێ . کەچی نە نیوەڕۆ گەیشتو نە عەسرو نە سەر لە ئێوارەشو ئیتر ئەوە ، وای لێ کردبوون کە دەتووت بە سەر ئاگرەوەن .)(١٤)

«شار» لەگێڕانەوەی زانینی هەوالی کۆچی دوایی شێخ‌دا ، بە گوێ‌ی خەڵکەکەی‌دا دەدا ، کە ئەو کاتە دوو کۆمەڵی سەرەکی هەبوون ، ئەگەر جارو بار شیرو تیریشیان لە یەکتر

سوی بێ ، تەنیا بەوە بووە کە هەر لایەی پروپاگانتەو بۆچوونی خۆی ، لە بارەی کێشەکانی ئەو دەمەدا ، بە ناو خەڵکەکەدا بلاو کردۆتەوە ، کەچی لە کاتی پێویستدا ، بۆ ڕێکخستنی جەماوەرەکەو سەرکردایەتیان لە ڕۆژێکی وەك ئەو ڕۆژەی تەرمی شێخ دێتەوە ، دووانیان بە یەکتر دەگەنو ، بەقۆشمەیەتی‌یەوە ، وا لەگەڵ یەکتردا دەدوێن :

(— وەرە بزانم . . وەرە . . ئەمە ئەو ڕۆژەیە ، کە دەتوانم قورتمت بگرمو نەیەڵم فزە بکەیت .

ئەمیش پێکەنی‌و وتی :

— قەت نەتوانیوەو ناتوانیت .

— خۆ هیچ نەبێ ئەمڕۆ دەتوانم .

— چۆن ؟ ! . . ئادەی بزانم !

— تۆ جارێ پێم بڵێ : نیازی چیتان هەیە ؟ . . چی دەکەن ؟ .

— لەو بارەیەوە . هێشتا هیچم لەلا ڕوون نی‌یە . بەڵام ئەوەندە دەزانم کە ئامادەم . هەرچی‌یەك بۆ پێشوازی کردنی تەرمی شێخ بکرێ . بەپەرۆشەوە بەشداری‌ی تێدا بکەم .

— تۆ ؟ ! . . جا تۆ هەقت بەسەرشێخو تەرمی شێخەوە چی‌یە ؟ ! . ئەو شێخی ئێمە یەنەك هی تۆ . . پادشاو پێشەواو قارەمانی ئێمەیە نەك تۆ .

— نەخێر وانی‌یە . . هی هەموو کوردێکە .

— بۆچی تۆش کوردیت ؟ !

— بێگومان . . بگرە ئەگەر دوا ئەنجام لێك بدەینەوە ، من لەتۆ کوردتر دەردەچم چونکە دڵسۆزتر دەبم بۆ نەتەوەی کورد .

— ئاوا ! . . نەتەوەی کورد ! . . یانی کورد بووە بە «ئومە» ؟ !

هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین .) (١٥)

ئەو دووانە کە هەریەکەیان سەر بەیەکێك لەو دوو کۆمەڵەیە بوون . بەو شێوەیە لە ڕۆژی وادا هەموو شتێکیان کە لادەخستو هەریەکەیان لەلای خۆیەوە ، هەوڵی ئەوەی بوو ، کە بەجۆرێکی ڕێكوپێكو بەپێی فرمانی سەرەوەیان کار بکەنو خەڵکەکە ڕێك بخەن . . پەنجە درێژکردن بۆ ئەم بارە ، «شار»یش‌و گوێ لێ‌گرانیشی گەشکە دارکردبوو ، کە هەموو بۆ ئەوە ، ئاواتیان بەو ڕۆژە دەخواست .

لەو باس‌و خواسانەی کە «شار» گێڕایەوە ، کۆمەڵەکەی خولە پیزەبوو ، چونکە ئەویش کەم «شار»و بگرە هەموو وولاتی خەریك نەکردو ، بۆیە ئەو کەین‌و بەینە لەبیر «شار» نەچووبۆوە ، ئەگەرچی ئەم کۆمەڵە لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان شاخیان گرت‌و بەرووی میری ئەو سەردەمەدا هەڵپژان ، کەچی واش هیوایەکی لەدڵی خەڵکی شاردا شین کردبوو ، کە ئەویش توانای بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتە . . ئەو چەند کەسە بتوانن لەبەر خۆیان ئاوا بمێننەوە ، ئەی ئەگەر هێزێکی ڕێکخراو ناچاربکرێ ڕێ‌ی شاخ بگرێ ، بڵێ‌ی خۆیان بۆ نەگیرێ ؟ . . بەهەرحاڵ ئەو دەمە ، پرسیاری زۆری لەم بابەتە دەهاتە کایەوە . «شار»یش لەوەوە دەستپێ‌دەکات کە هەواڵی کوشتنی ئەو کۆمەڵە بلاودەبێتەوەو خەڵکەکە پێ‌ی دەزانێ .

سیخورەکان پێخۆشحاڵن بەو چارەنووسە ، چونکە هێزو توانای دەوڵەت بۆ خەڵکەکە دەسەلمێنێ . کەچی ئەوانەی «شار» وەك نموونە هەڵی بژاردوون . لە چایخانەداو لەسەر دۆمینە بەم شێوەیە لەوکێشەیە دەدوێن :

١ — ئاخۆ بزانە چ سێ چوار ڕێبوارێکی داماونو لەمان بوونەتە تاقەکەی خولەپیزە ! .

— یا لە خەڵکەکەیان دەکەنە ئەوان ! . .)

(یەکێك لە ناکاو ، لە نزیك ئەورەحمانەوە هەڵیدایەوو وتی :

— ئەرێ ئێوە وادیارە ، لە ناوبردنی ئەو تاقە جەردەو پیاو کوژەتان پێ ناخۆش بێ .)

(وەستا تەنیا وتی :

— ئەوە خولەی مام سادقە . . هەقت بەسەری‌یەوە نەبێ . من دەیناسم‌و دەزانم چی‌یەو چی‌نی‌یە ؟) (١٦)

لە دوایی‌دا ئاشکرا دەبێ کە خولەی مام سادق پیاوی میری‌یەو بۆ تاقیبی ئەوەرەحمان‌و برادەرەکانی هاتو چۆی چایخانەکەی وەستا تایەر دەکات . هەر لەو قسانەی سەرەوەوە دەردەکەوێ کە خەڵکی ، تاچ رادەیەك بێ بروان لە ئاستی میری‌دا ! !

خۆ کە «شار» بەسەر هاتی بەگژا چوونی دەرویش کەریم‌و وەستا تایەرو ، ئەمجا بریندار کردنی وەستاو ، دوای ئەویش ، ژیانەوەی دەماری پیاوەتی سابیری حەماڵ‌و شالاو بردنی بۆسەر دەرویش کەریم ، کە تا ئەو کاتە پڕ بە رۆح لێ‌ی دەترسا ، دەگێڕێتەوە ، گوێ لێ‌گرانی «شار» چیرۆکێکی تری خاوەنی «شار»یان بەبیر هاتەوە ، کە پاڵەوانی ئەویش وەك سابیری حەماڵ خۆی لەشەرو گیروگرفت دوور دەخاتەوەو نایەوێ خۆی لە هیچ شتێك‌دا هەڵقورتێنێ ، کەچی :

(ئەفەنی‌یە سکۆبەکە تامی تیانەهێشت . . شەق‌ومشتە کوڵەی وەهای ئەگەیانە حەمەی بەسزمان کە مەگەر تەنها لە فیلمی سینەمادا بینرابێ . .)

(ئەم لەلای خۆیەوە ، بەرامبەر بەم دیمەنە خۆی پێ‌نەگیرا . سەربادانی کەمتەرخەمی‌و زەردەخەنەی گاڵتە پێ‌هاتنی لە بیرچووەوەو لە ئاستی ئەم کارەساتە ستەم کارەدا ، بایەخێکی نەما . .)

(زۆر لەسەر خۆ هەڵسایە سەر پێ‌و رووی کردە ئەفەنی لاجانگ درێژ . لە ناکاوێکا ، هەتا هێزی تیابوو هەڵمەتی بردە سەری‌و کەوتە شڵپ‌و هوور لێ‌هەڵسانی . . ئەفەنی ناودەمی پڕ بوو لەخوێن . . ئەمیش دەلاقەیەك کەوتە سەری‌و خوێن چۆرراوگەی تێ‌بەست .)

( – سەیرە لە خووە تایبەتی‌یەکەی خۆت لات‌دا . . بۆ ؟ . .

ئەم جارە بەدەم قاقای پێکەنینەوە لەوەرامیا وتی :

– راست ئەکەی . . بەلام بۆ ؟ . . ئەوی راستی‌بێ خۆشم تێ‌ی ناگەم . . خۆ هەر لەبەر ئەوەشە کە تووشی ئەو خووە پووچە بێ مانایە بووم . .)[١٧]

«سابیری حەماڵ»یش کە «شار» باسی دەکرد ، پیاوێکی گەلحۆی لەش گرانی تەمەڵ‌و دوور لە هەمووشت ، ترسنۆك ، کە چی هەر کە وەستا تایەر بەخوێنەوە دەبینێ ، ترسەکەی دەرەوێتەوە هەڵمەت دەباتە سەر دەرویش‌و بە جۆرێك دەستی لێ‌دەکاتەوە ، کە خپ‌بێ‌وەهەتا هەتایە جارێکی تر سەر بڵند نەکاتەوە . ئەو سابیرەی کە لە رۆژێکی سەرماو سۆڵەی زستان‌دا ، لە ماڵەکەی دەردەکرێ‌و هیچ بەرهەڵستی‌یەك ناکات ، کە چی بەو کارەساتە جوولاو تۆڵەی خۆی مریەم‌و وەستا تایەری لێ‌کردەوە .

«شار» سەرماو سۆڵەی زستانانی خۆی لەیاد ناکات ، بۆیە باسی رۆژێکی شووم دەگێڕێتەوە کە وەستا تایەرو زۆراب ، خەریکن چاخانەکە دادەخەن ، کەچی «سابیری‌حەماڵ»بەدەم سەرمایەکی زۆرەوە پەنا دەباتە بەریان ، ئەویش لە دوای‌یدا ئاشکرا دەبێ ، کە لەسەر ئەوەی کرێ‌ی چەند مانگێکی لابووەو ، دەرویشیش لە رقی ئەوەی ، مریەمی رای‌کردووەو بۆی نادۆزرێتەوە ، دەمی خاوەن ماڵ چەور دەکات ، تا سابیر دەرپەڕێنێ ، بۆیە بەو دەمەو ئێوارە ساردو تووشی‌یە دەری دەکەن ، لەو دیمەنەدا رۆژگاری زستانانی سەهۆڵ بەندان‌و چلوورەی گوێسوانەکان دێنەوە یاد . . لە شوێنێکی‌تریش‌دا «شار» باسی لێ‌دەکاتەوە :

(دەرەوەی چاخانەکە سەرمایەکی ئەو تۆ بوو ، تفت هەڵبدایە بەحەواوە دەیبەست . شەوو رۆژێك بوو بەبێ بوار ، گا بەشەستەو گابەنمە ، ئاسمان بارانی دا دەرژان . ئینجا بەدوایدا کردی‌یە بەستەڵەکێکی وەها ، کە تەنانەت شەختەی سەر زەوی‌و چلوورەی گوێسوانەکان ، مەگەر لەسێ چوار سەعاتێکی نێوان چێشتەنگاوو نزیکی عەسردا ، تۆزێ روویان لە تواتەوە بکردایە .)[١٨]

کە «شار» لەبەسەر هاتەکانی خۆی دەبێتەوە ، وا هەست دەکرا کە هەندێ رووداوی گرنگی لەیاد کردبێ .

* لەم پەڕ تا ئەو پەڕی گێڕانەوەکەی «شار» ، ووشەی «ڕەشەبا» بەرگوێی کەس نەکەوت . خۆ کە ئەو لەگەرمەی گێڕانەوەدابوو ، پەنجەرەی ژوورەکە . بەدەم ڕەشەباوە ، ببوە «دەواری شر» . جا ئەگەر وای دابنێین کە «زەمهەریر»ەکە ئەویش دەگرێتەوە ، بێگومان ڕەشەبای «شار» هەر لەکاتی سەرماو سۆڵەدا هەڵ ناکات . بەڵکو هاوینانیش هەیەو تەپ و تۆزی زۆر بەسەر خەڵکدا دەپرژێنێ .

* «شار» ووریایانە ، ڕووداوە مێژووی‌یەکان بەدوای‌یەکدا دەگێڕێتەوە ، کوشتنی کۆمەڵەکەی خولەپیزە . هێنانەوەی تەرمەکەی شێخ ، لافاو . پێك هاتنی بەرەی یەكگرتوو . . کەچی هەر لەو ماوەیەی کە شار دیاری کردوە (١٩٤٢–١٩٥٨) کارەساتی تری گەورەی وەك گوللە باران کردنی چوار ئەفسەرەکەو هێنانەوەی تەرمەکانیان بۆ شارو خرۆشاندنی خەڵکەکەی

* . ئەو هەڵبژاردنانەی ، لەو دەمەدا بۆ دیاری کردنی «نوێنەرانی گەل» ساز دەکراو دەبووە هۆی تەقینەوەو خوێنیشان دانی‌وا ، کە تائیستاش هەندێك لەوانەی خۆیان لەودەمەدا مافی هەڵبژاردنیان هەبووە ، لووت‌ژەنینە ناهەموارەکانی میریان لەبیرە کە لەو هەڵبژاردنانەدا ڕووی دەدا .

* «شار» هیچ لای لەکەسانی قۆشمەو مەشرەف خۆشی وەك «مەلا سمایل»و «نجم الدین مەلا»و «ڕەشەی موختار»و : . نەکردۆتەوە ، کە هەریەکەیان بەشی ئەوەندەیان هەبوو ، لە بۆنەیەکدا وەك «گاڵتە» کردنێك بەرەفتارێکی یەکێك لە دامو دەزگاکانی میری ئەو دەمە ، بگێڕرایەتەوە . . یان هەڵوێستی شاعیرێکی نەترس کە لەساڵی (١٩٤٥)دا ڕووبەڕوو ، لە بۆنەیەکدا ، پەنجە بۆ ئەدمۆنز درێژ دەکاتو (بیستو حەوت ساڵە) کەی پێ دەڵێ ، کە ئەمیشیان دەکرا ببێتە قسەی یەکێك لە هەڵبژاردەکانی «شار» .

هەر ئەو باسە شتێکی بەبیر هێنامەوە کە بۆ ئەوە دەشێ لێرەدا بووترێ ، چونکە «شار» ئەوانەی کە کردوونی بە «چاکی» باسەکانی . هەر هەموویان نەترس و جەربەزەنو کۆ لە هیچ شتێك ناکەن . بە پیاوو ئافرەتەکانیشیانەوە . واتە کەسی‌وا لەو «چاك»انەدا نی‌یە کە لە ناخەوە حەزی پی‌یەتی‌و بەلام هۆیەك وای لی‌کردبێ کە هێجگار وەك نموونەی ئەوڕەحمانو خورشیدو . . . هتد نەبێ . . بۆیە ئەم بەسەر هاتە سەیرەم بەبیرهاتەوە .

ساڵەکانی دوای پەنجاو هەشت چەند وێنەکم بینی ، کە لە هەموویاندا یەکێکیان بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش کتێبی قوتابخانەی دابوە بەر چاوی کامێراکە . بێگومان وێنەکان لەشوێنێکی دوورە شار گیرابوون . کە دیار بوو ئەو کۆمەڵە بۆ مەبەستێکی تایبەتی ئەو شوێنە کەلایەیان هەڵبژاردبوو . لە بەشداریکیانم پرسی . ئەو برادەرە بۆ لە هەموو وێنەکانا ، تەنیا ئەو کتێبەکەی واگرتوە ؟ پی‌کەنی‌و لەوەلامدا ووتی : کەسمان کتێبمان پی‌نەبوو ئەو نەبێ . هەرکە کامێرا دەهاتە ئاراوە ، یەکسەر دەستی دەدایە کتێبەکەی‌و ئەمجا هاوبەشی وێنەکانی دەکرد ، کەیەکێکمان لێمان پرسی : بۆوا ؟ ووتی : زۆری ئەمانە ناسراون ئەمە دونیایە ئەگەر یەکێك لەو وێنانە دەستی میری کەوت ئەوا من بەوە خۆم دەپەڕێنمەوە کە گوایە لە «سەعی» کردن بووم .

ئەمە یەکێکە لەو بەدەیانو بگرە بەسەدان کەسانەی بە دڵ حەز بەبەشدار کردنی کۆمەڵە نیشتمانی‌یەکان دەکەن ، بەلام لەبەر هەر هۆیەك بێ . ڕەنگە زۆر نەوێرن خۆ لە هەموو شتێك بدەن . . بۆیە دەبوایە «شار» لە گێڕانەوەکانی‌دا لەو جۆرە کەسانەشی تی‌هەڵکێش بکردایە . چونکە «شار» ڕووداوی ڕاستی دەگێڕێتەوە . کەسانی واش لە دونیای «واقیع» داهەنو کەمیش نین .

* کۆ بوونەوەکانی چەقەلاواو قەشقۆلی‌و . . هتد ، کە بە ناو سەیران بوون ، بەلام ڕاستی‌یەکەی بۆنەی نیشتمانی بوون . . خۆ نموونەکانی خو لە جاسووس‌و زایەر لەو ڕۆژانەدا ، ئارامیان لی‌دەبڕاو ، بۆ دۆزینەوەی شوێنی بە ناو سەیرانەکان ، سەرە

خولیّ‌ی دونیایان پیّ دەکەوت‌و قاچیان توێخیی‌فڕیّ دەدا تا هەندیّ جار بە ئامانجەکەی خۆیان دەگەیشتن . . لە «شار»دا ئەم بە ناو سەیرانانە پشت گویّ خواوە ، کە وا بزانم هەموو ئەوانەی لەوە ماوە مێژووی‌یەی کە «شار» دیاری کردووە کاتێك یادی ئەو ڕۆژگارانە دەکەنەوە ، زۆرو کەم بەشێکی یادەکانیان بۆ ئەو بە ناو «سەیران»انە تەرخان دەکەن .

**دوا ووشە**

ڕۆمان ووردە کاری‌یەکی زۆری پیّ دەویّ «شار» لە کردنی بەسەر هاتەکەی‌دا بە ڕۆمان زەرەنگەری‌یەکی باشی تیادا کراوەو بۆتە هۆی ئەوەی کە ، کورد زومانیش هەست بە شادی‌یەکی خۆش بکات بەوەی کە ئەو هونەرەی ، بە قسەی زۆربەی زۆری ئەدیب‌و نووسەرانی دونیا لوتکەی ئەدەب‌و داهێنانە ، واتە ڕۆمان ، لای ئێمەش هەیەو لە تواناداپە پەرەی پیّ بدریّ‌و جیّ‌پیّ‌ی خۆی خۆش کات‌و هەنگاوی بەرەو پێشەوە بنیّ .

هەر ڕۆمانەو بەسەر هاتێك دەبێتە لووتکەی ، خۆ ئەگەر هەمووی لە یادی ئەو خەلکەدا جێگەی نەبێتەوە ، ئەوا ئەو بەسەر هاتە جێگا گونجاوی خۆی دەکاتەوەو تاماوەیەکی زۆر لەبیر ناچێتەوە . . «شار»یش لە هەر بەشێك‌دا لووتکەیەکی هەیە ، لە یەکەمیان‌دا بەستنەوەی مریەم بەدەست «دەروێش کەریم»و یەکەم شەوی بە ناو بوکێنی‌و زاوایەتیان ، ئەو بەسەرهاتەیە کە هەر چەند باسی زوڵم‌و ستەم کاری زۆرداری‌و چەوساندنەوە یا کرداری نامرۆڤایەتی بکریّ ، ئەوا ئەو دیمەنە وەك قارچکی بە هارێکی پڕ لە هەورە بروسکە هەڵدەتۆقیّ . . خۆ لە بەشی دووەمیش‌دا ڕۆژی هێنانەوەی تەرمەکەی شێخی نەمر ، لەوانەیە کە ، هەرچەند باسی یەکێتی‌و نەترسی‌و ئازایەتی کۆمەڵ‌و جەماوەر بکریّ ، ئەو ڕۆژە بێتە وەیاد . . ئەم دیمەنە یان لە ناو لووتکەکان‌دا (بە هەر دوو دیوەکەدا) واتە چاکەو وخراپە ، لە هەموویان بالاترە . چونکە کاتێك «شار» دەگاتە باسی ئەو ڕۆژە ، بەرابی فرمێسك لە چاوی گویّ لی‌گرانی‌دا ، بە دیار دەکەویّ . . لە بەشی سیّ‌یەمیش‌دا ، لافاوەکەو بەسەر هاتەکانی دوای ئەو سەرەکین . . خۆ کۆتایی ڕۆمانەکەش وەك دەست پیّ‌کردنەکەی سەرنج ڕاکێشە . چونکە بەشی زۆری کێشە سەرەکی‌یەکان بیّ چارەسەر مانەوتەوە ، تا لە بەرگەکانی داهاتووی «شار»دا کە ئەگەر ڕووناکی ببینن ، چاریان بۆ دابنریّ .

دوا کاتیش پێویستە دەست خۆشانە لە خاوەنی «شار» بکریّ‌و هیوای هێنانەدی ئاواتەکانی بۆ بخوازریّ ، بەڵکو لە بەرگەکانی تردا ، کە بێگومان ڕەنگە (ئاواتی سەرەکی) ئەوەبیّ ئەو بەرگانە ڕووناکی‌ببینن ، بتوانێت پێوەندی خەڵکی شار بە «شار»ەوە بە شێوەیەکی وا بەر جەستە بکات ، کە گویّ لی‌گرانی ئەو بەرگانەی تر لەوە بگەن کە «شار» بەلای خەڵکەکەیەوە چی دەگەیەنیّ‌و چۆن چۆنی ، لە هەموو هەڵس‌و کەوتێکیان‌دا بە شارەکەی خۆیانەوە بەستراونەتەوە . .


**سەرچاوەکان**

(١) – حسین عارف – شار – ل ٦٠
(٢) – کونستانتان جیورجیو – الساعة الخامسة والعشرون – روایه
(٣) – حسین عارف – شار – ل ٤
(٤) – هەمان سەرچاوە ل ٢٢
(٥) – هەمان سەرچاوە ل ٣٥
(٦) – هەمان سەرچاوە ل ٤٥
(٧) – هەمان سەرچاوە ل ٧٣
(٨) – عبدالرحمن منیف – مدن الملح – الاخدود – روایه
(٩) – شار ل ٧٦
(١٠) – شار ل ٤٨
(١١) – د . علی الوردی – لمحات اجتماعیة من تأریخ العراق الحدیث – الجزء الاول ص ٢٩٥
(١٢) – شار ل ١٩٣
(١٣) – لە ڕۆمانێك‌دا خوێندومەتەو کە بەداخەوە ئێستا ناوی نووسەرەکەیم لە یاد نی‌یە بەلام وەك ووتەیەکی جوان لای خۆم ئەو دەقەم نووسیوەتەو .
(١٤) – شار ل ٢١٥
(١٥) – شار ل ١١٦-١١٧
(١٦) – شار ل ١١٢
(١٧) – حسین عارف – کلافەیەك ژانی توورە – چیرۆکی خوویەکی پووچ – ل ٥٨-٥٩
(١٨) – شار ل ١٤٢

# هەڵوێستێك

فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی

هەولێر
١٩٨٤

دێت و ئەڵێ :
خۆشم ئەوێ
بە ئاسانی
لەلای خۆم دانی پیا ئەنێ . .
بە ئاسمانی ئەندێشەدا
باڵی خەیاڵت لێك ئەدەی
نەخشەی پاشەڕۆژ دائەنێ . .
منیش تەنیا
شیعرو چاوی تۆ شك ئەبەم
گیانە شیعریش
کراس نی یە لەبەری کەی . .

شیعر نابێتە زێڕو زیو
لە سنگ و بەرۆکی بدەی . .
ئەم جیهانە
بۆ مرۆڤی ویژدان زیندوو نەخولقاوە . .
شاعیر چی یە
با جیهانیش هەمووی پڕکا لە هۆنراوە ؟ ! . .
برۆ ببە بە هاوسەری
مرۆڤێکی ویژدان مردوو
ئەو ئەتوانێ
بتکاتە خانمی گەورەی
کۆشك و تەلاری ڕازاوە . .

# خاپینۆکا ڤین فرۆش

عەمەر حەیدەر بوتانی

٣-٤-١٩٨٦

ڤینا تە پیرهەڤیە دل کرۆتو نەهێلا
برۆهێن تە گیسنن شوڤا دلێ من کێلا
من نەزانی ڤینا تە چیەو چەوانە نازێ
غەزالێ تە رێکا من دا شکێرو ناڤ رێلا

* *

ئێك تەواف ، بەرسڤ ژی : قەنجی ژ کرمانجا ناهێ
ئێك ژڤان زێرەڤان بووم من زانی کو ئەو ناهێ
غەزالا ئەفسونەیی دڤێت من بخاپینی
ژ زەریا دویرکەڤم خودێ بێ تەمەت یاهێ

* * *

ئەڤ خومخوما ڤین فرۆش نەزانی ئەز هەژارم
ئەزم شەنگەستا ڤینێ دقەبم کەوێ پارم
ئەڤیندارم دسترم ، هۆزانڤانم ئەز دبێم
دروشما من ڤیانە ، نا بەردەم ئەمەکدارم

*

دیلان دەستێ نەزانا شێلی‌کر ڤینا پیرۆز
گاڤان سەرکێشی ڤیا دڤردە ووندابو سۆز
خاپینۆکا فندو ناز دێ کێ هی‌کەی ڤیانێ
من نەدیە پێکو مەی ئەز هەژارم خودان دۆز

هەژارین ئەڤیندارین تەڤ مریدێن سینەمێ
پارزونیکێ وێ ڤالایە ژ ئایەتۆکا خەمێ
لەو بێستون هاتە سمتن ، کێل ژ کەربا سنجری
چار مرید پەروانەنە دئەڤین وێ شەمێ

* * *

هەوارە چ ڤیانە ، هینە ئو باکوزیرکە
دل بکوزریت نەبێ تو خوە ژ پەلا دویرکە
دلی بکە جونیکێ یان باڤێ بەر دەستاری
ژ نانێ سێویارا بهێرە من باش هویرکە

* * *

سینەمێ ئەو رێ‌ڤینا تەیا پاقژو مەزن
هەزار خانی بۆ دژین دیسا لدویف دبەزن
سەخمەراتی ڤینا تەو کەوێن رۆژا وەلات
مرۆڤن ژ خوە ناگرن زمانێ خوە بگەزن

* * *

ل ئارامگەها ڤینێ ئەم دزانین کێزمەدار
ل سیپانێ د پشتا سیابەندی چوویە خار
نێرگز هەمی چرمسین د لاتا مان حێبەتی
ژبەر ڤێ ئێشێ خەجۆك سەودا نەما ئو بۆ هار

* *

رێڤینگێیت ڤیانێ خانی بۆ وان سازکر ڤین
دیسا فەرهادو مەمان ب خوینا خوە نڤێسین
ئەو ڤیانا خانی چاند ئیرۆ مە ژ وەرا شاند
پەلاتینك ل دۆر شەمان بۆ تیشکا پیرۆز گرین

*

کێشو سەروا بورجا وە زینا زێدان سینەمە
تم هۆزانڤانو پەیڤن رێچا دیوانەی خەمە
دکەربێت ڤان بەکرۆکان رووباردان مل تێك هوسین
لێ مەمۆیێ ئیرۆکە هێزو دەلیڤو دەمە . .

# سنووری خۆشەویستی!!

حەسیب قەرەداغی

١٩٨٦/١٢/٢٧

هاتم . ئەو نیازە سنووری خۆشەویستیت
دەست نیشان کەم
سنوور هێڵە یا بازنە بە ؟ . ئەمیش دنیای ماتریاڵە
ئەم دنیایەو هەرچی تیایە . .
لە گەردوونی جوانی تۆدا وەکوو خاڵێکی بێ باڵە

خۆشەویستی ی منیش بۆ تۆ لە جوانیتا خۆی بینیوە
کە رووم کردە چاوی شیعریش وەنەوزێکی گرتە خۆی و
ونی ئەم کالاّ نەخشینە ، منیش بۆ خۆم نەم چنیوە .

بۆیە دەڵێم: خۆم نازانم کە خۆم چەندم تۆ خۆش دەوێ
دەڵێن گوایا تۆ فەرمووتە : تا ئەو رادەی خۆم بمەوێ !

ئاخر رادەیش هەر سنوورە ، بۆ بەدرۆم دەخەیتەوە ؟
ئەینا دەبم بە حەلاج و دەڵێم : تۆ وای لە (ذات)م دا
ئەگەر دڵم نە دەیتەوە



درەختی باخی سینەتە ئەندێشەی من – سەرکوت دەبێ
یەخەی باخت نەکەیتەوە .

ویستیان نۆ پەند ئەم کێشەیە بدەن بە سەر هەر کێوێکا
کێو دانەوی ،
بوو بە کێڵگەو بانە زەوی !

هەر جەستەی من ئەو کێوەیە ئاگری تۆی لێ هەڵکرێ
دەستەچیلەی هەڵگیرساوی بدات بە گشت ئەوین دارێ
دەنگ‌وباسی مەشخەڵی تۆی لێوە بگاتە گشت شارێ .
زارم وەکوو داربەڕوویەك لەدوای بەهاری خۆش باران
شۆکەو گەزۆی لێ بباری .

من بۆ حەبدەی سەر لێوی تۆ هەزار ئایەت لەبەردەکەم
هەر بە نیگای سەرپێ‌یەك هەرار کولاە لەسەر دەکەم
کێ لە دەرگای دڵم دەدا من دڵی خۆم قەت داناخەم

جێ نەزەرگەی تەجەللاتە
بەیانیان تۆی لێ هەڵدێو ، ئێوارانیش رۆژاواتە
ئەی تیوری بەڵگە نەویست دروشمی سەر زاری منی
وەکوو راستی‌یەك سەلماوە . .
جوانی وەك تۆ یاری منی
ئەی یارەکەم من ئالاٌتم ، پیرەمەگروون ساری‌یەمە
پیرەمەگروون . . دڵدارەکان ، بەختی لە سەر دەگرنەوە
شیعری منیش ، نەخشەیەکە ئازادی‌خوا . . .
قەولی لە سەر دەبڕنەوە ،
هەژاری ئەم شارە خەمەیش کاتی ئازاری برسێتی
وەکوو نانی تازە تەنوور ، دەستی عەزرەت بۆ تۆ دەبەن
ئەو روانگەیت کە تەماشای گشت باوەڕو ئاینێکت
لێوە دەکەن
منیش کە دێم بۆ دەربارت بۆ یەك قومی خومار شکێن
(دێوانە)کان هەموو لەوێن
تومەز ئەوان لە مێژەوە مەستی شەرابەکەی شەوێن .

# دلێ من

**سەلمان کوڤلی**
**١٩٨٦/١٢/٢٣**

ئەڤرو . .
دلێ من
لو هەڤالینو
بلقەبلق و
هورمێنا پێلانە
کاغەزەکا گەهشتیە من
نە ئەدرەسە
نە نیشانە
جار دبێژم یارکەکا کەڤن
بیرا خو یا ئینایەڤە
هەما دەڤە !
جار دبێژم ئێکا فێلبازە
من دخاپینیت ،
کەسێ نەڤیایە کو شەڤە !
جار دبێژم . .
بو (زینێ) نابیت !
ناڤێ (مەمێ)
چەندجا یێ گوتی و ،
گوتیەڤە !
رێکا راستا ل‌من بەرزەبوی
ئو کاغەزا ئەڤینیێ‌یە
چ‌بکەم گەلوو . .
نە رۆژەکە
نە سالەکە
کارێ ئەڤ کالی رەڤە ! !

* * *

ئەڤرو . .
لو هەڤالینو
دلێ من . . پاییزە
هندی تێمە پەیڤێ . . درەڤیت
شەنگا دل‌مایە ،
یا زیزە
دبێژیتن هندە تۆلازا
بەرێ منێ دای حەنەکا
نە مالا من
نە بالا من
دبەنە گاخا ،
ئەڤیندارا
ئو چەلەکا
لەورا ئەزێ ،
کاغەزەکێ نڤێسم و
دیاری هنێرم بو کەکا
بەختێ وەمە . .

نه فروشن ب ئەرزانی
چاڤ بەلەکا

* * *

ئەڤرو . .
لو هەڤالینو
دلێ من . .
دبێ
سەد جا هانە
یارا من سێ کەزی دبەردان
مینا تیرەمارا دبەردان
هندە جارا دکرنە گەڕی
جارجارا دکرنە مژانە
میرێ چینێ
میرێ مسرێ
هەرۆ د خەونا خودا ددیتن
کاڕ کربو ئاخینكو تویتن
بچاڤێ سەرێخو نەددیتن
پەژیکەکا تالوقەبوی
نە نوژدارە
نە لوقانە
ڕوندکا ژێرا دبارینم
چەندی دبینم . .
هەستیخانە
هەستیخانە

* * *

ئەڤرو . .
دلێ من
لو هەڤالینو
د بێ . .
ئەڤینداری
ئەڤینداری
وەیلا تە ماڵك وێرانێ
چ دژواری
یارکا منا ژمن دلمایە
دبێژتە من . .
چەوا دنڤ ! ؟
چەوا دروینی ! ؟
چەوا دکەنی ! ؟
چەوا دچیتە خارێ پاری ؟ !
ما نزانیت . .
جارجا ڕوبادم بو دقەیم
جارجا دینم هەمی تەیم
جارجا ،
ژ بێ یاریو
ژ بێ زاری
سەد خوزیکا ژدل دراهێلم
خوزیا نەیم
لبەر بەژنو باڵا وێ نەیم
چ بکەم گەلو . .
زستانەکا ،
سارە
هارە
ئو یا لمن بویە نەچاری ! !
ئو یا لمن بویە نەچاری ! !

# سێ پارچە شیعر

مەدهۆش

## گوڵشەن

ئەو خۆشەویستە جوانو نازدارە
خۆشیو خۆێن گەرمی لەرویا دیارە
دڵسۆزی زۆرە ئەمجا نازانم
خۆی کێی خۆش ئەوێ ، لەکێ بێزارە

* * *

زۆر خۆشەویستی دۆستو یارانە
هاودەمی بەزمی دەردە دارانە
لەناو کۆمەڵا شۆێنی باڵایە

له ئیش و کارا کردو بزانه

* * *

ئەو دڵتەرانەی سەیری روی ئەکەن
ئەڵێن ئەکتەرە لەلای ئەهلی فەن
نابێ پیێ بڵێن تاقە گوڵێکە
کۆمەڵێ گوڵەو پیێ ئەڵێن «گوڵشەن»

* * *

کاتێ کە بەناز ئەتریقێتەوە
ئەو سەر کوڵانەی ئەگەشێتەوە
هەر خۆی ئەزانێ چۆن خۆی ئەنوێنێ
چۆن کۆمەڵە دڵ ئەپێچێتەوە

* * *

کەدەر ئەکەوێ دڵم پیێ شادە
کەدیاریش نەبێ هەر ئەو لە یادە
هەرچەن دڵداران بۆی بە پەرۆشن
ئەو کەسی بوێ و نەوێ ئازادە

* * *

چونکە ئەو جوانە پەسندی منە
دڵ وەکو بێژنگ بۆ ئەو کون کونە
دوربێ یانزیك هەر خۆشم ئەوێ
ئیتر نازانم دۆستە دوژمنە

* * *

بەڵام ئەزانم گەلێك زۆر زانە
بەدەم فریشتە ، بەدڵ شەیتانە
کام دڵی بوێ ئەیباو ئەیهێنێ
کەچی دڵی خۆی شوێنی پەنهانە

* * *

لەگەڵ ئەوەشا فیزی تیانیە
دوژمنایەتی کەسی لانیە
ناحەزی زۆرەو گوێشیان ناداتێ
چونکە خۆی قینی لەدڵا نیە

* * *

ئاواتە خوازم هەروا روی گەش بێ
ئەوەی کەخۆشی ناوێ بێ بەش بێ
بە ئارەزووی خۆی ناوی بەرزبێ
کەمێ روناکی چاوی ئێمەش بێ

# حەزئەکەم

حەز ئەکەم هەموو تەمەنم
لە ماڵ نەیەمە دەرەوە
هەر دانیشم بە تەمای تۆ
بڕوانم لە پەنجەرەوە
بەو مەرجەی
جارێ بڵێی پێم
چاوەڕوانم بە ڕۆژێك دێم

* * *

حەز ئەکەم هێزی گشت گیانم
لەچاو مابێو تێت بڕوانم

* * *

حەز ئەکەم جیهان ئەمەندە
بچوکو تەسك بێتەوە
کە نەتوانی خۆت وون‌کەی لێم
لەبەر چاوم بی بەجوانی
هەرگیز بەدواتا نەگەڕێم

* * *

حەز ئەکەم هەرەتی لاویم
پێم بڵێی پیربە ئەتدوێنم
خۆم بەپیرترین دائەنێم
هەر ناوی لاوی ناهێنم

* * *

ئەگەر نەتەوێ بەڵێن بەیت
کەهەمو دڵت بەمن بەیت
تەنیا ئەوەی من ئەمەوێ
گەلێك ئاسان ڕێك ئەکەوێ
حەز ئەکەم وەکو هەزاران
منیش یەکێ بم لە یاران
لەلای تۆ پەسندکراو بم
ئەگەر دۆست نەبم ناسیاو بم
یەکێ بم لەو ناسراوانە
کە ناویان لەسەر زوبانە

# کۆنە دۆست

کۆنە دۆستێکم دراوسێمانە
چاکو چۆنییەکەی هەروەك جارانە
ئەوسا وارێکەوت دورکەوتینەوە
ماوەمان نەما یەك بگرینەوە
ئێستاکە دیسان دەرکەوتۆتەوە
ئەومەیلە کۆنەم تازە بۆتەوە
کاتێ چاو بەدۆست ئەکەوێتەوە
چی یادی کۆنە کۆئەبێتەوە
ئەو شێوە جوانەو ئەو ڕوانینانەی
ئەمگێرێتەوە ئەوسەر دەمانەی
یەك زەردەخەنەی شەرماوی لایە
تامو بۆنەکەی جارانی تیایە

کاریشی ڕاستبێ خۆی وا نانوێنێ
بەلوتێکی بەرز ناسیاو بدوێنێ
ئەمەوێ ڕۆژێ بیگرم لێی پرسم
کە کۆنە دۆستبێ بۆ لێی بترسم
ئایا لەوەتی بەینمان بڕاوە
لەو ڕازە بەرزە چی لە بیرماوە
خۆم شارەزایم لەڕووی بڕوانم
بەسەرنجی چاو هەستی ئەزانم
کاتی خۆی دەمم بۆلای دەمی برد
نەئەو زویر بو نەمن ماچم کرد
بەتەمام جارێك دەمم بیگاتێ
بیری خەمەوە ئەو ماچەم باتێ

# یادێکی ڤیەنا

○

– علی فتاح دزەیی –

○

خۆشە ئینسان گیرفانی گەرم و گوڕبێ
ئەرکی سەرشانی سووك بێ و تازە کوڕبێ
شارەزای چەندزمانی ڕۆژ ئاوابێ
عیشقی جوانی بە خوێنیدا گەڕابێ

×

ئای چەند خۆشە لە حاڵێکی وهادا
بەرێبواری بگەڕێی لە دنیادا

×

ئەگەرچی من ، لەمانە گشت کەم بەش بووم
بەلام هێندە بۆ گەڕانێك سەرکەش بووم

ئەوا ئێستا میوانێکم لەم شارە
ماوەم کەم و ئاوات هەزار هەزارە
هێندە مەستم ، ئەوەندە بۆی پەرۆشم
بێ مەی نۆشین بە شەووڕۆژ سەرخۆشم

×

وەك سەرگەردان ، وێلی شەقامەکانم
هەر جوانی یە بۆ هەر لایێك دەڕوانم

×

هەر مەیدانە ، باخە ، پەیکەرە ، کێلە [1]
هەر دیمەنی کێشکەری نگای وێڵە .

چاو تێر نابێ لە (کارتنەرشتراسە)(٢)
کە تەرخانە بۆ پیادەو بۆ پیاسە

×

(ماری هێلفەر) ، شەقامێکە شاهانە(٣)
بۆ ئەم شارە شادەمارو شریانە

×

(بەلڤادێر) ، ستوونەکەی بەر هەیوانی(٤)
پاڵەوانێك داێناوەتە سەر شانی ،

×

گەنجینەی پڕ سامانی تابلۆو ڕەسمە
بۆ تێشووی گیان جارەك دەبینم بەسمە

×

(شوێنبرۆن) هەر ژوورو هەر سالۆنی(٥)
جهانێکە بۆ یادگاری کۆنی
بە هەر پەناو پێچێکیا ڕادەبردم
لەبن لێوان یادێك بانگی دەکردم :

×

ئەم تەلارە جێی (ماری تیریزا) بوو
ناودارترین فەرمانڕەوای نەمسابوو

×

ئەم ژوورەش هی ئەنتوانێتی نەفامە(٦)
چۆن بزانێ داخوا چی سەرەنجامە ! !

×

(ناپلیۆن) کە لەم شوێنەدا میوانبوو
تازە (ماری لویزا)ی دەزگیرانبوو(٧)

×

هۆلی گەورەش گۆرەپانی تەئریخە
پڕ لە سەدای کۆنگەرەو مەتەرنیخە(٨)

×

ئەی شوێنبرۆن ، ئەگەرچی بێهاوتانیت
بەلاّم هەرگیز بۆم ناکرێ وەسفی جوانیت

×

مەگەر بڵێم تاجی سەری نەمساتی
گرژنەوەی سەر لێوی ڤیەناتی

×

لە (گرینزنگ) کە مەلبەندی باخۆسە(٩)
هەر جوانێکی دەبینی وەك ڤینۆسە

×

هەر مەیگێڕی نازدارو پەرچەم زێڕن
بادەی شادی بە نێو خەڵکا دەگێڕن

×

توخوا ، جوانی زێڕین پرچو کاڵ چاوم
مەخرۆشێنە تەندوورەی دوڕ هەناوم

×

ڕێبوارێکم تێنووی دیمەنی شارم
دەمەوی تێر لەم شوێنانە بنوارم

×

ئۆ پراخانە ، بێرگ تیاتر ، پارلەمان(١٠)
هۆفبۆرگی مەند ، کاتەدرای سان ئەستیفان(١١)

×

ئەی کاتەدرای کلاّو قووچی گۆتیکی(١٢)

هێندە باڵای لە پێچکەی عەرش ، نزیکی

×

بم بەخشە گەر ڕێگام بۆ ئۆپێرایە
لای هونەر دۆست ، ئەویش وەك مەزارگایە

×

ئۆپراخانە ، کانگەی هونەری بەرزە
لەم شارەدا ، زیارەتکردنی فەرزە

×

نموونەی شێوازو فەننی بارۆکە (١٣)
وێنەی کەمە لە جهاندا ئیمرۆکە

×

دەری ، ژووری ، داری ، بەردی ، دیواری
هەر بستێکی هونەرێك دەکا دیاری

×

تاقی قوبەی وەك قوبەی ئاسمان جوانە
شاکارێکی دەستو پەنجەی ئینسانە

×

هۆڵی بەرین ، گالەری سێ قات بەرزی
لێی چۆل نەبوو بەقەد جێ نووکی دەرزی

×

بەرنامەی شەو ، سەرتاشی ئەشبیلیابوو (١٤)
تەلەسمێکی دراماو مۆزیقابوو

×

شانۆی ژێر تیشکی ڕۆناکی ڕەنگاورەنگ
زەنگوڵ زەنگوڵ لێی هەڵدەستا نەغمەو دەنگ

×

ئۆرکێسترا ، کۆرس ، لەرەی سۆپرانۆ (١٥)
دیمەنو دیکۆری جوانی سەر شانۆ

×

دنیایەکی ئەوتۆیان هێنا کایە
کە پیاو هەر بە خەیاڵیشیدانایە

تەماشاکەر ئەوەندە واق وورماوبوون
لێ هەستو خوست دەتگوت بەس
گوێچکەوچاوبوون

×

کە مۆزیقاش لە گەڵ سەدای ئیتالی
بەرز دەبۆوەو دەیدا لە شەقەی باڵی

×

جۆشیان دەسەند تێکرا ئەو هەزارانە
رادەهەژا قوبەی ئۆپەراخانە

×

ئەمجا کاتی کافتێریاو پشوودانە
دنیای بۆنو بەرگو ئافرەتی جوانە

×

ئەی ئافرەتی شۆخو شەنگو رازاوە
ئەم لافاوەی جوانیت لە کوێ هێناوە ؟

×

ئەم شەپۆلی عەترە ، ئەم سیحرو نازە
ئەم نوارینو زەردەخەنەو نیازە !
عومرەك دێنێ کاتی پشووی ئۆپێرا

بەرامبەرت راوەستم لە کافتێرا
×
دووای ئۆپێرا ، کێلەرێك جێگای ژوانە
ئۆگستاینەر ، جوان بووکی مەیخانانە(١٦)
×
کە شەو داهات ، ئیتر گەرمە بازاری
لێو رێژدەبێ لە رێبوارو لە شاری
×
ژنو پیاوو پیرو لاوو سپیو رەش
کۆ دەبنەوە ، دەستە دەستە پێنجو شەش
×
لە پشت کاونتەری باری مەیخانە
وێرا ناگا ساقی ، پرکا پەیمانە
×
ریز لەسەر ریز ، شووشەی رەنگ سپیو سوورە
بەسەر سینگی باردا چەشنی بەرموورە
×
ئەی کێلەری ئۆگستاینەر زۆر پەستم
ئیمشەو تەنیام لەبەر دەرگات دەوەستم
×
چاو دەگێرم بەلکو شۆخێك پەیدابێ
وەك من شەیدای جوانیی هەموو دنیابێ
×
بێتە هاوریێو رابەری ئەم هێوارەم
یاقووتێکی رشتەی ئەم یادگارەم
×

ڤیەنا چۆن لە خەوما دەمدی ، وابووی
زۆر زیاتریش جوانو بەرزو بالأبووی
×
تاماویشم بیرەوەری ئەم گەشتە
لە پێش چاوی خەیالما ، وەك بەهەشتە

**پەراوێزەکان :**

١- کێل = ستوونە بەردی مێژوویی وەکو کێلەکەی (کێلەشین) ٢-(کەرتەر شتراسە) شەقامێکی زۆر جوانو تایبەتە بۆ پیادە رۆیان .
٣- شەقامێکی زۆر کۆنو درێژە .
٤- (بەلڤادێر) کۆشکی (فرانس فەردیناندی)ی برازای ئیمپراتۆری نەمسا - مەجەر (فرانس جۆزێف) بوە . ئێستا مۆزەخانەیێکی بە ناوبانگەو پرە لە تابلۆی بە نرخی جهانی .
٥ - شوێنبرۆن : کۆشكو سەرای هاوینانەی ئیمپراتۆرەکانی (نەمسا - مەجەر) بوە .
٦ - مەبەست (ماری ئەنتوانێت)ی شاژنی فەرەنسەیە ، کە کچی (ماری تیریزا) بوو .
٧ - کچی ئیمپراتۆری نەمسا (فرانسیس - ی یێکەم) بوەو بۆ بەرژەوەندی سیاسی شووی بە (ناپلیۆن بۆنابارت) کردوە .
٨ - لە دوای شکانی ناپلیۆن کۆنگەرەی ڤیە نا (١٨١٤- ١٨١٥) لەم تەلارەدا کۆبوونەوەکانی دەکرا . (مەتەرنیخ - کۆنت کلیانت ڤێتسل) ، سەرەك وەزیرانی نەمساو بەرچاوترین سیاسەتمەداری ئەوسابوەو ، کارێکی زۆری کردۆتە سەر بریارەکانی کۆنگەرەکەو ئێستا وێنەیێکی گەورەی لەم هۆلەدا هەلواسراوە .
٩ - گرینزنگ : گوندێکە لە نزیك ڤیەناو مەیخانەکانی زۆر ناودارن .
١٠ - بێرگتیاتر : شانۆ خانەیێکی بە ناوبانگە .
١١ - هۆفبۆرگ : کۆشكو سەرای زستانانەی ئیمپراتۆرەکانبوەو .
١٢ - گۆتیك : Gothic : شێوازێکی هەندەسەکاری بەکەتەدراکان ، لە سەدەی حەڤدەم بە دوواوە ، بەم شێوازە دروستکراون ، گومبەتەکانیان ئێجگار قووچو بلندنو ، تاق پەنجەرەکانیان زۆر تیژنو بۆ هەوراز هەلکشاون .
١٣ - بارۆك : baroque : ئەو بابەتە دیکۆرانەن کە لە سەدەکانی حەڤدەمو هەژدەمدا دەرو ژووری کاتەدراکانو تەلارەکانیان پێوە دەرازایەوە .
١٤ - یەکێکە لە ئۆپێرا بە ناوبانگەکانی مۆزیقا کاری ئیتالی (جیۆشینۆ رۆسین : ١٧٩٢-١٨٦٨) .
١٥ - سۆپرانۆ = Soprano : بەرزترینو ناسکترین دەنگی ئافرەتی گۆرانی بێژە لە ئۆپێرادا .
١٦ - کێلەر = مەیخانە
١٧ - ئوگوستانیەر کێلەر = مەیخانەی ئوگستاینەر : لە ڤیەنا بە ناوبانگە .



# ئەحمەدکێ حەمال

● محمد حسن بناڤی ●

پیرەژنەکا ل گوندەکی بوو . کورەك هەبوو . کارێ وی حەمالی بوو و تشتێت خەلکی باردکرنو دکێشان . هەرو دا چیت کارکەتو ئێڤاری دەت ب نان بۆ خوەو دەیکا خوە ئینیت . ب ڤێ چەندێ ژیارا وان دبوو . هەیامەك پێڤە چوو ئەحمەدی هزرێت خوە کرنو گوت :- «ئەز دێ چم باژێرەکێ بۆ خوە کارکەم» .

ئەحمەدی دەیکا خوە هێلاو چوو باژێرێ نێزیکی گوندێ خوەو هەر ما لسەر کارێ خوە یێ بەرێو حەمالی کر رۆژەکێ حاکمێ باژێری فەرمانەك دەرئێخستو گوت : «هەر بێژنەکا ل باژێری هەبیتو شوی نەکەت مالێ وێ بۆ کەسو کارێت مێرکی یە یێ چ مرۆڤ نەبن مالێ وێ دێ زڤریت بۆ حوکمەتێ» حەفت رۆژ موهلەت دانێ تێدا شوی بکەن . وی هەیامی وەزیرەکێ حاکمی مربوو . ژنکا وی سەرێ خوە د پەنجەرێرا ئینابوو دەرێو بەرێ خوە ددا کولانێت باژێری هەتا ئێکێ ب دلێ خوە دبنیتو دهەلبژێریت . ناڤبەینەکێ بەرێ خوە دایێ کورە جحێلەك یێ ژووردا دهێت . زەندکێت وی دهلدانەو یێ سورێ چاڤ شینە ئەڤا ئەڤە ڤرڤرکێت وی‌نە . ب کارێ وی زانی فەقیرە . بەلێ دلێ وێ نە ب دلەکی ب هزار دلا کەتێو گوت :- «خدام . هەرە وی زەلامێ هە بینە ڤێرێ» خدام ژ خانی دەرکەتو بەزی بەراهیکێو گوتێ : «زەلام . زەلام» ئەحمەد لێ زڤریو گوتێ : «بەلێ» وی هزرکر دێ بێژتێ وەرە بۆ من کارەکی بکە . ئینا خدامێ گوتێ : «خاتوینا من یا گوتی بلا بێت» ئەحمەدی د دلێ خوەدا گوت : «ئێ . ئەڤە کارەك بۆ من چێبوو» کەتە دویڤ پێ خدامێو چوو مالا وەزیری روینشتە خارێ . بێهنەکێ ماکەسێ چ پرسیار ژێ نەکرن . زڤێر بوو گوت : «ئەزبەنی نوکە من بۆ خوە هندەك پارە کارکربان . کا هەوە چ ژ من دڤێت بێژن ؟» ژنا وەزیری گوتێ : «بێهنەکا دی راوەستە» ئەحمەدی بیستەك دی خوە گرت . جارەکا دی گوتێ : «نوکە هندی دی من پارە کارکربان . ئێدی ئەز خوە ناگرم دێ چم» ئینا ژنکێ گوتێ : - «ئەرێ تە ئەز دڤێم ئان نە ؟» هەما ئەحمەد سڤك رابوو و گوت : - «توژی بۆ خوە یاریا ب من بکە . چونکی ئەز فەقیرو بەلنگازم» . ئینا ژنکێ

ـت :- «راوەستە ئەز یاریا ناکەم ، مانێ تەژی یا گوهـ ل ـحت حاکمی بووی ، ڤێجا مێرێ من بێ مری ، من دڤێت ـ من مارەبکەی ، هەکەر تە ئەز بڤێم ، هەکەر تە ئەز نەڤێم ، مـ ـ سەر رێکا خوە» . ئەحمەدی هزرێت خوە کرنو گـ ـت :- «بلا ئەزێ قاییلم» .

گاڤا ئەحمەدی وەگوتی ، ژنکێ ئەحمەد ڤرێکر د گەرماڤێ ڤەو سەرێ خوە شویشت ، پاشی دەستەکێ جلکێت وەزیرا کرن بەرو گوتی :- «روینەخارێ چی مێهڤانێ بۆ مە ـت قەدرێ وی بگرە» . ژنك چوو نك حاکمیو گوتێ :- من بۆ خوە ئێکی دیتی ، م دڤێت تو بهێ پێش کا تو چ ـبێژی ؟»

وەزیرێ ملێ راستێ بەری حاکمی چوو جەم ئەحمەدی ، ئەحمەدی لدویڤ پێچێبوونا خوە رێز ل وەزیری گرتو ـبەر خلمەتا وی راوەستا ، پاشی حاکمژی چوو دەڤ ، ئەحمەدی هێژپتر رێز لێ گرت ئینا حاکمی گوتە ژنکێ :- «تە هزار جارا پیرۆزبیت ، مرۆڤەکێ پێشکێشەو بێ ب ئاقل ، سوباهی دێ بۆ هەوە کەین داوەت» . کەیفا هەردووکا گەلەك هـت ، رۆژا پاشتر بۆکر داوەت . پشتی حەفت شەڤو حەفت رۆژا داوەتا وان خلاسبووی ژنکێ گوتە ئەحمەدی : «هەکەر دکانەکێ بۆ تە ڤەکەینو روینیبەر ما چەوایە ؟» . ئەحمەدی گوتێ : «باشە بەلێ ئەز پارا ژنك نانیاسم» ، ئینا ژنکێ گوتێ :- «ئەز دێ نیشا تە دەم» ئەحمد قاییلبوو ، رۆژا پاشتر دکانەك ڤەکرو تژی قوماش کرو روینشتبەر ، دەست ب بازاری کر ، قوماشێ مەتر ب دەهـ زێرا دا ب پێنج زێرا ، هەتا ئێڤاری پارچەك ژ قوماشێ خوە نەهێلاو زڤری چووڤە مالێ گوتە ژنکا خوە : «من ب ڤی رەنگی بازارێ کری» ژنکێ پارێت وی ئەژمارتن زانی بێ خوسارەتبووی بەلێ دەینەکرو گوتێ : «دەستخوەش» .

کارێ ئەحمەدی بۆ دکان و کرینو فروتن ، رۆژ بۆ رۆژێ زیرەكبوو هەتا بووی ئێك ژ جەمبازێت بازێری ، خەلکی ئەحمەد نیاسی . هەمی دەما دکانا وی یا مشتبوو ژ بکرا .

رۆژەکێ **کچا** حاکمی گوتە خداما خوە :- «هەرە بازاری بۆ من کراسەکی بینە ، کەسێ ل بازێری ژ وی قوماشی نەبیت» . خدامێ عەبایێ خوە ب سەرێ خوە داداو قەستا بازاری کرو گەرها ، ناڤبەینەکێ چاڤێ وێ ب کوماتیەکا بوش کەت ، قەستا وێ کوماتیێ کر ، بەرێ خوە دایێ کورە جحێلەکێ لەبەر دکانێ روینشتیە دیتنا وی زەلامەکی دئینیت ، خدام ماو بەرێ خوە دایێو هشێت وێ سەری چوون بو مەغرەب نە چ کریو نە چ فروت ، چاڤێ وێ بێ ل ئەحمەدی ، ئەحمەدی دکان گرتو گوتێ :- «ئەرێ خویشکێ تە خێرە ؟ ! ئەوە سپێدێ تو ل ڤێرێ نە چ دکریو نە چ دفرۆشی» . ژ نوی بیرا وێ هاتو گوت :- «وەیلا ل من خوەلی سەرێ ، نهە خاتوینا من لهیڤیا منە» پێ ب بەزێ ڤەناو چوو ، گەهەشت مالێ خاتوینا وێ گوتێ :- «کچێ تو ل کیڤە بووی ئەوە سحارێ هەتا نهە» خدامێ گوتێ :- «خاتوینا من نەبێژە ، فلان راستا بازاری دکانەکا لێ بوو زەلامەکێ لبەر بوو ، هەر خودێ دزانیت چەند لاوەکێ ژێهاتی بوو ، ئەوە سحارێ ئەز بەرێ خوە دەمێو ئەز ژ دیتنا وی تێر نەبوومە» ، ئاگر بەربوو خاتوینێو نەزانی دێ کەنگی بیت سپێدە .

رۆژا پاشتر سحارێ زوی خاتوین رابوو کارێ خوە کرو ئەوو خدام چوون بازاری ، چوون بەردەرێ دکانا ئەحمەدی چاڤێ خاتوینێ ڤێکەت ، نە ب دلەکی ب هزارا دلێ وێ کەتێ ، هەتا ئێڤاری ما ل دکانا ئەحمەدی ئەڤ قوماشە راکر وێ هە دانا نە چ کریو نە چ فروت ، ئێڤاری سەد زێر دان ئەحمەدیو خودیکا خوە نیشاداو چوون . ئەحمەدی ژی دەرێ دکانێ گرتو چووڤە ، چیرۆکا خوەو کچا حاکمی بۆ ژنا خوە

گوت . ئینا ژنا وی گوتێ : «ئەوێ تو دڤێ‌ی» .

ئەحمەدی گوتێ :– «دێ هزارێت وەکی گۆری قوندەرا تە کەم» . ڕۆژا پاشتر ژی هاتن وێرێ‌و چ نەکری ئێڤاری کەزێیت خوە نیشادان‌و دەرکەتن . ڕۆژا سیێ‌ژی ب وی ڕەنگی هاتن نك ئەحمەدی . گاڤا دەرکەڤتی دەستێ خوە ل‌دوور دکانێ ئیناو بر . ئەحمەد چووڤە مال‌و سەرهاتیا خوە بۆ ژنا خوە گوت . ژنا وی گوتێ : «ئەوێ تو دڤێ‌ی . ڕۆژا خودیکا خوە نیشا تە دای یا گوتی تە دیوارێت مە هەمی شیشەنە . ڕۆژا کەزێیت خوە نیشا تە داین یا گوتی تە ب وەریسا نەبیت کەس نەشێت ڤێهەل بهێت . ڕۆژا دەستێ خوە لێك‌زڤراندی یا گوتی تە دوورمەندووری خانیێ مە پولیسن دەمێ ئەحمەدی گوهـ ل ئاخفتنێت هەڤسەرا خوە بووی ئاگرکەت بن پیاو نەزانی دێ ب چ ڕێ خوە گەهینیتێ . ئینا گوت ژنکا خوە :– «ئەز دێ‌چم دەست‌نڤێژەکێ» مەسینك هەلگرت‌و دەرکەت . مەسین هێلا ل دەری خانی‌و چوو . هێشتا کچك یا ل‌هیڤیێ گاڤا کچکێ ئەحمەد دیتی . وەریس بو داهێلاو ئەحمەد پێڤە چوو سەری ، هەردوو چوون مەزەلا کچکێ‌و کەتن یاریاو ترانا هەتا سحارێ . سحاری چاڤێ پولیسا ب وەریسی کەت . زانی تشتەکێ هەی ڕاست چوون مەزەلا کچکێ . بەرێ خوە داینێ ئەو زەلام یێ دبەردا درێژکریە . هەردوو دناڤ بەطەنێ پێچان‌و برن ئاڤێتن دزیندانێڤە .

ژنکا ئەحمەدی زانی . ڕابوو تژی ئامانەکی خارن کرو بر . چوو بەردەرێ زیندانێ‌و گوتە نوبەداری (حەرەسی) :– «بەختێ خودێ ئەز ئێکا ب‌تنێ‌مە . مێرێ من یێ ل‌ڤێرێ دێ خارنێ بو بەمو زوی زڤرم د هەوارا پەزێ خوە» نوبەداری ڕێکا وێ‌کر . چوو نك ئەحمەدی زوی زوی کنف ڤەکرو کچك ژ ناڤ ئینادەری‌و گوتێ :– «ئەز دێ‌چم دناڤ بەطەنیێ‌دا ، وەکی بەرێ مە گرێدەڤەو ڤان ئامانا ڕاکەو هەرەڤە مال» .

کچکێ گوهێ خوە داینێ . ئەو وەکی بەرێ گرێدان‌و ئامانێت خوە هەلگرتن‌و چوو .

گاڤا جڤاتا حاکمی هاتی‌گرتن پولیسا گوتە حاکمی : «شڤێدی ئێکی ل دەڤ کچا تە نڤستی‌بوو هەتا سپێدێ» حاکمی گوتێ : «بابۆ ڤێ سحارێ ئەزێ چوویم نك کچا خوە . من چ نەدیتە . بەلێ هەرن بینن کا چ سەروبەرە ؟» پولیس چوون بورێ خوە ئینا وێرێ ، کنف بری‌و بەطەنی ڤەکر . ژنك‌و مێرك ژناڤ دەرکەتن . حاکمی گوتێ : «ئەڤە چی‌یە ؟ ! !» ئینا ژنکێ گوتێ :– «ئەزبەنی ئەزو مێری خوە ل‌سەر جهێ خوە دخەوبووین . هاتن ئەم دناڤ بەطەنیێ پێچاین‌و کرین دزیندانێڤە . ئەڤە ئەم ئیناین بەر سینگا تە ، ما هوسا باشە ؟ هەرو هو ل ئێکی بکەن» . حاکم تنگژی‌و کەربێت وی ڤەبوون . ئینا گوت :–

«هەر کەسەکێ پولیسەك دیت بلا نەهێلیت ساخ‌و بکوژیت» . حاکمی ئێکسەر بڕیاردا هەر کەسەکێ کچا وی تمام بووی دڤێت ل‌ناڤبەینا حەفت ڕۆژا بدەت شوی .

ئەو چەند ڕۆژ بوو حاکم دچوو نك کچا خوەو دگوتێ : «تو تمام بویە ئان نەء ؟» وێ ڕۆژێ چوو نك کچا خوەو پرسیار ژێ‌کر . ئینا کچا وی گوتێ : «بەلێ بابۆ ئەڤە دوو ڕۆژە ئەز تمام بوویم» حاکمی گوتە ئێلچێیت خوە گازی‌کەن هەر کەسەك سوباهی کاری خوە بکەت‌و بهێت ئەز دێ کچا خوە دەم‌شوی» . ئێلچیا دەنگ ل بازێری هلدێرا و گوت : «ها ڕەحمەل وی‌و بابێ وی یێ سوباهی کاری خوە باش بکەت‌و بهێت مەیدانکێ کچا حاکمی دێ بۆ خوە ئێکی هەلبژێریت» دەمێ خەلکێ بازێری گوهـ ل ڤێ گازیێ بووی هەیلە ل وی‌و بابێ وی یێ کارێ خوە باش بکەت‌و بچیت مەیدانکێ ، ئەحمەد وێ ڕۆژێ دەرنەکەت . کچکێ هەتا نیڤرو چاڤێ خوە

ـ خەلکی گێڕا کەسێ ب دلێ خوە نەدیت . ژنا ئەحمەدی گوتیێ :- «ئەحمەد ڕابە هەڕە تو دڤێی» ئەحمەد دەرکەتو چوو ناف زەلامێت بازێڕی ، دەمی کچکێ دیتی سێڤا خوە ڤێت ل سینگێ ئەحمەدی دا .

ئێلچیا ئەحمەد گرتو بر نك حاکمی . حاکمی کچا خوە یێ مارەکرو حەفت شەڤو حەفت ڕۆژا بۆکر داوەت . پشتی دوەتا وان خلاس بووی ژنا وی یا نوی گوتە هەویا خوە :- «ما ئەحمەدی چ کەسێت خوە نینن ؟» هەویا وێ گوتیێ :- «ب خودێ هندی ئەز پرسیار ژێ دکەم دبێژیت ئەزێ بەتنێ مەو من چ کەسێ خوە نینە» ئینا کچا حاکمی گوتیێ : «ئەڤروکە ئەم دێ پێ ئینینەدەر . گلاسەکێ مەیێ شوینا ئاڤێ دێ دەینی چ هەیە دێ بێژیت» . ئێڤاری گلاسەك تژی مەی کر ، ئەحمەد هاتڤە ، ژنا وی یا بچویك گوتیێ : «ئەحمەد ئەڤروکە مە مهانێ یا کری هەر کەسەکێ بەری گلاسێ خوە ڤەخار ئەڤ شەڤە تو مێهڤانێ وێی» . ئەحمەدی گاڤەکێ گلاسێ خوە دا سەر دەڤێ خوەو لسەرك ڤەخار ، هشێت ئەحمەدی بەلاڤبوونو سەرخوەش بوو . ژنا وی گوتیێ : «هەرێ ئەحمەد تە چ کەسێت خوە نینن ؟» ، ئەحمەدی گوتیێ : «بەلێ وەللا من پیرە دەیکەکا هەی یا ل فلانە گوندی ل زۆزانا» . خوە گرت هەتا بووی سپێدە ، ژنا وی گوتیێ : «تە دگوت من چ کەسێ خوە نینە ، شڤێدی تە دگوت من پیرە دەیکەکا هەی لفلانە گوندی ل زۆزان» .

پشتی دەیکا وی دیاربووی ژنا وی یا بچویك گوتیێ : «ئەز دێ چم نك دەیکاتە» ، ئەحمەدی گوتیێ : «بلا هەڕە» . ژنك ڕابوو کارێ خوە کرو لهەسپێ خوە سیاربووو چوو هەتا گەهەشتی وی گوندی . پرسیار کر : «هەرێ مالا ئەحمەدی ل کیرێیە ؟» ئێکی ژێ گوتیێ : «بەری نوکە ئەحمەدکەکێ لڤیرێ بوو کارێ وی حەمالی بوو دگوتێ ئەحمەدکێ حەمال» ژنکێ ئاخفتنا وی برێو گوتیێ : «هەما ئەوە کا مالا وی نیشا من بدەن» . مالا وی نیشادا . ژنك چوو جەم دەیکا وێو گوتیێ : «پیرێ هلو ڕابە ئەز بویکا تەمە ، ژنا ئەحمەد چەلەبی» پیرێ گوتیێ : «دێ هەڕە هەکە من ژی ئەحمەدەك هەبا ئەزا هوسا نەدبووم» . ئینا ژنکێ گوتیێ : «بەلێ بخودێ ئەز ژنکا وێمە» ژنك پەیابوو چوو سەرێ خەسیا خوەو ماتێ ژێکر ، پاشێ قەسرەك ئاڤاکرو ئەوو خەسیا خوە چوون تێڤەو لبەر خلمەتا وێ ڕاوەستا . موختاری گوندی بەرێ خوە دایێ ئەو ژنکا وەسا تازە ما لنك پیرێو ناچیتڤە . هەرو چوو مالا وانو دما ل وێرێ هەتا درەنگی ، ڕۆژەکی ژنکێ گوتیێ : «هەرێ موختار تە چ دڤێت تو هندە دهێی ڤێری ؟ ؟ !»

موختاری گوتیێ : «ئەز ژبەر تە دهێمو من تو دڤێی» . ژنکێ خەبەر گوتنێو دەرئێخست ، موختار تنگژیو کەربێت وی ڤەبوونو گوت : «پا سۆزا خودێ لمن کەتبیت ، ئەز هینگێ ڕاوەستم تە بدەم کوشتن» .

موختاری کاغەزەك بۆ ئەحمەد چەلەبی **نڤیسیو** تێدا گوت : «ئەی ئەحمەد تو پێ بزانی ژنا تە یا هاتی ڤێرێ قەسرەکا ئاڤاکری وکارێ وێ پویچاتینەو چودینە» .

چاخێ کاغەز گەهەشتی دەستێ ئەحمەدیو خاندی کەربێت وی گەلەك ڤەبوون ، سڤك ڕابوو دەرێ دکانێ گرتو چوو مالێ ، دەوارەك بۆ خوە زینکرو لێسیاربوو ، بەرێ خوە دا گوندێ خوە یێ کەڤن ، چاڤێ ژنکێ یێ ل ڕێکێ کانێ دێ کەنگی ئەحمەد ددویڤدا هێت . ناڤبەینەکێ تۆزەك ل بنێ دەشتێ دیاربوو کەیفا وێ گەلەك هاتو گوت :

«پیرێ ئەڤە ئەحمەدێ هات ئەز دێچم بەراهیکێی هندی پیرێ گوتی :- «نەچە دێ هێت ڤیرێ» ژنکێ گوتیێ : «پیرێ بخودێ ئەز گەلەکا ژێ خەریب بوویم دێچم بەراهیکێ» . ژنکێ قەستا ئەحمەدی کرو ژێشڤەچوو . گاڤا ئەحمەد گەهەشتی ژنکێ ڤ دەوارێ خوە

پەیابوو چنگلێ ژنکێ گرتو هەژدە خەنجەر لێدانو د کەلەکا بەرادا ئاڤێت خارێو قەستا مالێ کر . چاڤێ مەلایێ گوندی پێ لێ بوو . چوو ژنك دانا سەر دەستێت خوەو بر مال دەرمانکر .

ئەحمەد گەهەشت مالێ ل دەیکا خوە خورێو گوتێ : «ما تو ل دەڤ نەبووی؟ تە نەدگوتێ ئەڤە چ پویچاتینە تو دکەی؟» . دەیکا وی لێ زڤریو گوتێ : «ئەحمەد چاڤێت خوە ڤەکە خو نە تو دینبوویە هەر کەسەکێ بۆ تە ئەڤ ئاخاڤتنە کرین . بێ وژدانیا ل‌ژنکا تە کری . هەکە ژنکا ژبەر خلمەتا من نەرابوویەو چی تشتێ من ڤیای پێ ل‌بەر دەستێ من بوو» . . . تەنگێت ئەحمەدی سستبوونو پەشێمان بوو . زوی زڤری سەر کەلەخێ ژنا خوە . کەلەخ نەدیت . ئینا گوت : «ئەز هینگێ دزڤرم تشتەکی ژێ بزانم» . موختاری ژی هزرێت خوەکرنو گوت :- «پا من ئەڤ بێ‌وژدانیە ل ڤێ ژنکێ کر ، ب ئەگەرا ئەزمانێ من مێرێ وێ هەژدە خەنجەر لێدان ، دڤێت تشتەکی ژێ بزانم کانێ بچ سەر چوو؟» ئەو ژی ژ گوندی دەرکەتو چوو .

دبێژن ژنك چل رۆژا ما ل‌نك مەلای . وەکی بەرێ ساخ بوڤە . ئینا گوت مەلای : «مەلا بخازە . کا تە چ دڤێت؟ ئەز بدەم تە» مەلای گوتێ : «من تشتەك نەڤێت بەس من تو دڤێ‌ی» هندی ژنکێ گوتێ تو مرۆڤەکێ مەلای رهێت تە سپینە . ئەز ل حینێ کچا تەمە .

مەلای گوتێ : «چەپو چوێر پێ‌نەڤێن . دێ شوی ب من کەی» ژنکێ چ رێ نەدیتن گوتێ : «بلا دابچم دەستێت خوە بشوم پاشی من ل‌خوە مارەبکە» .
مەلای وەریس کر دەستێ وێو گوتێ :- «دێ هەرە» . ژنکێ مەسین هەلگرتو چوودەری وەریس ژ دەستێ خوە ڤەکرو ئاڤێت چەمبلکێ مەسینێو چوو . مەلای خوە گرت ، بێهنەکێ دووا نەهات . وەریس کێشا بو خرخرا مەسینێ پێڤە هات . ئینا مەلای ژێ گوت : «دڤێت بزانم کا تو ب چ سەر چووی؟» . مەلا ژ مالێ دەرکەتو چوو .

ژنك ب رێ چوو هەتا د باژێرەکی دەرکەتێ . چوو بەر دکانا حەجیەکی و روینشتخارێ هەتا بویە ئێڤار . حەجی دەرێ دکانا خوە گرتو ژنك نەچوو . ئینا گوتێ : «خویشکێ تە خێرە؟» . ژنکێ گوتێ : «ئەزبەنی . ئەزا نەشارەزامەو من کەسێ خوە نینە» . حەجی ژنك بر ناڤ مالا خوەو بۆ خداما وان . بەری هینگێ حەجی خولامەك هەبوو ژبەنیێت رەش . رۆژەکێ کەس نەما ل مالێ . ئەو بەبنی رەش ما ب لێڤا ژنکێ‌ڤەو گوتێ : «دڤێت تو شوی ب من بکەی» . هندی ژنك هاتێو گوتێ : «من تو نەڤێ‌ی ، تو بەنیو ئەز نە» . کەربێت بەنی گەلەك ڤەبوونو گوت : «پاژنکێ سۆزا خودێ ل من کەتبیت ، ئەز ئێکا هند بکەم تو نەمینی ساخ» . بەنی رابوو کورێ حەجی د لەهندکێرا سەرژێکرو کێرا ب خوین کر د بەریکا ژنکێ‌دا . ئێڤاری هەمی ڤێك‌کەتن . بێهنەکێ مان کورك نەرابوو حەجی گوتە ژنکا خوە : «هەرە سەحکێ» . چاخێ ژنك چوویو ژسەر چاڤا ئاڤێتێ . بەرێ خوە ددەتێ لەهندك گولا خوینێ‌یە . قیریەك ب ژنکێ کەتو کر هەوار . هەمی لێ کومبوون گوت : «پا **ئەڤە** کێ ئەڤ بێ وژدانیە کرە . . . ؟ ! !» بەنی گوت :- «ئەم دێ سەحکەین بەریکێت ئێکو دوو چی کەسێ کێرا ب خوین د بەریکێ‌دا ئەو وی یا وەکری» . سەحکر بەریکێت ئێکو دوو کێر ژبەریکا ژنکی ئینا دەر . حەجی ما هزرێت خوە کرنو گوت :- «خویشکا من . ئەز دزانم تە وە ل کورێ من نەکرە . بەلێ ئێدی نەمینە ل مالا من ژێ» .

ژنك ژ خانیێ حەجی دەرکەتو چوو . نابەینەکێ ل دەشتەکێ دەرکەت . کانیەك یا ل‌نیڤەکا دەشتێ بوو . ژنکێ

قەستا کانیکێ کرو چوو دا ئاڤێ ڤەخوت ، هند دیت حەفت سیارا پێکڤە ڕمێت خوە درێژکرنێ ، هەر ئێکی گوت بۆ منە . ژنکێ گوت : «بەختێ خودێ ئەز ئێکم‌و هوین حەفت ، ئەز بو ئێکی ژ وەمە . ئەز دێ تێرێ ل کڤانی دەم هوین دی دەوارو چەکێت خوە هێلن ل ڤێرێ‌و ب پیا دێ‌چن . هەر کەسەکێ بەری هەڤالێت خوە چوو و هات ئەز بۆ وی‌مە» . هەر حەفت سیارا گوتێ :– «بلا . خوەش ڕێکە» . ژنکێ تیر ل کڤانی دا هەر حەفت سیار بەزینێ . ژنك ڕابوو دە...ت‌ر پێت شەش دەوارا برین ، ل یێ حەفتێ سیاربووو کەت دەشتێ چوو ڕەخ باژێرەکی شڤانەك دیت ، گوتێ : «وەرە ئەزو تو جلکێت خوە ئێك بگوهورین» . هندی شڤانی گوتێ : «کارێ منێ درهایەو پیسە» .

ژنکێ گوتێ :– بلا من دڤێت» . هەردووکا کارێ خوە گوهورین . ژنکێ گیسکەك کری‌و گوراو پیستکێ وی ب‌سەرێ خوە داداو چوو ناڤ باژێری . بچویك کەتن دویڤ‌و هەر گوت کەچەلوکێ هات .

حاکمێ باژێری مربوو . طەیرکێ دەولەتێ دهەلاڤێت ، طەیرك فری‌و دانا سەر سەرێ کەچەلوکی ، هندەکا گوت : «وی بکەن د گوڤەکێ‌ڤە کەچەل بر کر ناڤ دەوارا ، جارەکا دی طەیرك هەلاڤێت . هەر هات‌و چوو نابەینەکێ د پەنجەرێرا چوو دانا سەر سەری ژنکێ . ڤی جارێ گوت :– «بینن بکەن د کولکێ مریشکاڤەو دەری لێ بگرن» . ژنك بر کر د کولکی‌ڤەو دەر لێ گرت . جارەکا دی طەیرك هەلاڤیت ، دیسا چوو دانا سەر بانێ کولکی‌و کولك ڤەکولا . ئینا هەمیا گوت : «کا دێ بینن ، دبیت مرۆڤەکێ باش بیت ؟ پاشی هەکە ب دلێ مە نەکەت دێ بۆ خوە حاکمەك دی ڕا کەین» . ژنك بو حاکما باژێری .

حاکمی فەرمانەك دەرئێخست‌و گوت :– «دوورێت باژێری سیمەکەن ، دەرەکی بتنێ بهێلن تێ‌و دەنەکێ ئاڤێ دانن تێدا . وێنەکێ خوە بێ کەڤن داڤێ‌و گوتێ ل هنداڤ دەنی هەلاویسن هەر کەسەکێ ئاڤ ڤەخارو گوت ئاخ بگرن‌و بینن» . وانژی دورێت باژێری سیمەکرن‌و دەرگەهەك هێلاتێ‌و وێنەك ب‌هنداڤ دەنی‌ڤە کرو نوبەدار ڕوینشتن بەر .

ئەحمەد بەری هەما هات ئاڤ ڤەخار ، چاڤێ وی ڤ شکلی کەت‌و گوت : «ئاخ» . نوبەدارا گرت‌و بر دەڤ حاکمی ، حاکمی گوتێ : «ئەڤێ بکەن د مەزەلەکێ‌ڤەو هەر دانەکی مریشکەکا قەلاندی بدەنێ» . ڕۆژا پاشتر موختار هات وی‌ژی ئاڤ ڤەخار چاڤێ وی ڤ شکلی کەت‌و گوت : «ئاخ» ئەو ژی گرت‌و بر دەڤ حاکمی گوت : «ڤێ ببەن بکەن د گوڤەکا دەواراڤەو هەر دانەکی تراڕەکێ ئاڤ خوێ بدەنێ ل‌گەل کەرەکێ نانێ ڕەق» . پاشی مەلاّ هات ئاڤ ڤەخارو گوت : «ئاخ» نوبەدارا ئەوژی گرت‌و بر دەش حاکمی ، حاکمی گوت :

«ئەڤێ ژی بکەن د گوڤا دەواراڤەو هەر دانەکی ترارەکێ ئاڤ‌خوێ‌و کەرەکێ نانێ ڕەق بدەنێ» . ڕۆژا پاشتر حەجی هات ئاڤ ڤەخارو کر ئاخ ، ئەوژی گرت‌و بر نك حاکمی . حاکمی گوت : «ڤێ بکەن د مەزەلەکا بتنێ ڤەو هەردانەکی مریشکەکا قەلاندی بدەنێ» . پاشی بەنی ڕەش هات ئاڤ ڤەخارو کر ئاخ ، ئەوژی گرت‌و بر نك حاکمی ، حاکمی گوت : «وی ژی بکەن د گوڤ دەواراڤەو هەر دانەکی کەرەکێ نانێ ڕەق‌و ترارەکێ ئاڤ‌خوێ بدەنێ» . ڕۆژا پاشتر هەر حەفت سیار هاتن ، هەر کەسەکێ ئاڤ ڤەدخار دکر ئاخ ، ئەوژی هەمی گرتن‌و برن نك حاکمی ، حاکمی گوت : «ڤانا بکەن ناڤ گرتیاو خارنا وانژی بلا وەکی یا کرتیا بیت» .

حاکمی گوت : «سباهی ئەم دێ ڤان مرۆڤا بەین دادگەهێ و چ چوو سەر دێ وێ ل‌گەل کەین» .

رۆژا پاشتر . هەمی برن دادگەهێ ، گازی ئەحمەدیو حەجیکرو هەر ئێك دانا سەر کورسیەکیو پەردەك لبەر ڤەداو یێت دی ئێك ئێك کرن ریز . حاکمی شیرەك د دەستێ خوەگرتو چوو بەرسینگێ موختاریو گوتێ : «راستیێ بێژە ، تە بوچی کر ئاخ ؟ دەمێ تە ئاڤ ڤەخاری ، هەکە ئها دێ تە کوژم» . موختاری گوت : «سوز بیت ئەز راستیێ بێژم» . موختاری چیرۆکا خوەو ژنکێ هەمی بۆ حاکمی گوت ، حاکمی گوتێ : «دێ تو هەرە وێرا هە» . بو گەرا مەلای و دادگەهێ ، حاکمی گوتێ : «دێ وەرە دڤێت توژی راستیێ بێژی» مەلا . گوت : «بەلێ ئەزبەنی و دەست ب ئاخفتنێ کرو چیرۆکا خۆ گوت . حاکمی گوتێ : «توژی هەرە دەڤ موختاری» .

بۆ گەرا بەنیو دادگەهێ . حاکم چوو بەرسینگا ویو گوتێ : «راستیێ بێژە هەکە دێ سەرێ تە برم» ویژی یاخۆ گوت حاکمی بەنی هێلا لنك مەلایو موختاریو چوو بەرسینگا هەر حەفت سیاراو گوتێ : «هەوە خێر بوو ؟ راستیێ بێژن»

هەر حەفت سیارا گوتێ : «رۆژەکێ ئەم چووین نێچیرێ ، مە ژنکەك لسەر کانیەکێ دیت ، مە هەر حەفتا رمێت خوە درێژکرنیو هەرئێکی گوت بۆ منە ، ئینا وێ گوت دنیا بوسلمانەتیە ؛ ئەز ئێکم هوین حەفت ، ئەز دێ تیرێ ل کڤانی دەم ، هوین چەکێت خوەو دەوارا بهێلنو هەرنێ ، چی کەسێ بەری رم ئینا ئەز بۆ ویمە ، ئەم ب ئاخفتنا وێ قاییل بووین ، وێ تیر ل کڤانی داو ئەم چووینێ ، هەتا ئەم زڤرین دەستو پێت شەش دەوارا یێت برینو یێ حەفتێ یا لێ سیاربوویو چووی ، ڤێجا ئەم یێ د دویڤدا هاتین ، ل دەرێ باژێری مە ئاڤ ڤەخار ، مەشکلێ وێ دیت لەو مە کر ئاخ» حاکمی گوتێ : «چ خوسارەتی لهەوە بوو ؟ ؟» ، هەر حەفتا گوت : «ئەزبەنی بەس هەسپێت مە چوون ، هەکە چ لە مە نەهاتە» حاکمی هەرسیارەکی سەد زێر دانیو گوتێ : «هەرن بۆ خوە هەسپا پێ بکرنو هندی هەوە ناڤێ ڤی باژێری گولێیێت نەمینن» .

ژنوی حاکمی پەردە راکرو گوتە ئەحمەدی : «تە خێرە ؟» ، ئەحمەدی گوت : «ئەزبەنی ئەو ژنك ژنا من بوو» . پاشی ل حەجی زڤرییو گوتێ : «تە بوچی کر ئاخ ؟» ، ئینا حەجی گوت : «ئەزبەنی ئەو کورکێ بەنی سەرژێکری ، کورێ من بوو ، ئەو ژنك یا ل ناڤ مالا من بوو» . حاکمی گوت حەجی : «تە زانی کێ کورێ تە کوشتە ؟» حەجی گوت : «بەلێ من زانی کێ یێ کوشتی» .

حاکمی گازی جەلادی کرو گوتێ : «دێ سەرێ ڤان هەر سێکا ببرە» ئەوی ژی سەری موختاریو مەلایو بەنی بریو هزار زێر دان حەجیو گوت ئەحمەدی : «هەکە تو ژناخوە ببینی دێ چ کەی ؟» ئەحمەدی گوت : «خوەزی من دیتبا ، من ژنا خوە گەلەك دڤیا ، بە لێ من بێبەختیەکا مەزن لێ کر ، دا بێژمێ ل من ببوورە و دا بەم ڤە مالێو من ژ بەرێ خوەشتر دڤێت» .

حاکمی جلکێت خوە دسەر خوەدا ئینان ، ئەحمەدی هو بەرێ خوە دایێ ژنکا ویە ، خوە تێكوەرکر ، کەتنو نەهشبوون ، ناڤبەینەکێ هشیار بوون ، ژنکێ گوتە خەلکێ باژێری : «ئەڤە مێرێ منە ، هەکە هوین قەبویل دکەن ب حاکمیا خوە دێ بیت حاکم ، هە کەهوین قەبویل نەکەن . ئەم دێچین بۆ خوە حاکمەکێ دی راکەن» . خەلکێ باژێری ئەحمەد ب حاکمیا خوە قەبویلکر . ئەحمەد بو حاکمو دەیکا خوەو ژنکا خوەیا دیژی ئینان دەڤ خوەو روینشتنخارێ .

ئاڤر : ئەڤ چیرۆکە یاهاتیە وەرگرتن ژ (صبری محمد سەرەروی) ل رۆژا ١٩٨٥/١١/٢٥ێ ل هیزاڤا .

# گەنجە ئازاکەی سەر جۆلانەکە

چیرۆکی :- ولیەم سارۆیان

●

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە :

شێرزاد حەسەن

●



## ١ - خەوتن

لەنێو ئەم جیهانە پانو پۆڕو فراوانەدا وەئاگایە . یەك تەختە ڕاکشاوەو وەئاگایە ، پێ‌دەکەنێ ، گاڵتە دەکا ، ڕادەبوێرێ . . بەتەوسەوە ، کۆتایی هەموو شتێك ، کۆتایی ڕۆما ، هەروەها بابل -یش ، دوو ڕیز ددانی بەریەچداچوو ، یادگارێك ، گەرمی‌یەکی بەتین . . وەك گەرمی گرکانێك ، شەقامەکانی پاریس ، پێ‌دەشتەکانی - جێرشۆ - کە هەمیشە وەك تراویلکە شەپۆڵ دەدەنو دەکشێنو دەبێ بە گەلەری‌یەکی چەندەها ڕەنگی ئاوی تێکەڵ . دەریاو ماسی‌یە چاودارەکان ، سیمفۆنیەیەك ، مێزێك لە قوژنێکی بورجی (ئیڤل) ، مۆسیقای جاز لە هۆڵی ئۆپێرا ، کاتژمێرێك زرنگەی دێ . . بۆ سەمای مەرگ لی‌دەدا ، گفتوگۆ لەگەڵ درەختێك ، ڕووباری نیل ، سواری (کادیلاك)بوون بەرەو (کانساس) ، هەروا زەنای دۆستۆیڤسکی . . لەگەڵ خۆری تاریك .

ئەم زەوی‌یە ، ڕووی کەسێك کە ژیا ، شێوەیەکی بێ سەنگ‌وکێش ، بەسەر بەفردا دەگری ، مۆسیقایەکی سپی ، گوڵێکی گەورە دوو بەقەد گەردوون ، هەوری ڕەش ، پڵنگێکی نێو قەفەز کە تیژ دەڕوانێ ، بۆشایی ئاسمانێك کە مەرگ نازانێ ، مستەر ئیلیۆت قۆڵی لێ هەڵکردووەو نان پێوە

دەدا ، (فلۆبێر)و (گی . دی . مۆپاسان) . سەرواوکێشی بێ وشەی مەبەستو مانایەکی کۆنو دێرین ، فنلەندا ، ماتماتیکێکی پوختو پاككراو . هەروەك تەرە پیاز کە ببرێ بۆ نێو دەمودان ، ئۆرشەلیم . ڕێگەیەك ڕووەو شتە دژوارەکان .

گۆرانی مرۆڤ : لەناخەوە . چریەی جوان لە کەسێکەوە دیار نەبێ ، بەڵام لەژێر تەمی پڕ نهێنییەوە بناسرێ ، باوو بۆرانی سەر کێڵگەی گەنمەشامی . یاری شەترەنج ، شاژن هێور دەکاتەوە ، پادشا ، کارل فرانز . – تیتانیك –ی ڕەش ، چارلی چاپلن دەگریو دەناڵێنێ . ستالین ، هیتلەر ، بەملیۆنەها جولەکە ، بەیانی دووشەممەیە . کەسێك نییە لەسەر شەقامەکان سە... بکا .

ئۆە . . ئەی چرکەی خێراو کتوپڕی ژین : کۆتایی هات . . ئەمێستا . . دیسانەوە زەوی .

## ٢ – وەئاگا هاتن

ئەوێکی (زیندوو) جلەکانی لەبەر کردو ڕیشی تاشی ، لە ئاوێنەکەدا سەیرێکی خۆی کرد . وتی : ئای کە ناشیرینم . . کوانێ قەرەوێتەکەم ؟ (تەنها یەك دانەی هەیە) ، قاوەو ئاسمانێکی خۆڵەمێشی ، تەمی سەر ئۆقیانوسی – پاسفیك – وڕە وڕی ئۆتمبێلێك شەقامەکە دەبڕێ . خەڵکی بەرەو شار دەچن ، دیسانەوە زەمەن ، ڕۆژ . پەخشانو شیعر ، بەسووکی بە پێپلیکەکانا هاتە خوارێو گەیشتە سەر شەقامەکە ، دەرۆیشتو کتوپڕ بیرێکی بە مێشکدا هات (– تەنها لە خەودا هەست دەکەین زیندووین . تەنها لەوێدا . . لەنێو باوەشی مەرگی پڕ لە زیندەگانیدا ڕووبەڕووی خۆمانو ئەم گەردوونە فراوانە دەبینەوە . . ڕووبەڕووی خواو پیاوە چاکەکان . . پێغمبەران . . ناوی باوكو باپیران . . گەوهەری ساتە بەسەرچووەکان ، لەوێدا سەدەکان بەیەك دەگەنو لەیەك ساتدا دەتوێنەوە . . مرۆڤو شتە هەرە مەزنەکان زۆر بچووك دەبنەوە ، پچرکەیەکی نەمریی بەرجەستە) .

تابلێی چوستو چالاکانە ڕێی دەکرد . بەئاشکرا گوێت لە تەپە تەپی پاژنەی دەبوو . . بەهەردوو چاو هەستی بە ڕووکەشی ڕاستەقینەی شەقامو باڵەخانەو کۆشکەکان دەکرد ، ڕووکەشی ڕاستییەکی هیچ . بێئومێدانە گۆرانییەکی چری – (گەنجە ئازاکەی سەر جۆلانە باڵدارەکە ، شلونەرم ، بەئاسماندا دەفرێ) پاشان بە هەموو دڵییەوە دایە قاقای پێکەنین ، بەیانییەکی خۆشو دڵگیرو ساردو خامۆشو خۆڵەمێشیی بوو ، بەیانییەکی پڕ لە هێزو گوڕێکی شاراوە . پاشان وتی – «ئاە . . ئێدگار گێست . . چەندە تامەزرۆی مۆسیقاکەتم . . !»

لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا پارچە ئاسنێکی هەڵگرتەوە . . سەیرێکی کرد . . دیار بوو کە پێنسیلکەو بەروارەکەی دەگەڕێتەوە ساڵی (١٩٢٣) . خستییە ناو لەپیو لێی ورد بۆوە . ئەو ساڵەی بیر هاتەوەو یادێکی – لینکۆلن –ی کردەوە . . لەسەرلاوە دەموچاوی لەسەر پێنسەکە چاپ کرابوو . تەنها پێنسێك هیچی پێ نەدەهات . بیری کردەوە :

ئۆتمبێلێکی پێ دەکرم . دوا مۆدێلو جوانترین جل لەبەر دەکەم ، دەچمە ئەو ئوتێلانەی ڕابواردنی تیایە ، دەخۆمو دەخۆمەوە ، پاشان دەگەڕێمەوە نێو جیهانی پڕ لە هێمنی خۆم . پاشان دەچمە سەر قەپانێكو ئەم پێنسە بەر دەدەمەوە ناو کونەکەو خۆم دەکێشم .

شتێکی چاکە مرۆڤ هەژار بێ . کۆمۆنیستەکانیش – بەڵام زۆر ترسناکە برسیت بێ . ئای کە چڵێس بوون . . ئای کە

حەزیان لە خواردن بوو ! ورگە بەتاڵ و داقوپاوەکان ! بیری دەتەوە کە زۆر پێویستی بە خواردن هەیە . هەموو ژەمێکی : هەر تەنها نان و قاوەو جگەرە بووە . کەچی ئێستا نانیش شك نابا . ـ ستی . . قاوەی بێ نان بە کەڵکی نانی شێوان نایە .

لە باخچەکەشدا هیچ جۆرە گیاوو گوڵێك شك ناباکە وەك –سپێناغ– لێ بنرێ و ببێ بە ژەمەخواردنێك .

گەر پیاو خۆی لە خوا نەکا . . دەتوانێ بڵێ : لەبرسانا بوەمردوو ببوو ، وێرای ئەوەش . . هەزارەها کتێب مابوون کە دەبوو بیانخوێنێتەوە بەرلەوەی بمرێ . گەنجە ئیتاڵی یەکەی هاتەوە ـد . . ئەو گەنجەی لە نەخۆشخانەی –بروکلن– دیبووی . نوسەرێکی بچووك و نەخۆش ، ناوی –مۆلیکا– بوو . . بەبێ ئومێدی یەوە دەیوت : چەند حەز دەکەم جارێکی تر ، بەرلەوەی بمرم ، کالیفۆرنیا ببینم . پڕ بەدڵ بیری لەوە دەکردەوەو دەیوت : دەبێ ، بەلایەنی کەم ، جارێکی تر – هاملێت – بخوێنمەوە . . یان لەوانەیە – هاکلبێری فن –ی مارك توین .

مەرگ بەتەواوی وای لێ کرد وەئاگا بێ . وەئاگاهاتنیش لە خورپەیەکی کت و پڕ دەچێ . بیری لەوە کردەوە : گەنجەکە زۆر کەساسانە دەمرێ . هەر خەریکە لەبرسانا بمرێ .

پەخشان و ئاو دوو شتی مەزنن . . بۆشایی نائۆرگانی پڕ دەکەنەوە . . بەڵام گونجاو نین . . ئەگەر لەبری پارە کارێك هەبێ بیکا : ئامادەیە ، هەر کارێکی هیچ . . لەوانە تیجارەت . . ئەگەر لێی گەڕێن لەسەر کورسی و مێزێك دابنیشێ و بەدرێژایی ڕۆژ خەریکی ژمارە بێ . . کۆیان کاتەوەو دابەشیان بکاو لێکیان دەربێنێ و لێکیان بدا . . ئەوسا لەوانەیە لەبرسانا نەمرێ . ئەوسا نان و تفاق و پێخۆر دەکرێ ، چەندەها جۆر ، جۆرەها خواردنی بەتامی نەرویجی و ئیتاڵی و فەرەنسی ، چەندەها جۆری گۆشت . . گۆشتی مانگاو مەرو . . ماسی ، پەنیر ، ترێ ، هەنجیر ، هەرمێ ، سێو ، کاڵەك و شووتی ، دوای ئەوەی تێر دەبێ . . ئەم شتانە دەپەرستێ . ئەوسا هێشنووە ترێ یەکی سوور دەخاتە سەر قاپێك و لەتەنیشتیا دوو هەنجیری ڕەشیش دادەنێ ، هەرمێ یەکی زەردو گەورەش ، سێوێکی سەوزیش . ئەوسا کاڵەکێك لەت دەکاو تێر تێر بۆنی دەکا . ئەوسا چەند سەموونێکی گەورەو چاك برژاوی لێ دەکرێ . . بە مەرجێ لە ئاردی فەرەنسی بێ ، هەموو جۆرە سەوزەیەك ، گۆشت . . بگرە ژبانیش .

لەسەر گردێکەوە سەیری دیمەنی شارەکەی کرد کە بەشکومەندی یەوە ڕووی لە ڕۆژهەڵات کردبوو ، بورجی بەرزو بڵند . کە جمەیان دەهات لە کەسانی وەك ئەو ، کت وپڕ خۆی لە دەرەوەی ئەم شارە بینی ، هەروەك بڵێی لەوە دڵنیابێ جارێکی تر ڕێگەی نادەن بچێتەوە ناویان . . لەوە دڵنیا بێ کە بە هەڵەو لە شوێنێکی هەڵە سەرکێشی بە ژیانی خۆی دەکا . . بگرە لە سەردەمێکی نالەبارو لەگەڵ نەوەیەکی هەڵەو نالەباردا . ئەمێستا گەنجێکی تەمەن بیست و دووساڵەیە ، شاریش بەردەوام ڕەتی دەکاتەوە . ئەم جۆرە بیرو بۆچوونە خەمی ناداتێ . لەدڵی خۆیدا وتی : هەر بەم زووانە دەبێ عەریزەیەك بنووسم و تیایدا داوا بکەم کە ڕێگەم بدەن بژیم ، ڕازی بوو لەسەر ئەوەی بمرێ ، بێ ئەوەی سکی بەخۆی یان بە مرۆڤ بسووتێ ، هیچ نەبێ ، بەلایەنی کەم ، شەوێکی تریش دەخەوێ . خۆ ئەو کرێی شەوێکی دیکەشی داوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ڕۆژێك ڕۆژێکی دیکەی بەدواوەیە . پاشان دەچێتە ئەو شوێنەی بێ دەرەتان و بێ ماڵەکان ڕووی تێ دەکەن . . لەوانەیە سەرێك لە مەڵبەندی «کۆمەڵەی ڕزگارکەران» بدا – گۆرانی و باڵۆرە بۆ خواو مەسیح دەچڕێ (ڕقیان لە ڕۆحی منە) لەوانەیە ئەوسا ڕۆحی ئازاد بێ ، بخەوێ ، بنوێ . دەشیزانی شتی وا ڕوو نادا . . ژیانە

تایبەتی‌یەکەی تەنها پەیوەندی بەخۆیەوە هەیە . نایەوێ ئەم ڕاستی‌یە پێشێل بکا . ئاخۆ دەبێ چ جۆرە گۆڕانێك باشتر بێ .

لەمێشکیا بوو بە ژاوە ژاو . بە ئاسماندا و لەسەر جۆلانەیەکی هەوایی‌دا . شتێکی خۆشە . . هەروەها جێی مەزاقیشە . جۆلانەیەك ڕووەو بارەگای خوا . یان ڕووەو هیچ . جۆلانەیەك ڕووەو ئەبەدی‌یەت بفڕێ . . خۆزگەی دەخواست هێزێکی ئەوتۆی هەبێ بتوانێ وەك مەل سووك‌وسانا بۆ خۆی بفڕێ .

وتی : ئێستا خاوەنی – سێنت –ێکم . پارەکەش ئەمریکی‌یە . بۆ ئێوارە پۆلیشی دەکەم تا بریقە هەڵدێنی‌و وەك خۆر دەدرەوشێتەوە . . پاشان لە وشەکان ورد دەبمەوەو دەیخوێنمەوە .

ئەمێستا لەنێو جەرگەی شار پیاسە دەکا . بەنێو خەڵکانی زیندوودا . یەك دوو شوێن هەبوو ڕووی تێ‌بکا . لەسەر جامخانەی کۆگاکان خۆی بینی‌یەوە . . تەواوێك دڵگیر بوو . . وای بۆ نەدەچوو کە ئەوەندە بێ‌هێزو لەڕو لاوازبێ . . لەڕی‌ی بە هەموو شوێنێکی لەشی‌یەوە دیار بوو . . سەروملی . شانەکانی . قۆڵ‌و باسکی . قاچ‌وقولی ، ئەژنۆکانی .

وتی : ئەمەیان کەڵکی نی‌یە . بەهەموو توانای خۆیەوە هەوڵی دا جومگە لێك‌ترازاوەکانی کۆ بکاتەوە تا توندوتۆڵ بوەستێ .

بە بەردەمی یەك ڕیزە چێشتخانەدا تێ‌پەڕی ، بێ‌ئەوەی سەیری ناوەوە بکا . لەدواییدا گەیشتە بەردەمی باڵەخانەیەك‌و چووە ژوورەوە . خۆی کوتایە ناو ئەسانسێرەکەو تا گەیشتە نهۆمی حەوتەم . ڕووەو هۆڵێك ملی‌نا . دەرگایەکی کردەوەو چووە ژووری – نەهێشتنی بێ‌کاری – جگە لەو بیست‌و چوار گەنجی دیکەی لێ‌بوو . لە قوژبنێکا هەڵتروشکاو چاوەڕی‌ی دەکرد نۆرەی بێ‌و بانگی بکەن . لەکۆتاییدا بە مەرامی خۆی گەیشت‌و پیرەژنێکی لاوازو بێ سەرو گوێ . پیرەژنێکی شوونەکردەی تەمەن پەنجا ساڵە لی‌ی پرسی :–

«– پێم‌بڵێ . . تۆ چ ئیشێك دەزانیت ؟»
بەسەرسامی‌یەوە وتی :–
«من نووسەرم !»
پیرەکچەکە لی‌ی پرسی :– «کەواتە تۆ خۆش‌نووسیت ؟ مەبەستت ئەوەیە ؟»

«بەڵێ . . من مەبەستم ئەوەیە بڵێم : دەتوانم بنووسم . .»
بەتوڕەیی‌یەوە وتی :–
«چ جۆرە نووسینێك ؟»
بەهاکەزایی وەڵامی دایەوە «پەخشان»
بێ‌دەنگی‌یەك‌و پاشان لی‌ی پرسی :–
«تۆ دەتوانیت ئامێری چاپ بەکار بێنیت ؟»
«هەڵبەت !»

پیرەژنەکە وتی :– «ناوونیشانی خۆت بنووسە . . گەر پێوستی کرد ئاگادارت دەکەینەوە . ئیمڕۆ بەیانی هیچ کارێك شك نابەین . . هەرگیز .»

لە ئۆفیسێکی دیکەش هەمان شت ڕوویدا . . تەنها ئەوە نەبێ ، لەبری پیرەژنێك کوڕێکی گەنج‌و لووت‌بەرز کە هەر لە بەراز دەچوو . . هەندێ پرسیاری لی‌کرد . لەوێوە چووە بەشی – عەمبارەکان – لەوێش هەر بەهەمان هەواوفیزەوە پێشوازیان لی‌کرد ، تۆزێ تەریق بۆوە . . لەکۆتاییدا هیچی دەست

نەکەوت . خۆی دڵسارد نەکردو گوێی پێ‌نەدا ، لەدڵی خۆیدا وتی ئەم بێ‌عەقڵی‌یە گوناهی من نی‌یە ، ئەم گەنجێکی

...ووەو پێوستی بە پارە هەیە تا بتوانێ بژی ، بێکارو پیشەش ...ە دەست ناکەوێ . . ئەوەتا کاریش دەست ناکەوێ .

ئەمەیان گرفتێکی ڕۆحی‌یەو بۆ دواجار دەیەوێ چارەی بۆ ...ۆزێتەوە . . ئەمێستا دڵی بەوە خۆشە کە مەسەلەکە کۆتایی ...ێ هاتووە .

لەهەموو ڕووێکەوە هەستی بەژیانی خۆی کرد . جگە لە چەند ساتێك بەولاوە . . تابڵێی ژیانێکی بێکەڵك‌و تام‌و ...هودەی بەسەر دەبرد . بەڵام ئێستا . . بۆ دوا جار بڕیاری دا ...ە وردو بەدیقەت بێ .

بەچەندەها کۆگاو چێشتخانەدا گوزەری کرد . . ڕووەو ...کۆمەڵەی گەنجانی مەسیحی – ملی‌نا . . لەوێ قەڵەم‌و ...اغەزێکی پەیدا کردو تیایدا داوای ئەوەی کرد کارێکی بۆ ...ۆزنەوە ، یەك سەعاتی ڕەبەق شتی نووسی . . کت‌وپڕ لەتاو ...سیەتی‌و هەوای پیسی ئەو شوێنە خەریك بوو ببوورێتەوە ، وا ...ند تەکانی دەدا . . هەر دەتوت مەلە دەکا ، بەپەلە ئەوێی ...جێ‌هێشت . لە پارکی مەڵبەندی شارەوانی‌دا کە دەکەوێتە ...رامبەر – پەرتووکخانەی گشتی – یەك لیترە ئاوی خواردەوە . . هەستی کرد هاتەوە سەرخۆی . لە ناوەڕاستی شەقامە کۆنکریتی‌یەکە پیرەمێردێکی بینی کە چەندەها کۆترو ...ورەس‌و مەلی‌تر بەسەر سەری‌یەوە هەڵدەفڕین . بەچەنگ نانە ...ردەی لەسەر پارچە کاغەزێك هەڵدەگرتەوەو زۆر کیبارانە بۆ مەل‌و فرندەکان هەلی‌دەدان .

وای بەخەیاڵدا هات داوای پارچە نانێك لەو پیرەمێردە بکا . بەڵام زوو لێی پەشیمان بۆوە ، چووە ناو پەرتووکخانەو بۆ ماوەی سەعاتێك – پرۆست –ی خوێندەوە ، پاشان . . دیسانەوە وای هەست کرد کەوتۆتە ژێر خەیاڵی خۆی . . دوور ڕۆیشتووە . . بەپەلە چووە دەرەوە . دەمی بە فوارەی ناو پارکەکەوە ناو ئاوێکی زۆری خواردەوە . . ملی‌نا . . دەبووایە ڕێگەیەکی دوور ببڕێ تا دەگاتەوە ژوورەکەی خۆی .

لە دڵی خۆیدا وتی : با بچمەوەو تێر بنووم . . چیتر هەیە بیکەم . . زانی زۆر هیلاکەو پێویست بەوەش ناکا بەدرۆ بڵێ : چاکم ، لەگەڵ ئەوەشدا بەمێشك وریاو زیندوو بوو . . هەروەك بڵێی مێشکی پارچەیەکی سەربەخۆ بێ‌و بوونێکی تایبەتی خۆی هەبێ ، یان سوور بێ لەسەر ئەوەی بێ‌ئەدەبانە گاڵتە بە ئازارو ژانی گەورەی جەستەی بکا . سەر لە ئێوارەیەکی زوو گەیشتەوە ژوورەکەی . . دەست‌بەجێ قاوەکەی خستە سەر ئاگر . قوتووەکە شیری تیا نەمابوو ، ئەو کەم شەکرەی هەفتەی ڕابردوو کڕی بووی . . تەواو ببوو ، کوپێکی لەو ئاوە ڕەش‌و گەرمە خواردەوە . . لەسەر پێخەفەکەی و ڕاکشاو زەردە لە لێوی دەباری .

دە–دوانزە کاغەزی‌نامەی لە مەڵبەندی گەنجانی مەسیحی دزی . . بەو ئومێدەی بتوانێ نووسینەکەی پێ تەواو بکا ، بەڵام ئێستا ڕقی لە نووسینە . هیچی نەبوو بینووسێ . کەوتە پۆلیش‌کردنی ئەو پێنسەی بەیانی دۆزییەوە ، ئەم کارە هیچە خۆشی‌یەکی زۆری پێ بەخشی ، هیچ پارەیەکی ئەمریکی بەقەد پێنس بریقە هەڵناهێنێ . ئاخۆ چەند پێنسی گەرەکە تا پێی بژی ؟ هیچی تری ماوە بیفرۆشێ ؟ سەیرێکی ژوورە ڕووت‌و بێ تفاقەکەی کرد . نەخێر . خۆ سەعاتەکەشی فرۆشت . . هەروەها کتێبەکانیشی . ئەو کتێبە نازدارانە ، نۆ دانەی بە هەشتاو پێنج (سێنت) فرۆشت ، لە خەفەتی ئەو کتێبانە هەستی کرد نەخۆشەو شەرم دایگرت . باشترین قاتیشی بە دوو دۆلار فرۆشت ، ئەوەیان قەیدی ناکا ، ئەوەندە گوێی بە جل‌وبەرگ نەدەدا . بەڵام بۆ کتێبەکان . . مەسەلەکە جیاوازە . لە خۆی پەست‌و زویر بوو . . هەستی کرد ڕێزی ئەو نووسەرانەی نەگرت کە

کتێبەکانیان نووسیوە .

پێنسە بریقەدارەکەی خستە سەر مێزەکە . وەك پیاوێکی قرچۆك بەخۆشی‌یەوە لێ‌ی ورد بۆوە . لەدڵی خۆیدا وتی : چەند بەجوانی زەردە دەیگرێ . . سەیرێکی کرد . . بەڵام بێ‌ئەوەی وشەکان بخوێنێتەوە . . ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – یەك سێنت – پێنسەکەی هەڵگێڕایەوەو سەیرێکی ئەودیوی کرد . . چاوێکی بە وێنەی – لینکۆڵن – کەوت . . ئەم رستەیەشی بەرچاو کەوت : «بروامان بە خوا هەیە . . سەربەستی ۱۹۲۳» لەدڵی خۆیدا وتی : چەند جوانە . . !

تەواو بێ‌هێزو خەواڵوو بوو . . هەستی دەکرد نەخۆشەو خوێنی سارد بۆتەوە . بەسەرسامی . . لەتەنیشت پێخەفەکەیدا وەستا . . جگە لە خەوتن هیچی شك نەدەبرد . دەرحاڵ هەستی کرد بەسەر زەوی‌یە نەرمەکەدا هەنگاوی گەورە دەنێ . . رووەو سەرەتا کەوتەوە مەلەکردن . . رووی نقومی نوێنەکە کرد . . لەدڵی خۆیدا وتی : دەبێ ئەم پارەیە بدەم بە منداڵێك ، ئەو دەتوانێ دەیەها شت بەتەنها پێنسێك بکرێ .

پاشان بەنەرمی ، بەجوانی ، بەسووکی ، هەر بەسەر جۆلانەکەشەوە بوو ، بەتەواوی لە جەستەی خۆی جیا بۆوە . بۆ ساتەوەختێك بوو بە زۆر شت : بوو بە باڵندە ، ماسی ، جرج ، مار ، مرۆڤ . هەزارەها وێنە بە بەرچاویا دەهاتن‌و دەچوون . . تاریك‌و بێ‌کۆتایی . . وەك دەریا شەپۆلیان دەدا ، شارێك دەسووتا . حەشاماتێکی بێ‌شومار کەوتبوونە هات‌و هاوار . زەوی دەخولایەوەو وەك بازنەیەك دوور دەکەوتەوە . . کە بە خۆی زانی . . . . وای کردووە . . رووە ونبووەکەی بەرەو ئاسمانی بۆش‌و بەتاڵ هەڵبڕی . . هەستی نەکرد زیندووە ، ئەمێستا بێ‌خەون‌و خەیاڵە ، بەڵام بێ غەوش‌و تەواوە .

**پەراوێز :–**

ولیەم سارۆیان دەڵێ :– «من زۆر بەئاسانی‌و بێ‌گری چیرۆکەکانم دەنووسم . . بێ‌ئەوەی ئازاری خۆم بدەم‌و بتلێمەوە . . چونکە زۆر کەس لەو باوەڕەدایە کە کاری نووسین پێویستی بەو ئازارو تلانەوەیە دەبێ . ئەوپەڕەکەی سێ سەعات بۆ نووسینی کورتەچیرۆکێك تەرخان دەکەم .» کەم کەس باوەڕ بەم قەسەیەی سارۆیان دەکا . ئەگەرچی ئەو سەدان چیرۆکیشی نووسیوە . . بەڵام لە هەموویاندا هەست بە ئازارو خۆخواردنەوە دەکەیت . . لەوە دەچێ کاتێکی زۆریشی پێوە کوشتبێ . . تامی چیرۆکەکانیشی لەو غوربەتی‌یە دایە کە سارۆیان وەك ئەرمەنێك – لە ئەمریکادا هەستی پێ دەکرد . خەمێکی تەنك‌وشیرین بۆتە کاڵای بەری چیرۆکەکانی .

سەرکەوتنی چیرۆکەکانیشی دەگەڕێتەوە بۆ هەواو میزاجی خۆی . نەك مەسەلەی لێ‌زانین‌و شارەزابوونی لە هونەری چیرۆکدا . ئەم چیرۆکەش کە لێرەدا کردوومانە بە کوردی : لەساڵی (۱۹۳٤)دا پاداشتی باشترین چیرۆکی ئەمریکی وەرگرت . پاداشتەکەش هەر بە ناوی (ئۆ . هێنری)یەوە رێکخرا کە یەکێکە لە چیرۆکنووسە چاکەکانی ئەمریکا . ساڵی (۱۹۳٤) بوو بە ساڵی دۆزینەوەی بەهرەیەکی بێ‌هاوتا . ئەو کاتەش سەردەمێکی تاریك‌و پڕ نوشوستی‌و هەرەسی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و ئەخلاقی بوو . بە هەزارەها گەنج بێ ئیش‌وکار دەسووڕانەوە . . (سارۆیان) یش بۆ ئەم چیرۆکە کەڵکی لە هەواڵی رۆژنامەیەك بینی کە نە گەنجێك دەدوا لە برساناو لە سان فرانسیسکۆ) مرد بوو . لەتەنیشتی‌یەوەو لەسەر مێزێك پێنسێکی بەجێ‌هێشتبوو . . لەسەر ئەو پارەیە نووسرابوو «ئێمە بروامان بە خوا هەیە . . بەسەربەستی . . ۱۹۲۳» لەسەر پارچە کاغەزێکیش نووسرابوو داوای ڕوخسەتێك بۆ ژیان – بەڵام هەندێ کەس ئەم چیرۆکە تێکەڵ‌وپێکەڵەی بەلاوە سەیرەو حەزی پێ‌ناکا ، بەس حەز دەکەم خوێنەر ئەوە بزانێ کە (سارۆیان) لەم چیرۆکەدا (تەوژمی هۆشی – تیار الوعي) بەکارهێناوەو کە ئەمەشیان شێوازێکە لەسەر دەستی (جەیمس جۆیس)و (فۆکەر)و (فرجینیا ولف) بناغەی داکوتا . زۆربەی چیرۆکەکانیشی پەیوەندی‌یان بە ژیانی نووسەرەوە هەیە . . ئەگەرچی وەك یاداشتیش نەینووسیوەتەوە . . بەڵکو ئەوپەڕی هونەرو جوانی تیا تواندۆتەوە . نووسەر پتر لەڕێگەی ڕۆژنامە فرۆشتنەوە ئاشنای هونەرو ئەدەب‌و ژیان بوو . . حەوسەڵەی قوتابخانەی نەبوو . . لەڕێگەی کتێبەوە خۆی فێر کرد .

لە نووسینێکی دیکەیدا دەڵێ :– «ئەو پیاوەی تۆ لەسەری دەنووسیت‌و دەیکەی بە پاڵەوان . . مەرج نی‌یە کارێکی گەورەو پاڵەوانانەی کردبێ . . ئەمەیان چیرۆکەکەی تۆ مەزن‌و نایاب‌تر ناکا . واز لە پاڵەوانەکەت بێنەو چی کردووە . . با هەر ئەوە بکا . . با وەك خۆی دەیەوێ بژی . وازی لێ‌بێنە با بڕوا . بدوێ بیر بکاتەوە ، بنوێ ، خەون ببینێ ، وەئاگابێ . دیسانەوە بڕوا . . دیسانەوە بدوێ . . بجوڵێ . . بژی . . . . .هتد .»

ئەوەی شایانی باسە (ولیەم سارۆیان) لەساڵی ۱۹۰۸)دا و لە (کلیفۆرنیا) لە دایك بووە . . دایك‌و باوکی لەو ئەرمەنی‌یانەن کە لە (روسیا)ەوە بەرەو ئەمریکا کۆچیان کرد . . وا بزانم هەمووی چەند ساڵێکە مردووە .

لە کتێبی

Contemporary Short Stories
Representative Selections
Edited by Maurice Baudin JR.
Volume One
New – york

لاپەڕە (۱۲۱-۱۱۵)

## لە ئاسۆی هونەری جیهانیدا

### هونەرمەندی بلیمەتی هونەری گرافیکی ئالمانی

# دیـــــورەر

نووسینی مێژوو نووسی سۆڤیەتی : چگادایف
وەرگێرانو ئامادەکردنی لە رووسی‌یەوە : محمد عارف

هونەرمەندی ئەلمانی بلیمەت (ئەلبرێخت دیۆرەر) لە ـنیکی سەختی مێژووی ئەلمانیادا . لەکۆتایی سەدەی پازدەمین ـدەتە گۆرەپانی هونەری‌دا .

هونەرمەند لەو دیاردە هەڵکەوتوانەیە وەك داهێنەرێکی ـەزن لەکاتی رووخانی سەدەیەكو هاتنی سەدەیەکی تازەدا . لە ـەمانی تاریکدا بەتیشکی هونەری نەمری گۆرەپانو جوولانەوەی هونەری روون دەکاتەوەو دەیژێنێتەوە . دیۆرەر ـەرهەمەکانیدا شۆرشێکی هونەری تازەی درووست کردووەو ـۆر شتی لە بنکەو بناغە کۆنەکانی گۆری‌یوە . بەرهەمی هونەرمەند ـوزی جوانی دەروونیو روخساری مرۆڤی بەرجەستە کردوە . ـیە هونەرەکەی بە یەکێك لە لووتکە هەرەبەرزەکانی رینیسانسی ئەلمانی ژماردراوەو بەبەرهەمی هونەرمەندە ـیمەتەکانی رینیسانسی ئیتالی بەراوردی دەکرێ .

هونەری دیۆرەر ، مۆرکێکی نەژادی نەتەوایەتی ئەلمانی هەڵگرتبوو ، ئەم شتەش ببوە هۆی پتەو بوون داکوتانی رەگ‌و ریشەیەکی قوول کە بتوانێ بەسەربەرزی‌یەوە بەرامبەر هەموو جوولانەوەی هونەری ئەوروپی بوەستێ .

دیۆرەر بە ووردی‌و دڵسۆزانە هونەری کلاسیکی‌و رینیسانسی خوێندوەو سوودی لێیان وەرگرتووە . بەڵام مامۆستای مەزنو راستەقینەی هونەرمەند سرووشت بووە .



دیۆرەر . پۆرترێتی هونەرمەند ١٥٠٠ ز



دیۆرەر . چوارسوار . نیگارێکی گرافیکی . ١٤٩٨ ز

باشترین بەڵگەمان : ئەم هەموو لێکۆڵینەوە هونەری‌یانەی هونەرمەند بەجیٚ‌ی هێشتوون کە زۆر لایەنی هەمە جۆری گرتوەتەوە وەك : مرۆڤ . دیمەنی سرووشت . دارو درەخت ئاژەڵ . بێجگە لە لێکۆڵینەوەی تیۆری بە تایبەتی لە زانستی ئەناتۆمی : (تشریح) . کە چەند ساڵێکی لە ژیان بۆ تەرخان کردوە .

دیۆرەر لەساڵی ١٤٧١دا لە شاری : (نیورنبیرگ) لە خێزانێکی زێڕەنگر لە دایك‌بووە . یەکەم بنکە هونەریەکانی لەسەر دەستی باوکی‌و مامۆستای هونەرمەند : (ڤوولگیموت)ی خوێندوەو لە پاشان بەمەسی گەشت‌و خوێندن چووەتە خواروی ئەلمانیاو نەمساو ئیتالیا . بەرهەمە سەرەتایی‌یەکانی دیۆرەر بریتی بووە لە کۆمەڵێك بنیادو هێلکاری‌و گرافیك‌و پۆرترێتی خۆی کە بینەر دەتوانێ دەست نیشانی ڕێبازی هونەری دوا ڕۆژی بکات .

گەورەترین پرۆژەی هونەرمەند لەم قۆناغەدا بریتی بوو لە زنجیرەیەکی نیگاری گرافیکی کە لە پازدە بەش پێك هاتبوو . ئەم گرافیکانە لە ساڵی ١٤٩٨دا لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەك بەزمانی ئالمانیاو لاتینی بە شێوەی ئەلبۆم دەرچوە .

باشترین نموونەی ئەم زنجیرەیە گرافیکی ناو : (چوار سوار)ە .

ئاستی بەرزی دەربڕینی زەمینەی سەدەی هونەرمەندو فەلسەفەو ئێستاتیکای ئەو کاتە بەجۆرێکی جوان‌و قەشەنگ لەم گرافیکەو بەرهەمەکانی‌تری هونەرمەند دەربراوەو بەم شێوەیە دیۆرەر توانیویەتی بایەخێکی مەزن‌و پایەکی جیهانی بۆ هونەری گرافیك بچەسپێنی‌و لە تەنیشت هونەری نیگارکێشان‌و پەیکەرتاشی دایمەزرێنی .

دیۆرەر لە نۆهەدەکانی سەدەی پازدەمین‌دا زنجیرە پۆرترێتێکی نایاب دروست دەکات لەوانە : دوو پۆرترێتی باوکی‌و دوو پۆرترێتی خۆی . لەم بەرهەمانە هونەرمەند لاپەرەیەکی تازەی لە هونەری پۆرترێتی ئەلمانی کردوەتەوە ئەوەیش بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤی کردوەتە سەنتەری بایەخی مرۆڤایەتی دوور لە زەمینەی ئایینی سەدە ناوەنجی‌یەکان‌و پۆزە کۆنەکانی . فەلسەفەی ئێستاتیکی هونەرمەند ڕووی لە دەربڕینی مرۆڤ . بەتایبەتی مرۆڤی داناو زاناو بیرکەرەوەو – مامە خەمە – لە زەمینەیەکی ئالۆزو چاوەڕوان کردنی گۆڕانێکی گەورەدا کردوە . لەساڵی (١٥٠٠)ەوە . قۆناغێکی گرنگ لە

ـزنی دیۆرەر دەست پێ دەکات . ئەوەیش بریتی بوو لە
هەوڵدانو گەڕانێکی سەخت بەدوای ڕاستیو کاکڵی هونەرداو
پێشکەش کردنی بەرهەمی تازە . کە لە ئەنجامی
لێکۆڵینەوەیەکی قوول درووست کرابێ . هونەرمەندی مەزن
ـریکەی دەساڵ خەریکی نووسینو لێکۆڵینەوەی تیۆری بووە کە
ـە ئەنجامدا لە سێ پەرتووکی بەنرخ نووسیویەتەوەو نازناوی :
(دەربارەی ئەندازەکانی لەشو ئەندامی مرۆڤ)ی هەڵگرتوە .
ـە ڕووی بەرهەمی هونەری یەوە بەرزترین نموونەی ئەم قۆناغەی
پۆرترێتی هونەرمەندە کە لە ساڵی ١٥٠٠دا درووستی کردوە .
ـەم پۆرترێتەدا هونەرمەند خۆی بە شێوەیەکی راستەو خۆو ڕوو
ـەڕوو دوور لە شتی زیادو پاشەکی ی سەر لێ شێوێن . دەبڕ بوەو
ئەو خاڵە گرنگەی بەرجەستە کردوە کەدەوڵەمەندی دەروونی و
جوانی ڕووخسار یەك دەگرنەوە . هونەرمەند لە نێوان ساڵانی
١٥٠٠-١٥٠٤دا زنجیرە نیگارێکی گرافیکیو هێلکاری
دەربارەی ئێستاتیکای لەشو ئەندامی ژنو پیاو دروست کردوە
وبەرهەمی ناو : (ئادەمو حەوا) لووتکەی بەرزی جموو جۆڵی
ئەم قۆناغەی بەرجەستە دەکات .

بێجگە لەمە هونەرمەند ڕووی لە مرۆڤی زاناو فەیلەسوفو
ڕۆشنبیران دەکات کە ژیانیان بۆ کامەرانی مرۆڤ تەرخان کردوەو
زنجیرەیەکی نایابی پۆرترێتیان بۆ دەکاتو لەدواییدا بەرەو
سرووشتو دارو درەختو ئاژەڵ دەرواو لە ڕێگای بنیادو
هێلکاری یەوە . کەرەستەی گالیری یەك لە سکێچو
لێکۆڵینەوەی هونەری کۆ دەکاتەوە . کە ئێستا بە سامانێکی
گەورەی هونەری ئەڵمانیا دادەندرێ .

دیۆرەر لە ساڵی ١٥٢٠-١٥٢١دا گەشتێکی هونەری لە
(نێدەرلاند) کردوە و زۆر بەووردی سەیری بەرهەمی
هونەرمەندەکانی کردوەو سەرنجەکانی خۆی لە دەفتەری
یادگارەکانی نووسیوەتەوە . ئەوەی شایانی باسە . هونەرمەند



دیۆرەر . سواری مەرگ ودێو ١٥١٣ ز

نەکەوتوتە ژێر کارتی کردنی هونەری نیدەرلاندیو لە ڕێبازی
تایبەتی خۆی بەردەوام بووە . نیگاری دوو قۆڵی بە ناوبانگی
هونەرمەند : (دوو قەشە) کە مۆرکێکی مەنوومێنتیو کەلەرتێکی
بێ هاوتای بەکارهێناوە بە دوا بەرهەمی هونەرمەند دادەندرێ .
پاش دووساڵ لە دوای تەواو کردنی نیگاری باسکراو واتە لە
ساڵی ١٥٢٨دا . هونەرمەندی بلیمەت کۆچی دوایی کردوە .

# خوێن گواستنەوە

**(Blood Transfusion)**

دکتۆر عادل حسین عبداللە

لەشی مرۆڤ نزیکەی (٥-٦) لیتر خوێنی تێدایە ، ئەم خوێنە کە خواردەمەنیو گازی ئۆکسجین ئەگەیەنێ بەگشت خانەو ئەندامەکانی لەش ئەگەر هاتوو کەم بووەوە ئایا لەبەر خوێنبەربوون یان کەمخوێنی بێ ئەوا کارێکی خراپو راستەوخۆ ئەکاتە سەر لەش بەتایبەتی مێشکو کۆئەندامە زیندەکانیتر ، لەوانەشە ببێتە هۆی مردن ئەگەر زوو خوێن نەگواسترایەوە بۆ لەشی نەخۆش .

قەوارەی خوێنی کەمبوو یان وونبوو راستەوخۆ دەگونجێ لەگەڵ مەترسی مردن یان بێهۆش بوون ، وونبوونی قەوارەیەکی زۆر خوێن رێژەی مەترسی زۆر بەرز ئەکاتەوە .

ئەو خوێنەی بۆ گواستنەوە بەکاردەهێنرێ لە لەشی مرۆڤێکی ساغ وەرئەگیرێ (ئەکێشرێ) ، هەر چەندە ئەتوانرێ خوێن لە لەشی مرۆڤێکی تازە مردووش بکێشرێ بەڵام پەسند نییە لەم ساتەدا .

**کێ ئەتوانێ خوێن ببەخشێ ؟**

بێگومان هەر کەسێك ناتوانێ خوێن ببەخشێ ، ئەو کەسەی کە هەڵئەبژێررێ بۆ خوێن بەخشین ئەبێ لەشی ساغو دروستبێو رێژەی هیمۆگلۆبینی خوێنی کەمتر نەبێ لە (٨٠٪ - ٨٥٪) ، وە نابێ هیچ نەخۆشیەکی درمی (Infectious diseases) هەبێ . هەروەها ئەو کەسەی خوێن ئەدات نابێ هیچ یەکێك لەم نەخۆشیانەشی هەبێ وەکو :-

لەرزوتا (مەلاریا) - سیفلس (Syphilis) - بەرزبوونەوەی تەوژمی خوێن (Hypertension) - هەوکردنی جگەر (Hepatitis) .

**چۆنیەتی خوێن کێشانو گواستنەوەی**

ئەو کەسەی خوێن ئەبەخشێ ئەبێ لەسەر پشت پاڵکەوێ بەرێگای دەرزی خوێنهێنەر خوێنی لێ ئەکێشرێ بەمەرجێك قەوارەی ئەم خوێنە زیاتر لە نیو لیتر (٥٠٠سم³) .

پاش خوێن کێشان ئەو کەسە ئەبێ بۆ ماوەی (١٥) دەقیقە پاڵکەوتوو بێو پەرداغێك شلەش بخواتەوە ئینجا هەڵسێ . ئینجا جۆری ئەم خوێنە دیار ئەکرێ لە تاقیگەدا کە ئەبێ لە هەمان جۆری خوێنی نەخۆش بێ ، پاشان ئەو خوێنە بەرێگای

خوێنهێنەری بازوو ئەدرێتە نەخۆش بەهێواشی وە واچاکترە کە
رووی چەپی نەخۆش بەکاربهێنرێ بۆ ئەم مەبەستە وە لەژێر
چاودێری پزیشك .

**پێویستی خوێن گواستنەوە**

خوێن گواستنەوە پێویستە بۆ چارەسەرکردنی هەر نەخۆشیەك کە ئەبێتە هۆی کەمبوونەوەی قەوارەی خوێن یان یەکێك لە بەشەکانی خوێن وەکو :- خرۆکە سوورەکانی خوێن (RBC) - خرۆکە سپیەکانی خوێن (WBC) - پلازما (Plasma) - پرۆتینی خوێن - کاریگەرەکانی مەیینی خوێن . گەلێك جار نەخۆش رزگاری ئەبێ لە مردن ئەگەر پێویستی بە خوێن بوو وە زوو بۆی گواسترایەوە .

ئەو نەخۆشیانەی پێویستیان بە خوێن گواستنەوە هەیە بریتین لە :-

١ - خوێن بەربوون (Bleeding) : هەروەکو رووئەدات لەکاتی برینداربوونو کارەساتو شکانی ئێسقان بەهۆی هێزێکی دەرەکی .

٢ - کەمخوێنی (فقر الدم (Anaemia : کە ئەبێتە هۆی کەمبوونەوەی رێژەی (ژمارەی) خرۆکە سوورەکانی خوێن کەمتر لە رێژەی ئاسایی .

٣ - کەم بوونەوەی ژمارەی پلێتەکانی خوێن (اقراص الدم) (Thrombocy topenia)کە لەگەڵێك نەخۆشیدا بەدی ئەکرێ ، هەروەها گەلێك دەرمانیش ئەبنە هۆی ئەم نەخۆشیە .

٤ - کەمبوونەوەی رێژەی شلەی پلازمای خوێن کە بەدی ئەکرێ لەکاتی سووتان ، بەتایبەتی پلەی یەکەمو پلەی دووەمی سووتان .

٥ - لوە پیسەی خوێن (سرطان الدم Leukuemia) کە ئەبێتە هۆی زیادبوونی ژمارەی خرۆکە سپیەکانی خوێنو کەم بوونەوەی رێژەی خرۆکە سوورەکانو پلێتەکانی خوێن .

٦ - هیمۆفیلیا (Haemophelia) کە بریتیە لە خوێن بەربوون لەبەر کەمبوونەوەی چەند کاریگەرێکی مەیینی خوێن (Clotting Factors) .

٧ - چەند نەخۆشیەکی گورچیلە کە ئەبنە هۆی زیاد دەردانی پرۆتینی خوێن لە میزدا بە تایبەتی ئەلبۆمین (Albumin کە رێژەکەی کەم ئەبێتەوە لە خوێندا .



**مەترسیەکانی خوێن گواستنەوە**

گەلێك تەنگەو چەڵەمە لە ئەنجامی خوێن گواستنەوەدا پەیدا ئەبن لە نەخۆشدا کە هەندێکیان سادەو هەندێکیشیان ترسناکن . لە تەنگەو چەڵەمە سادەکان وەکو :- هەست کردن بە سەرما - بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی خوێن (Hyperthermia) - رەنگ زەردبوونێکی سادە (زەرتکێکی سادە) (Mild Jaundice) .

هەندێ جار تەنگەو چەڵەمەی گەورەو ترسناك پەیدا ئەبن لە پاش خوێن گواستنەوەدا بە تایبەتی ئەگەر هاتوو کۆمەڵە خوێنی (صنف الدم) هەردوو خوێنبەخشو نەخۆشی جیابوون واتە بە هەڵە خوێن بدرێ بە نەخۆشیو لەوانەشە مردن رووبدات ئەگەر زوو نەخۆش فریای نەکەوێت .

مەرج نی یە کە تەنگ و چەڵەمە رووبدات لە ئەنجامی لەیەك نەچوونی کۆمەڵەکانی خوێن . گەلێك جار کۆمەڵەی خوێنی نەخۆش و خوێنبەخش (متبرع) لە یەك شێوەن بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە زۆر گیروگرفت بێنەرێ کە لە خوارەوەدا یەکە یەکە باس ئەکرێن :-

**۱ - هەستیاری (Allergy)** :

گەلێ جار نەخۆش پاش خوێن وەرگرتن رەنگی سوور هەڵئەگەرێ و گشت لەشی ئەخورێ و هەناسەی تەنگ ئەبێ و هەست ئەکا بە سەرئێشە (ژانەسەر) و لای وایە ئەخنکێ . پاشان لەرزوتاش ئەیگرێ وە لەوانەشە بێهۆش بێ و بمرێ بەتایبەتی ئەگەر کۆمەڵەی خوێنی نەخۆش و خوێنبەخش جیابوون واتە بە هەڵە خوێنی پێ درابێ .

لێرەدا نەخۆشی ئەبێ یەکجلو زوو چارەسەر بکرێ ئەگینا ژیانی ئەکەوێتە مەترسییەوەو لەمردن زۆر نزیك ئەبێتەوە .

**۲ - لەکارکەوتنی دڵ (عجز القلب Heart Failure)**

لەکارکەوتنی دڵ هەندێ جار روودەدات لەبەر زیادبوونی قەوارەی خوێنی نەخۆش لە ئەنجامی خوێن گواستنەوە بە پەلە بۆ لەشی نەخۆش . بۆیە وا چاکترە کە خوێن بە هێواشی و لەسەرخۆ بدرێ بە نەخۆش تاکو دوچاری ئەم جۆرە گیروگرفتە نەبێ .

۳ - زیاد بوونی رێژەی پۆتاسیۆم لە خوێندا (Hyperkalemia) : ئەمەش روودەدات ئەگەر هاتوو خوێنی کۆن (خوێنی هەڵگیراو) بدرێ بە نەخۆش واتە کاتێکی دیاری کراوی بەسەر کێشانی دا تێپەڕبووبێ . ئەمەش ترسناك ئەبێ ئەگەر هاتوو نەخۆش چەند ناتەواویەکی هەبێ لە گورچیلەدا .

**٤ هەوکردن (Infection)**

هەوکردن بە میکرۆبی مەلاریا - سیفلس - وە میکرۆبی هەوکردنی جگەر گەلێك جار لەگەڵ خوێن ئەگوازرێتەوە بۆ نەخۆش ئەگەر هاتوو خوێنبەخش بەکتریا یان ڤایرۆسی لە خوێندا هەبوو . وەنەخۆشی دووچاری هەوکردن ئەبێ .

**٥ - کەمبوونەوەی رێژەی کالسیۆم لە خوێندا** (Hypocalcemia) : ئەمەش زۆر جار بەدی ئەکرێ بەتایبەتی لەو نەخۆشانەی زۆر جار خوێنیان بۆ ئەگوازرێتەوە . بەلاَم زۆر ترسناك نیە بۆ نەخۆشی .

**٦ - تێکچوونی باری گورچیلە** :

پاش خوێن گواستنەوە بۆ نەخۆش کە خۆی ناتەواوی هەبێ لە گورچیلەدا . ئەوا گورچیلەکانی زیاتر تێك ئەچن و ئەشێوێن .

**تاقت کردنی خوێن**

خوێن بەپێی توانا ئەبێ راستەوخۆ پاش کێشانی بە تازەیی بدرێ بە نەخۆش . بەلاَم لەبەر چەند بەرژەوەندیەك خوێن پێویستە تاقت بکرێ و هەڵبگیرێ تا کاتی پێویست .

خوێن ئەتوانرێ تاقت بکرێ بۆماوەی (۲۰) رۆژ پاش کێشانی چونکە خرۆکە سوورەکانی خوێن پاش تێپەڕبوونی (۲۱) رۆژ تێك ئەشکێن و ئەمرن و ئەو خوێنە سوودی گواستنەوەی نامێنێ .

خوێن ئەبێ تاقت بکرێ لە ناو بەفرگردا (ثلاجة) لە پلەی گەرمی (٤س)ە وە نابێ بیبەستێ لە [illegible] . خوێن بەگۆرانی پلەی گەرمی و تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر بەسەر کێشانیدا دوچاری زۆر گۆران ئەبێ وەکو :- شی بوونەوەی خوێن (Hemolysis) - مردنی خرۆکە سوورەکانی خوێن - زیاد بوونی رێژەی پوتاسیۆم - تێك شکانی پلێتەکانی خوێن (Thrombocytolysis) - لە ناوچوونی خرۆکە سپیەکانی خوێن - جگە لەمانەش خوێنی کۆن نەخۆش زیاتر دوچاری هەوکردنی جیا جیا لە لەشدا ئەکات بەتایبەتی هەوکردنی ڤایرۆسی .

**سەرچاوەکان**


1 – Davidson . 1980.

2 – Clinical Hematology. K. S. willton 1983.

3 – Merck. Hematology chapter. 1978.

4 – Hanbox's Manual of Hematology 1981.

# پیك و پەترمە (١) (٢)

بەرهەڤکرنا : شەمال عبداللە مفتی
ماجستێر ل زانیاریا کشتوکالی

جوتیارو رەزڤانێن کورد ل هەمی دەڤەرێن کوردستانێ کارێ پەترمە کرنێو پیك لێدانا دارا دزانن . و گەلەك د پەلەوانن د ڤی کاری دا . ژ بەر کو ژیارا مللەتێ کورد ژیارا چاندنێو ئاڤەدانیێ یە وەلاتێ وان ولاتەکێ تێر شینکاتیو داروبارە .

ڤێجا بێی پلا زانستیێ وان شەهرەزایی یا لێ پەیدا کریو ئەگەرێن سروشتی ئەڤ پەلەوانیە یا ل سەر سەپاندی .

چ پەترمە بیت ئان پیك لێدان بیت رامان هەر ئێکە . ئەو ژی بلند بونو چێتر بونا بەریێو پارستنا دارو باریێە .

ل ڤی گوتاری دێ ل سەر هەر دوو رەنگا پەیڤین . هیڤی دکەین خویندەڤان مفای ژێ وەرگرنو بکارن ب ڤی کاری رابن چ ل رەزا بیت ئان ژی ل باخچێ مال بیت .

**یەکەم پیك کرن** :

پیك دهێتە چێکرن ژ پرتەکا گیاندار ژ دارەکا ساخلەم و ب هێزو پڕ بەرو بشکوژەکا شین ب وێ پرتێڤە هەبیت . دێ وێ پرتێ ڤەگوهێزن ب هەلکولانا رەخێن وێ ب کێرەکا تیژو ل دارەکا دی دەین یا کو مە د ڤێت گوهرینێ ل بەرێ وێ بکەین ئان ژی پلا وی بەری پڕ زاخ کەینو بلند کەین .

لێ دڤێ ئەو دارا ئەم پیکێ ژێ هەلدبژێرین دگەل ئەوا پیکێ لێ ددەین توخمەك بن یان - خانەك بن - و پەسەنێن وان ئێك بن .

وەکی مێوەکا ترێ (سادانی) پیکەکا ترێ (تایفی) لێ دەین . ئان هژیرەکا (ئەرزنی) ب پیکەکا هژیرا (بێناتی)پیك کەین . ل پەترمێ ژی هەر وەسا ڤێت توخمەك بن .

- **مفایێ پیك کرنێ** :

١) بو گوهرنیا پەسەنێن بەرێ دارێ ئەوا نە ژ رەنگو نە ژێ هاتیو چێ کرنا وان .

٢) ب هێز کرنا دارەکا بێ هێز

٣) بو خوگرتنا دارێ دژی ئەگەرێن سروشتی یێ دبێ یەمان . ئان رزگار کرنا دارێ ژ هندە نەساخیاو گیاندارێن بـزیان .

٤) بەلی کرنا نەساخێن فایروسی - Idexing - د رێکا پیك

کرنیٚ ڕا ئەڤیٚ مالکیٚ ژی خویندکاریێن کشتوکالی مفای ژیٚ دکەن .

دەمیٚ ئەم دەست ب پیك کرنیٚ دکەین دەڤیٚ ئەڤان خالێن خاریٚ ژبیر نە کەین :

أ) دڤیٚ پیکا خو ژ دارەکا موکم‌و خورستی‌و ساخلەم‌و تێر بەر وەرگرین .

ب) پیکیٚ ژ تایەکیٚ ژیٚ هاتی‌و پیٚ گەهشتی‌و ژ ناڤەراستیٚ وەرگرین .

جـ) ل دەمی شین بون‌و ئاڤ تیٚ گەریانا داریٚ بیت (بهاربیت)

د) ئەو تاییٚ پیکیٚ ژیٚ ڤەدکەین‌و یاییٚ پیکیٚ لێدەین ژلاییٚ ستویراتییٚ ڤە هندی ئێك بن .

– **رەنگێن پیکا** :

پیك ب گەلەك رەنگا دهێتە لێدان . ل ڤێریٚ مە هندە رەنگێن مشە . هەلبژارتن وەکی :

١) پیك لێدان (زری)[٣] یا وەکی ڤیٚ پیتیٚ (T)

٢) پیك لێدانا وەکی پنی‌کرنیٚ .

٣) پێك لێدانا خەلەکی .

٤) پیك کرنا (زری) یا وەکی ڤیٚ پیتیٚ (H)

٥) پیك کرن ب رەنینا تیڤلی .

پشتی ویٚ داریٚ هەلدبژێرین یا کو دیٚ پیکیٚ ژیٚ وەرگرین دیٚ پرتەکا ب بشکوژ چاڤ کەین‌و دیٚ هێین د سەر بشکوژیٚ ڕا ب ئاسویی بریندار کەین پاشی ل هەر دوو رەخێن بشکوژیٚ ب ستوینی دیٚ بریندار کەین‌و کەینە خیچ ب‌خاری نێزیکی (دوو)سم تا هەر دوو خیچ ل بنی د گەهنە ئێك وەکی سیٚ کوژەکیٚ لیٚ دهێت بنا بنیٚ وی پیٚ ل سلاڵ بیت‌و سەریٚ و پیٚ تیژ ل بنی بیت‌و بشکوژ ب کەڤیتە د نیڤەکا وی دا .

پاشی دیٚ وان خیچێن بریندار کری هەلکولین تا پیکیٚ ژی د ئینینە دەر .

نهو دیٚ هێینە سەر دارا دوییٚ یا کو مە د ڤێت پیکیٚ لێدەین دیٚ تویکلیٚ ویٚ ب ڤی رەنگی (T) بریندارکەین وەسا کو هندی پیکیٚ بیت . دیٚ پیکا سیٚ کوژی ئینین کەینە دبن وی تیڤلیٚ مەبری ڕا . وەسا کو لێڤا سیٚ کوژییٚ ئاسوییٚ ب کەفتە سەر خیچا (T) یا ئاسویی و سەریٚ ویٚ پیٚ تیژ ب کەفتە سەر سوییٚ خیچا ستوینی . دڤیٚ ل ڤی کاری د دەست سڤك و زێرەڤان بین چ زیانیٚ نە گەهینینە بشکوژا نەبشکفتی . هێدی دیٚ تیڤلیٚ بری هەلدەین‌و پیکیٚ دانینە د جهیٚ ویٚ دا . پاشی دیٚ لێڤێت تیڤلی زڤرینە ڤە سەر . پشتی هینگیٚ دیٚ وی جهیٚ پیك لێدای موکم گرێدەین چ ب بەندکی بیت ئان ب تیڤەرێزەکا پاتەی بیت . ئان ژی ب داڤێن نایلونی ئان ب تیڤەرێزەکا جەوی کری بیت . لیٚ دڤێت ژبیر نەکەین ل بشکوژیٚ دهشیار بین نەکەینە دبن بەندکا ڤە . بلا یا دیار بیت‌و سەر بخو بیت دا بکاریت خو ژێك راکێشیت‌و شین ب بیت . ئەڤ رەنگیٚ پێك لێدانیٚ ب کێر خوخ و مژمژا د هێت .

## ٢ – پیك کرنا وەکی پنی کرنیٚ :–

ئەڤ رەنگیٚ پیك لێدانیٚ د هێتە چیٚ کرن بو وان دارا ئەوێن ستویر وەکی داریٚ گویزیٚ‌و بەروییٚ .

ل ڤێری دیٚ هێین دوو خیچا ئاسویی بریندار کەین ل ئەڤرازو نشیڤا بشکوژیٚ یا کو مە د ڤێت بکەینە پیك دویراتیا هەر دوو خیچا نێزیکی (٤سم) . دیسا دوو خیچێن ستوینی ژی ل هەر دوو رەخێن بشکوژیٚ برین‌دارکەین تا کو هەر چا خیچا دکەینە چار کوژەك کو بشکوژ بکەڤتە د نیڤەکیٚ دا . دیٚ ب سەریٚ چەقوکا تیژ . چارکوژیا خو ئینەدەر . پاشی دیٚ چارکوژەکا هندی ئەوا مە بری ل سەر تاییٚ ویٚ داریٚ ئەوا مە د ڤێت پیکیٚ لێدەین . دیٚ خیچ کەین‌و تیڤلی ژیٚ ڤەکەین . دیٚ هێین پیکا خو ئینین‌و ئێخینە وی جهیٚ مە ژ تیڤل کری‌و دیٚ پێڤە پەچریمە کەین‌و موکم ب داڤا گرێدەین . دیسا سەریٚ بشکوژیٚ هێلینە ل دەرڤە .

## ٣ - پیك کرنا خەلەکی :

ل ڤی رەنگی دی خەلەکەکیٚ کەینە پیك ئانکو دورمەندوێن




بشکوژێ دێ وەکی خەلەکێ برین . هەر وەسا ل سەر تاپێ وێ دارا پیکێ لێ ددەین دێ هندی وێ تیڤلی ژێ کەین . دێ پیکا خەلەکی ئێخینە جهێ وێ . ل ڤێرێ مهانایە کو ستویراتیا هەردوو تا پێ ئەم پیکێ ژێ وەردگرین و پێ ئەم پیکێ ل ددەین - هندی ئێك بن . دا کو خەلەك وەکی گوستیرێ ب کەفتە جهێ خو ب درستیو نە لڤیت .

**٤ - پیك کرن ب رەنینێ :**

ئەڤ رەنگێ پیك لێدانن د هێتە بکار ئینان بو وان دارا ئەوێن مروڤ نەشێت (تیڤلی)[٤] و (تویکلی)[٥] ب ساناهی ژێك جودا کەت . وەکی دارا مێوێ کو تیڤلێ وێ پێ ترتریە و دبیتە داڤزك .

دێ هێین برینەکا کویر ل قورمێ وێ دارێ کەین یا مە دڤێت پیکێ لێ دەین ژ سلاڵ بو خارێ . درێژیا وێ برینێ نێزیکی (٥-٧)سمو ل بنێ وێ دێ خیچەکا ئاسوپی بریندارکەین وەسا کو تیڤلو تویکلێ بن تیڤلی پێکڤە رابن . هەر ب وی رەنگی دێ پیکا مە ژ دارەکا دی چاڤ کری وەرگرین .

لێ ل ڤێری ڤێت ژ بیر نەکەین کو بشکوژا پیکێ ل لاپێ بنی بیتو دێ وەکی هەرجار گرێدەین . یا باش ئەوە ئەڤ رەنگێ پیك کرنی ل بهارێ ئان ل دویماهیا زڤستانێ ب هێتە چێ کرن .

پشتی ئەم دارێ پیك دکەینو گرێدەین دێ هێلین نێزیکی (٢-٣) حەفتیا پاشی دێ گریدانا وێ ڤەکەین . هەکە بشکوژ کەسك بو و وەکی باقوڤێ لێ هات دیارە دێ بشکڤیتو پیکێ جهێ خو پێ گرتیو یا باشە . پشتی د بیتە تەرحەو درێژیا وێ د گەهتە (٥-١٠)سم دێ تاپێن کەڤنو بێ هێز ژ دارێ برین دا کو تەرحێ نوی ب هێز بکەڤیت دیسا دڤێت چاڤێ مە لێبیت کو خار نەبیتو یا باش‌تر ئەوە بەندکی ب، کەینیێو ب تایەکێ خورستی ڤە گرێدەین هەکە تەرحا پیکێ هندی تاپێ بەرێ - ئەصلی - لێهات ئەم دشێن پێ کەڤن ب ئێك‌جاری ب برین . هەکە مە نەڤێت ژی ئەم دکارین پێلین وەکی گەلەجارا ئەم دارا دبینین هەر تایەکێ وێ بەرەکە پێ جودا ژپێ دی . وەکی دارەکا (کەزانێ) تایەك (فستەق) بیت ئان (بێملك) بیت .ئان دارەکا (توپێ) تایەکێ وێ (توی شەمبی) بیت ئان هەر دوو تا سێڤ بن

لیٚ هەر ئێك توخمەك بیت بو نمونە ئێك (سێڤ خانك) بیت بیٚ دی (سێڤ جانی) بیت .

- **وەرزیٚ باش بو پیلك کرنیٚ** :-

هەر توخمەکیٚ دارا وەرزەك دڤێت بو نمونە دارێن ترش وەکی (پرتەقالا) و (نیموکا) وەرزیٚ بهاریٚو هەیڤا ئاداریٚو گولانیٚ یا باشە بو پیلك کرنا وان - دیسا پایزەکا زوی یا باشە . دارا زەیتوونیٚ هەیڤا ئاداریٚ یا بو باشەو هەتا چریا ئێکیٚ دیسا ل هەیڤێن هاڤینیٚ . دارێن بەلك وەرین یانکو ئەوێن بەلگێن خو ل زڤستانیٚ دوەرینن . بهارو دیماهیا هاڤینیٚ دیٚ یا باش بیت بو پیلك کرنا وان . هەر وەکی مە دیتی وەرزیٚ بهاریٚ ئان بیٚ پاویزیٚ بیٚ باشە کو مروڤ ب ڤی کاری رابیت . لیٚ پیلك کرنا پایزیٚ چیٚترە ژ یا هاڤینیٚ ژبەر ڤان ئەگەرا :

١ - دەمیٚ شین بونو خوگرتنا پیکیٚ ل پایزی درێژ ترە ژ بهاریٚ ڤێجا هەکە هات و پیلك شین نەبو مە دەراڤیٚ هەی ئێکا دی لیٚ دەین .

٢ - ل پایزیٚ پتر تایێن هێڤەو وێڤە ب دەست دکەڤن کو مروڤ بکاریت مپکا ژیٚ وەرگریت .

**دووەم : پەترمە کرن (Grafting)**

رامان ژ پەترمیٚ هەر وەکی پیکیٚ یە لیٚ چیٚکرنا ویٚ یا جودا یە .

ل پەترمە کرنیٚ دیٚ پرتەکا تایی ئانکو تەرحەکیٚ تای ژ دارەکیٚ وەرگرین . نەکو تنیٚ بشکوژەکی هەر وەچکو مە ل پیلك کرنیٚ گوتی پەترمە دهێتە لێدان هەکە هاتو ئەم ژ دارەکیٚ بیٚ هیڤی بوین و مەزانی دیٚ هەر مریت ئانکو هشك بیت . لیٚ ژ بەر هندەك ئەگەرا پیلك کرن چیٚترە ژ پەترمە کرنی ئەو ئەگەر ژی ئەڤەنە :-

١ - ل پیلك کرنیٚ هەر وەکو مە گوتی دیٚ تنیٚ بشکوژکیٚ بکار ئینین لیٚ ل پەترمە کرنیٚ دیٚ تەرحەکیٚ - تایەکیٚ پر بشکوژ بکار ئینین .

ئەڤە ژی ژلاییٚ ئابوری ڤە یا راست نینە نەمازە ئەگەر رەز بیٚ مەزن بیتو ئەم پێدڤی گەلە پیکا ببین بو گوهرینا توخمیٚ دارێن وی .

٢ - پیلك کرن ب ساناهی ترە و پر هیڤی ترە ژ پەترمە کرنیٚو هەر وەسا چیٚکرنا ویٚ کێمدەمترە .

٣ - مروڤ ل پیلك لێدانیٚ داریٚ نابریت لیٚ ل پەترمە کرنیٚ دڤێت ب ئاسویی ب بریت . هەر وەکی ل وینیٚ هژمارە (٧) و (٨) یادیار ڤێجا هەکە هات و سەرنەگرت دیٚ کارین پیکەکا دی لیٚدەین نە وەکی پەترمیٚ کو دیٚ دار پیچ بیت پشتی برینیٚ .

- کەنگی دیٚ پەترمیٚ ب کار ئینین . . ؟

١ - دهێتە ب کارئینان بو وان دارا ئەوێن پیلك کرنا وان یا ب گرفتاری بیت . وەکی مێوا تری هەچکو مە ل بەرپەرێن چوین گوتی تیڤلیٚ ویٚ بیٚ داڤ داڤە .

٢ - دەمیٚ مە بڤێت پەسینا دارەکیٚ ب ئێكجاری ب گوهرین بو رەنگەکیٚ دی - هەر ژ وی توخمی

٣ - بو دارێن کەڤنار کو بەرو پیچ بونیٚ دچن .

هەکو مە بریارا پەترمیٚ دا دڤێت پەترما خو ژ نیڤا تا وەرکرینو ئەو تاییٚ ساخلەمو خورستی بیت .

پەترمە ئەو تایە ئەویٚ ئەم ژ دارەکیٚ دهەلبژێرین دا ل دارەکا دی ب دەین ب رامانا گوهرینیٚ .

- **رەنگێن پەترما** :-

١ - **پەترما شڤکا** : (Whip Grafting) .

دیٚ پەترمیٚ ژ دارەکا بچویك - کێم عومر - وەرگرین ل بلنداهیەکا ناڤنجی . دڤێت ئەو دارا مە بریارا پەترمیٚ بو دای ب ئاسویی ب برین . سویٚ پەترمیٚ و بیٚ داریٚ هەردووکا دژی ئێك تیژکەین . ئانکو دیٚ پەترمی (٤سم) تیژکەین و داری (٤سم) کولین وەسا کو ب کەڤنە ئێك . دیٚ دانینە سەر ئێكو پاشی دیٚ پێکڤە گرێدەین . دڤێت ستویراتیا پەترمیٚو داریٚ هندی ئێك بن دا کو ب کەڤنە سەرئێك ب دورستی .

ئەڤ رەنگیٚ پەترمیٚ دهێتە چیٚکرن دەمیٚ پلا شین بونو

ئەڤ تێگەریانا دارو بارا یا نزمو کێم بیت وەکی پایزەکا درەنگ .

٢ – **پەترما وەکی ئەزمانی – یا نێرو مێ – Tanguo Garfting)** :– ئەڤ رەنگە ژی وەکی رەنگێ بەرێبە لێ هەکو ئەم دهێن سویێ وان تیژ دکەینو دکولین دێ نێرو مێ کەینو پاشی ئێخینە سەرئێك ئەڤە ژی باشترە ژرەنگی دی چنکو هەکە هەر دوو سویێ کەڤتنە ئێك چ لڤینا وان نینە . ئەڤ رەنگێ پەترمێ بو سێڤو هرمیو بها چێدبیت .

٣ – **پەترما تویکل کرنێ :– (Bark Grafting) :–**

ل ڤێرێ دێ وی تایێ مە چاڤ کری بو پەترمێ ژ هەردوو لایا ڤە تیژکەین – تیژبونا لایەکی درێژتر بیت ژیێ دی . پاشی دی خیچەکێ ل تویکلێ دارا بری کەین یاکو مە دڤێت پەترمێ لێدەین دێ پەترما تیژکەینە د وێ خیچێرا ژلایێ تیژیا وێ یا درێژ تر وەسا کو سویێ تیژ ل رەخێ ژورڤە بیت .

پاشی دێ وی جهی شەماکەین داکو ب هێتە پاراستن ژباو باگەرو ئاڤا . ئەڤ رەنگێ پەترمێ دبنە چەند پشکەك ئەو ژی ئەڤەنە :

أ / پەترمە کرنا ستوینی – (Top Bark Grafting) :–

ب – پەترمە کرنا رەخی – (Side Bark Grafting) :–

ئەڤ رەنگە دهێتە چێکرن ژ رەخەکی ڤەکو دبیتە کت پەترمێ ژی ژ لایەکی ب تنێڤە تیژ دکەنو وەکی یێن دی د دانن و شەما دکەن .

ئان ژی دبیت جوت بیت کو پتر ژ تایەکی ئان ژ شڤەکێ – بکەینە دناڤ خیچا دارێ را . پشتی شین دبن کیشکا ب هێزترە دێ ئەوێ هێلینو دێ یێ دی برین . ئڤە ل بهارێ دهێتە دورستکرن ل ڤێرێ مهانە نینە قورمێ دارێو ستوابراتیا پەترمێ هندی ئێك بن .

٤ – **پەترما تەنشتێ یا هەستی (Side Bone Grafting) :–**

ئەو دارا مە بڤێت پەترمێ لێدەین دێ برینەکا – سێ کوژی – لێ کەین ، پاشی دی تایێ پەترمێ ئینین دیسا ژ هەردوو سەرا ڤە تیژکەینو دێ کەینە د برینێ داو دێ شەما کەین .

٥ – **پەترمە کرنا خەندەکی – (Notch Grafting) :–**

دێ هندەکونکا ل لێڤێن دارا بری کەین . پاشی دێ تایێت پەترمێ لێدەین پشتی ئەم سویێ وان تیژدکەین – پاشی دێ شەما کەین .

٦ – **پەترمە کرنا پێڤەنانی :–**

ل ڤێری ئەم دارێ نا برین لێ دێ تایەکێ وێ نزم کەینو هندە تەرحێن ساڤا یێن دچاندی د تشتەکی دا وەکی –سندانا– مەرکانا– نێزیك کەین . . تایەکی ژوی تەرحێ ساڤا دێ سەرێ وی رویشینین دیسا تایەکی ژ دارا مەڤن ژیو دێ ل جهێ وێ رویشاندنێ دێ پێکڤە گرێدەین – بێ کو وان تا ب برین .

پشتی ئەم دزانین کو هەردوکا خو لێك دا و شین بو دێ تایێ دارا کەڤنو مەزن د سەر جهێ پەترمێرا برین .

ئەڤ رەنگێ پەترمێ گەلەك سەربخو ل ناڤ دارستانا چێدبیت . بێ کو مروڤ پشك دارێ تێدا بکەت . لێ دڤێت هەردوو تا ستویراتیەك بنو ب هێز بنو د ساخلەم بنو دراست بن .

ئەڤ رەنگێ پەترمێ یا باشە بو وان دارێن کەڤنار دبنو نێزیکی مرنێ دبن دێ تایەکێ وێ ب دارەکا ساڤا ڤەگرێدەین ئانکو پەترمە کەین . دا کو ئەو دارا نوی پەسەنو رەنگو رویبارێن وێ هەلگریت و لسەر وێ چەندێ شین ببیت .

٧ – **پەترمە کرنا وەکی پرێ** .

ئەڤ رەنگێ پەترمێ د بیتە رێك بو چارەسەرکرنا دارێ پتر ژ گوهرینا بەری . بو وان دارا یا باشە ئەوین زیان ڤ قورمێ وان دکەڤیت ئەڤ زیانە چ سوتن بیت ئان برینا دەڤێ بڤری بیت ئان ژی زیانا گیاندارا بیت وە ل دارێ بکەت یێ هێزو ئاڤ بیت .

دێ هێین تایەکی ژ دارێ بخو برین – ئەو تا ژیێ خورستیو ب هێز بیت . درێژیا وی تای هندی فرەهیا دەڤێ وێ برینێ بیت یا ل سەر قورمی . دێ هەردوو سەرێت تای تیژکەین .

پاشی د سەر برینێ دا دێ خیچەکا کویر ب ڤی رەنگی (⊥) ل تیڤلی کەین هەروەسا د بن برینێ دا ئێکا ب ڤی رەنگی (T) لێ خیچ کەین . پاشی دێ سوێن تایێ مە تیژ کری دێ ئێخینە نیڤا خیچا سلاڵ و دێ سەرێ دی چەمینین بو خیچا بنیو دێ ئێخینێ وەکی کەفا کوپالی وەسا کو ب کەفتە دبن برینێ دا . پاشی هەردوو سەرا دێ موکم شەما کەین ل ڤێری قورم و پەترمە هندی ئێك نابن چنکو پەترمە شڤەو دێ چەمینین . ئەڤە ژی بو هندێ یە دا کو ئەو تا خازنو ئاڤا ل سەرو بنا بگێریت پشتی کو قورمێ بریندار نەشیای ب ڤی کاری رابیت . وەرزێ باش بو ڤێ پەترمێ دەمێ ئاڤ تێگەریانا دارێ یە ئانکو ل بهارێ .

**٨ – پەترما هاری کار :-**

ئەڤە ژی رێکەکا دی یە بو هاری کرنو دەرمان کرنا دارێ بو وان دارا یا ب مفایە ئەوێت رهێت وێ د بێ هێز بن چ ژبەر زیانا گیاندارا بیت ل ناڤ ئاخێ ئان ژی ژ کەڤناریێ بیت .

دێ هینن ل رەخو دوریت دارا کەڤنار نێزیکی (٣–٥) تەرحا ژ دارێ چینین پشتی ئەڤ تەرحێت چاندی خو دگرنو شین د بن دێ ژ هەرئێکێ تایەکێ پر هێز چاف کەینو سەرێت وان تیژکەین بێی کو ژ ماکێ ب برین . پاشێ دێ هندە کونا ل سەر قورمێ دارێ سمین ب ڤی رەنگی ⊥) دێ سەرێت وان تا کەینە تێداو رەخێت وان شەما کەین . ئەڤ تایێت تولاز دێ خازنێ گەهینن دارا بێ هێزو بـزوخ کەڤیت . دەمێ باش بو ڤێ پەترمی ژ هەیڤا گولانێ دەست پێ د کەت ئانکو ل وەرزێ ئاڤ تێگەریانا داری بلند د بیت .

**ڤەرهەنگوك :**

(١) – پیك التطعیم بالبراعم .
(٢) – پەترمە التطعیم بالقلم – Grafting
(٣) – زری درعي
(٤) – تیڤل القشرة الخارجیة
(٥) – تویکل القشرة الداخلیة
(٦) – وێنە (١ – ٢ ٣ – ٤ – ٥ ٦) پیك کرن
وێنە (٧ – ٨) – پەترمە کرن

# ژیـ

ژیانی هەر چەشنو جۆرێك لە زیندەوەرانی ئەم جیهانە پڕیپێتو بەرینە بەندە لەسەر پەیدابوونی خۆراك یا ئەو جۆرە نێچیرانەی کە وێڵێتی لە سروشتدا . تاکو ئەم دوو بەرەیە لە ململانیدا هاوتابن . . . تێکڕای زایینو مردنی گیانەوەر هاوسەنگ دەبن ، تاژمارەی ئەو زیندەوەرانەیش بگەنە ئاستێکی جێگیرو دابین .

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سالآنی ١٠٠٠٠ پ ز کۆی دانیشتوانی زەوی بە ٥ملیون کەسیك خەملاوە (ژمارەی دانیشتوانی شارێکی گەورەی ئێستایە) . ئەم ژمارەیەیش تا ڕادەیەك جێگربووە لەبەرئەوەی کە ئەوسا مرۆڤ بۆ دڵنیایی خۆراکی ڕۆژانەی پەنای دەبردە ڕاوو شکار . . . دەگەڕا بە دوای ئەو نێچیرو ڕووەکانەی کە دەهاتنە ڕێی ، جا لەبەرئەوەی کە هەر ئەو تاکە ڕێگەی بە بیرو ئەندێشەدا دەهات خۆراکی تا ئەندازەیەك جێگیر بووە .

جاری وابووە وەرزێکی وا هاتۆتە پێشەوە بەروبوومی خۆراکی تیادا زۆربووە بەلآم نەدەبووە هۆی ئەوەی ڕووداوێکی گەش بخاتەوە ، ئەویش لەبەرئەوەی کە شێوازی تێشوو هەڵگرتنی زۆر سەرەتاییانە بووە . جاری وایش بووە هاتوون بە پیر وەرزی واوە کە تیایدا دووچاری ووشکانی ، لافاو ، بوومەلەرزە ، دەردی کوشندەو چەندین ناهەمواری تربووە . . . ئەمانەو گەلێك ڕووداوی‌تر سنوورێکی داناوە بۆ گەشەو پەرەسەندنی .

# ـوار

نووسینی :- پرۆفیسۆر
فریدریك ر. لونگو
وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە :
ئەسعەد قەرەداغی

لە دواییدا کە پەی برد بە ڕێگەی ئاشپەزی گوزەرانی ژیان کەوتە بارێکی گونجاوتر ، ئەمە بووە هۆی ئەوەی خۆراکی مرۆڤ بەچێژ بکات ، لەوەگرنگتر . . . . سەرچاوەی خۆراکی بۆ پتر بوو ، توانی خواردنی بەچێژ لی بنێت ، هەر لەمەیشەوەرا جۆری خواردەمەنی بۆ پتر بوو . واتە هاتە ئەو ئاستەی کە بتوانێت مادە خۆراکیەکان لە گۆشتی کاڵو هەندێ جۆر لە ڕووەکە بادەمیەکانو میوە دەربهێنێت . بەمەیشەوە نەوەستا بەڵکو توانی گۆڕانکاری بەسەر ئاشپەزیشدا بهێنێت . . . .

خۆراك لە زۆر ئەتەمی ڕووەك پاڵفتە بکات ، تێبگات لەوەی کە کولاندنی خۆراك دەبێتە دافرەقانی دیوارە سلیلۆزیەکان لە خانەکانی ڕووەکداو دەرباز بوونی مادەخۆراکیەکان لەناویدا . ئەم چەشنە کردارەیش تەنها هەر لە هەندێ زیندەوەردا هەیە کە بتوانێت بەبێ گەرمکردن بە ئەنجامی بدات . لەم کۆششو ڕەنجە سەختەدا مرۆڤ هاتە سەر ئەو بوارەی کە خۆی خجڵ بکات تا بگاتە ئەوەی زیاتر هەست بە بوونی خۆی بکاتو بکەوێتە پرسیارکردن لە خۆی ! ! ! . . . چۆن بتوانێت بە هەموو ووزەو توانایەوە خۆی بهاوێژێتە نهێنیەکانی سروشتو ژیوار بخاتە ژێر دەسەلاتیەوە .

نزیکەی ۸۰۰۰ ساڵ لەمەوبەر توانی وەك کشتیارێك گوزەران بکات ، زۆر لە ڕووەكو پەلەوەرو ئاژەڵ پەروەردەو بەخێوبکات . . . لە بەروبوومیان سوود وەربگرێت . ئەم گۆرانکاریە مەزنانە بوونە بەرزکردنەوەی ئاستی سەرچاوە خۆراکیەکان بە چەشنێکی فراوانتر . هەر لەم ڕوانینەیشیەوە فێری ئەوەبوو چۆن هاریکاریو کۆمەکی کەسانی تر بکاتو گیانی کارو هەرەوەزی بجوڵێنێت لە کێڵانو چاندنو ڕاوو شکاردا . مایەی ئەم کارەمەزنەیشی کەمکردنەوەی دوژمنانو مسۆگەرکردنی کەرەسەو تێشووی خۆراکی بوو لە سروشتدا . بەم چەشنە گوزەرانە جۆری مرۆڤ بەرەبەرە کەوتە گەشیو زۆربوون . . .

بەزۆریش لەو ناوچانەدا دەبوون کە نزیك بە چاووگی ڕووبارو چۆمە گەورەکان بوون . کە دەردێکی کوشندەو چەندین کارەساتی تر زۆری بۆ بهێنانایە هەر بە زوویی پەرشو بلاودەبوونەوە . چ خاکێك بە پیتو فەڕ بوایە زەوتیان دەکردو جێنشین دەبوون تیایدا .

ڕوویان بکردایە هەر ناوچەیەك ئەو گیاندارانەی تر دوچاری هەلاتنو لەناوچوون دەبوون .

بە تێگەیشتنو بۆچوون بە ناخی سروشتدا توانی چنگی خۆی زیاتر گیربکات ، چەندین جەنگەڵو لەوەڕگایوێرانو خاپوور دەکرد لە پێناوی خۆشگوزەرانی خۆیدا . بەرەبەرە کەوتە والانکاریو داهێنانی گەلێ ئامرازو ئامێری ئالۆز کە بەدارو کانەسووتەمەنیەکان بڕوات بەڕێوە . پێشرەوی لەم بوارەدا بووە هۆی زۆربوونی دەرامەتی کشتوکاڵو پاڵهێز بۆ تاقیکردنەوەی

برستی خۆی تاکو ئەوەندەی‌تر هەڵپەی پەیداکردنی کانەسووتەمەنیەکانی هەبێت‌و زیاتر خۆی جێنشین بکات لەو ناوچانەی کە تیایدا دەدۆزرایەوە . . . ، ئالێرەوە ئیتر شاری گەورە پەیدابوو . . . گرنگی ووزە هاتە کایەوە ، چەندین کارگەری بەرهەم دامەزرا .

پێویستی ڕوژانەی تا دەهات پتر دەبوو . ئەمانە هەمووی بەهۆی ڕاهێزانی ووزەوە . . . . ووزەیش لەو کانەسووتەمەنیانەوە دەستدەکەوت ، فرەبەکارهێنانیشی بە هەمیشە بووە هۆی گۆڕانی ئاووهەوای کەش‌و پڕبوونی بە تەم‌و کاری‌و هەوری چڵکن‌و گازە ژەهرەکان .

ڕووبارو دەریاچەکان بوونە شوێنی پیسەڕۆو سەرەنوێلکی کارگەو بنگەکانی ووزە . . . بە ڕێژەیەکی وا زۆر کە مەترسی بخاتە نێو زیندەئاویەکانیشەوە .

ئا بەم چەشنە جۆری مرۆڤ بووە دڕندێکی[1] سەخت‌و سامناك بۆ سروشت ، بگرە ترسناکتر لە گرگان‌و بوومەلەرزەکان‌و . . . تەنانەت بۆ سەر ژیانی خۆیشی . بەڵام لە بەخت‌و نگینی سروشت مرۆڤ دەرووی ئومێدی بۆ ژیان کرایەوە ، توانی ئاسۆی ئەندێشەی بۆ دوورو دوورتریش هەڵبدات . . . فێربێت چۆن ئەوشێوازو ئامرازانە برەخسێنێت‌و بیانخاتەگەڕ بۆ بەرهەڵستی‌کردن‌و ڕاساندن لەو ناهەمواریانەی کە چاوەڕوانی دەبێت .

خشتەی

زۆربوونی دانیشتوانی جیهان

| ساڵی زایینی | ژمارەی دانیشتوان (بلیۆن) |
|---|---|
| | ٠ر٢٥ |
| ١٦٥٠ | ٠ر٥٠ |
| ١٨٥٠ | ١ر١ |
| ١٩٣٠ | ٢ر٠ |
| ١٩٧٥ | ٤ر٠ |
| ٢٠٠٠ | ٧ر٥ |
| ٢١٠٠ | ٥٠ر٠ |

لەو دەمەی حەزرەتی‌عیسادا (د . خ) ژمارەی دانیشتوانی زەوی نزیکەی ٢٥٠ ملیون کەس بووە . ئیستا هەر لە وولاتانی سۆڤیەتدا پتر لەوەندە هەیەو نزیکەی چوار بلیۆن کەسیش دانیشتوی جیهانە .

ئەم ژمارەیەیش هەر لە ٣٥ یان ٤٠ ساڵێکدا ئەوەندەجا زۆر دەکات . ئەگەر لەسەر ئەم نەخشەو ڕیبازە بێت ساڵی ٢٠٠٠ز دەگاتە ٧ر٥ بلیون کەس . ساڵی ٢١٠٠ز دەگاتە ٥٠ بلیۆن کەس .

ئەم سەرژمێرییە ڕەنگبێت هەروا لەسەر زار ئاسان بێت ، بەلام گەر بیری لی‌بکرێتەوە زۆر زۆر . . . سەخت‌ترە لەوەی ئاشکرابێت .

جا بۆ ڕاگیرو دابینکردنی ئەم بەلا ناهەموارە دەبێت بە هەر چەنو چۆن بێت فرازی‌و گەشندەی پسات پەکبخرێت‌و بوەستێنرێت . . . . ئەویش یان شیرازەی نەوەخستنەوە ڕابگیرێت‌و سنوور بۆ هەڵچوون دابنرێت یاخود تێکرای مردن زۆر بکرێت . تەنها ئەم دوو ڕیچکەیە هەیەو سیهەمی بۆنیە . پێمان خۆش بێت یانە ! ! دەبێت یەکێ لەم دووانە هەڵبژێردرێت .

بە پەرش‌و بلاوبوونەوەی مادەژەهرەکان لە ژیوارمانداو گۆڕینی گوزەرانکردنی ڕۆژانەمان لەناوچوونی کەرەسەخاوەکان‌و زەویە بەپیتەکان‌و سەرچاوەکانی ووزەی لەدوایە . ئەوەتا وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەر ساڵانە نزیکەی ٢٠٠ ملیۆن تەن تەم‌و کادی[2] چڵکن‌و گازە ژەهرەکان بە کەشدا بلاودەبێتەوە . نزیکەی ١٠ ملیۆن ترۆمبێلی داشکاوی ڕزیو ، ٢٠ ملیۆن تەن پەڕەی ژاکاو . ٥٠ ملیۆن تەن قوتوی بۆش ، ٣٠ ملیۆن تەن شوشەی ساردەمەنی . ١٠٠ ملیۆن تەن پێچکەی ڕزیو فڕێ دەدرێت . نزیکەی ٢٠٠ ملیۆن تەن زێراب ڕۆدەکرێت . ئەمانەو چەندین پاشەڕۆی ترو هالاوی کارگەکان

هەر هەمووی ڕووی کەش‌و ڕووبارو دەریاچەکان دەگۆڕن‌و دەبنە هۆی وێران‌کردن‌و تێکدانی ووزەو کانەسروشتیەکان .

ئەگەر دیاردەیەکی وا ناهەموار خۆی بدات بەسەر ناوچەکانی جیهاندا ، مرۆڤ دەکەوێتە ژیانی کولەمەرگی . . . دەکەوێتە ئەندێشەیەکی ڕەشەوە . . . ملی بە مەرەبردن‌و نەناوچوونی خۆی دەگرێتەبەر . ئەوساکەیش ڕەورەوەی ژیانی ڕادەوەستێت . هیچ چارێکیشی نیە تەنها ئەوە نەبێت کە زرنگانە ، ئازایانە کەمتەرخەمی نەکات ، هێزی چوست‌و چالاکی بخاتەگەڕ بۆ سنووراندنی بەرهەڵست‌و ڕاگیرکردنی وێران بوونی ژیوار .

بۆ ئەم مەبەستە زاناندن زۆر مەرج‌و پیویستە بۆ ڕەخساندنی ڕەبازو لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا بۆ گەیشتن‌و بۆچوونێکی ڕاست‌و ڕەوان لە چارەسەرکردنی ئەم کێشە سامناکەدا ، هەروەها مەرج‌و پێویستە بۆ ئەوەی دەرووی هۆشیاری‌و ڕۆشنبیری بۆ کومەڵگا بکاتەوە تاکو سەرانسەری جیهان بگرێتەوەو ئەوساکە بە یەك دەنگ هەموو هاواری هەرەوەزی بلندبێتەوە بۆ خاسکردن بەرەو باشتر لەو وویستەمەنیە ڕۆژانانەی کە درێژە بە ژیان‌و پاکی ژیوار دەدەن .

لێرەدا ئەو هۆ کیمیکانە دەخەینە ڕووکە زۆر کاریگەرن‌و بە گیروگرفتە سەرەکیەکانی ژیوار دادەنرێن . . . بەو پێشنیارانەیشەوە کە دێنەرێ بۆ چارەسەرکردنیان :

١ – هەوای کەش Atmospheric air

هەوای ئەو هەرێم‌و ناوچانەی کە کارگەو پیشەسازی‌و دانیشتوانی زۆری تیادا چراوە زۆر لەو پێکهاتووانەی تێدا بلاوبۆتەوە کە لە ئەنجامی سووتانا پەیدا دەبێت بە هۆی کانە سووتەمەنیەکانەوە وەك سروشتە گاز Natural – gas و پێترۆل‌و خەڵووز .

ئەم پێکهاتووە کیمیکانە لە ئەنجامی سووتاندا دایۆکسیدی کاربۆن $CO_2$ و هەڵماوی لێوەدەردەچێت . ڕەنگە تا ڕێژەیەکی گونجاو ژەهر نەبێت

پێکهاتوویەکی دیاربکراو لە هەوای ووشك .

| گاز | | ڕێژەی سەدی قەبارە ٢ | کێش |
|---|---|---|---|
| نایترۆجین | $N_2$ | ٧٨,٠٩ | ٧٥,٥١ |
| ئۆکسجین | $O_2$ | ٢٠,٩٥ | ٢٣,١٥ |
| ئارگۆن | $Ar$ | ٠,٩٣ | ١,٢٨ |
| دایۆکسیدی کاربۆن | $CO_2$ | ٠,٠٣ | ٠,٠٤٦ |
| نیۆن | $Ne$ | ٠,٠٠١٨ | |
| کریپتۆن (١) | $Kr$ | | |
| هیلیۆم | $He$ | ٠,٠٠٢٥ | |
| زینۆن | $Xe$ | | |
| ڕادۆن | $Rn$ (٢) | | |
| هایدرۆجین | $H_2$ | $٥ \times ١٠^{-٥}$ | |
| ئۆزۆن | $O_3$ | $١ \times ١٠^{-٦}$ | |

(١) ڕیزکردنێکی بەرەوخوارە بەگوێرەی پەیتیان .
(٢) – ڕادۆن توخمێکی تیشکدەرە بوونی کەمترە لە هەموو گازەکان .

بەڵام لەم لەورێژەیە پیتر بووئەوا دەبێتە بارێکی گران ومەترسی بۆکەش . چۆن . . کەش توانای ئەوەی هەیە وەك جامخانە(٣) فێنکەکان ڕەفتاری خۆی بکات وانەکاتێك ڕۆشنایی خۆری پیادا ڕادەبوورێت برێك لە تیشکی بن سوور – Infra red لە نێو جامخانەکەدا دەپەنگێت . تیشکەکانی تر هەڵدەمژرێت لە لایەن ئەو ڕووەکانەی کە تێیدا پەروەردە دەکرێت . ئەم تیشکە هەڵنەمژراوە (بن‌سوور) پەنگخواردووە بەرەبەرە پلەی گەرمی ناو جامخانەکە بەرزدەکاتەوە . . . ئەم دیاردەیە هەمان ڕاڤەیشە بۆ ئەو ترۆمبێلانەی کە جامەکانی بە تەواوی دەبەسترێت‌و لە بەر خۆردا دادەنرێت – هەر هەمان دیاردەیشە بەسەر هەوای کەشماندا ڕووئەدات . لێرەدا گازی $CO_2$ وەك شوشەی جامخانەکە ڕەفتار دەکات ، دەبێتە نێوەندێك بۆ گواستنەوەی ڕۆشنایی خۆر بەڵام تیشکی بن‌سوور گل‌ئەداتەوە . جا ئەگەر لە هەرێمێکی پڕ لە دانیشتوان‌و پڕ لە چەندین جۆر کارگەدا گازی

$CO_2$ فڕێبداتە هەوای کەشەوە وپەیتی لە ڕێژەی دیاریکراودا زۆرتر بوو ئەوا پلەی گەرمی بەرەبەرە بەرزدەبێتەوەو دەگاتە ڕادەیەکی وا کە بەس بێت بۆ توانەوەی چیابەفرینەکانو ناوچە بەستەڵەکەکانی هەردووپۆڵ . . . لافاوێکی وا هەڵرژێتە ووشکانیەوە کە ڕەنجی سەختی چەند ساڵەی ژیانی مرۆڤ بە بابداتو هیچی بۆ نەهێڵێتەوە . کاربکاتە سەر نیشتاندنی ئەو پێکهاتووە خۆنەگرانەی کە لە سروشتدا هەن ، لەوە گرنگتر . . کاربکاتە سەر تێکدانی وەرزی باران ئاوو هەواو ڕووداوی ناهەموارتر .

ئەگەر دیاردەی جامخانەکان لە دوارۆژێکی دووردا لەوانەبێت کە ئەنجامێکی ناهەموار بداتەوە . ئەوەتا گیروگرفتو مەترسی زۆر نزیکتر هەیە کە بەرۆکمان دەگرێت کە لە بەرهەمەلاوەکیەکانی [٤] سووتاندا خۆی دەنوێنێت . بۆ نموونە ئەو کانەسووتەمەنیانەی کە دەبنە ووزە هەمووی مادەی کاربۆنو هایدروکاربۆنی خاوین نین ، بەڵکو هەندێ گوگردیان تێدایە . کە دەسوتێن گازی دایۆکسیدی گۆگرد $SO_2$ و سیانە ئوکسیدی گوگرد $SO_3$ دەرباز دەبێتو بە ناو کەشدا بلاودەبنەوە . ئەگەر ئەم دوو گازە بە ڕێژەیەکی کاریگەر لە هەوادابن کاردەکەنە سەر پەردە چلمینەکانی Mucous Membrane کۆئەندامی هەناسەو ئازاریان دەدات .

لێرەدا ئەگەر کیمیکانە کرداری سووتاندنی کانەکان لێك بدەینەوە دەڵێن . . . لە بارە پێوانەییەکاندا Standar Conditions واتە بە کارلێکردنی کاربۆن یان هایدرۆکاربۆن لەگەڵ هەوای ووشکدا ئاوێتەیەکی تاکی لە $CO_2$ دێتە بەرهەم .

بەڵام لە بارە ناپێوانەییەکاندا سوتاندنی یەجگاری نایەتە بەرهەم

$$C_2H_6(g) + O_2(g) \longrightarrow C(s) + CO(g) + H_2O(l) + C_2H_6(g)$$

گاز — دیاریکراو — ڕەق — گاز — شلە — نەسووتاو

واتە سووتوی کاربۆنی ڕەقو یەکە ئۆکسیدی کاربۆن CO پەیدادەبێتو بڕێکیش لەو کانەسووتەمەنیە بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی کیمیکی بەسەردا بێت ، چونکە لەو کارلێکردنەدا گازی ئۆکسجینی هەوا ئەوەندە نیە تاکو سووتاندنی یەجگاری ڕووبدات . جا ئەو گازە داخانە بەرزدەبێتەوە بۆ کەش ، پشکۆکانی خەڵووزیش لەگەڵ هەندێك لە مادە نائەندامیەکاندا یەگدەگرنو خۆڵەمیش دروست دەبێت . . . ئەمیش وەك تۆزێکی تفتی بەتین بەرزدەبێتەوە بۆ کەش .

لە باری ئاساییدا نایترۆجین گازێکی سستەو بە ڕێژەیەکی چونیەك لەگەڵ گازی ئۆکسجینو هەندێك گازیتر هەوای کەشی پێك هێناوە .

بەڵام بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی ، گەردیلە سستەکانی گازی نایترۆجین چالاکی تێدەکەوێت . ئەم دیاردەیە زۆرتر لە نزیك مەکینەو ئامێری سووتانە ناوخوییەکاندا Internal Combustion Engine .

نایترۆجینی کەش دەگۆڕێت بۆ ئۆکسیدەکانی وەك ئۆکسیدی نایترۆجین NO کە ئەمیش بە بڕێکی زۆرتر لە گازی ئۆکسجین بە ئاسانی دەبێتە دایۆکسیدی نایترۆجین $NO_2$

$$N_2(g) + O_2(g) \longrightarrow 2NO(g)$$

گاز

$$NO(g) + \tfrac{1}{2}O_2(g) \longrightarrow NO_2(g)$$

گاز

هەرچی ئۆکسیدە نایترۆجینەکان هەیە ترشو ژەهرن ، جا ئەگەر ڕێژەی ئەم گازانە ($CO$ , $SO_2$ , $SO_3$ , $NO_2$ . . . . و سووتوی کاربۆن (هیس») زۆر کەم بێت ، ڕەنگە مەترسی ئەوەندە نەبێت ، چونکە بەربلاوی کەش توانای ئەوەی هەیە کە بە نێو خۆیدا پەرشو بلاوی بکاتەوەو لە مەترسی دوورمان بخاتەوە .

بەڵام ! ! ! . . . ئەگەر بڕێکی زۆر لەو کانەسووتەمەنیانە ، وە لە ماوەیەکی کورتدا بە سەدان یان

هەزاران تەن لە ناوچەیەکدا بەکاربهێنرێت . . . ئەوا کەش ەکی دەکەوێت‌و دەرەقەت نایەت چالاکانە بلاوە بە گازەکان کات . ئا لەم بارو دۆخەدا دەگەینە ئاستێکی زۆر شپرزەو ـمناکەوە ، ئەگەر دیاردەیەکی وا لە دۆڵ‌و بێشەکاندا پەیدا بێت پێی دەوترێت کادی Smokc .

لە هەندێ باری تایبەتدا ئەو گازو تۆزانەی کە لە ئاکامی سوتاندا هاتۆتە بەرهەم لەگەڵ تەم Fogدا چینێکی چڵکنی ـریك لە چەرە دوکەڵ پێك دێنێت کە مەترسی زۆر زۆرترە هەوەی پێشوو پێی‌دەوترێت تەمکادی(٥) Smog .

یەکەم کارەساتێك کە لەم دیاردەیەی تیا ڕوویدا لە دۆڵی (میوز)ی بەلچیکادابوو . لەم دۆڵە تەنگەبەرەدا چەندین کارگەو پیشەسازییەکانی تیادا کۆبۆتەوە وەك کارگەی فرنەکانی‌گەچ ، کارگەی خارسینگەری پۆلا . بنگەی ووزە ڕاهێزان(٦) ، شوشەسازی ، کانەکوك ، پیشەسازی ترشی گۆگردیك . . . ئەمانەش زوربەیان پیویستی بە نەرمە خەڵووزی پڕ لە گۆگرد هەیە بۆ ووزە . لە کارکردنی ئەم کارگانە . . . کە ئەو مادە ژەهرانە دەردەچوونە نێو کەشەوە ، چینێکی چڕی پەنگ خواردوی لە هەوای سارد پەیدا دەکرد . . . . بە تێپەربوونی چینێك لە هەوای گەرم بە بانیدا و بە یەکگەیشتنیان هەورێکی چڵکن لە تۆزو هیس تێر بە ئۆکسیدەکانی گۆگردو نایترۆجین پەیدا دەبێت . ئەم کارەساتە کە لە سەرەتای دێسەمبەری ١٩٣٠ زدا ڕوویدا بووە هۆی تووشبوونی هەزاران کەس بە نەخۆشیی سنگ‌و کۆکە . . . ئازاردانی کۆئەندامی هەناسەو تێکچوونی چاوان بە گشتی ، نزیکەی ٦٠ کەسی تیادا مرد ، ئەوانەیش کە دەمردن زۆربەیان هەناسەتەنگی‌و نەخۆشی دڵیان پێشتر لەگەڵدا بوو . لەوە ناهەموارتر ڕووداوی ساڵی ١٩٥٢ز بوو لە شاری لەندەن کە نزیکەی ٣٥٠ کەسی تیادا مرد .

ئەم جۆرە ڕووداوانە بە گشتی لەو ناوچەنزمانەدا دەبوو کە کارگەرو پیشەسازییەکانی تیادا مۆڵ دەبوو ، ئەویش لە بارێکدا کە کرداری گەرمیدانەوەی تیادا ڕوویدات .



تەمێکی چڵکن پەنگ خواردوو بەهۆی گەرمای گوزراو

ئەگەر ئەم دیاردانە کیمیکانە لێك‌بدرێتەوە دەڵێین دوو جۆر تەمکادی هەیە ، جۆری کارگەو پیشەسازییەکان کە تێکەڵاوێکە لە تەم‌و دوکەڵ‌و گازە ژەهرەکان ، هەروەها جۆری ڕۆشنەکیمیکەکان . . . ئەمیش لەو شوێنانەدا پەیدادەبن کە بێ‌ئەندازە ترۆمبێل‌و ئامێرە سووتانە ناوخۆییەکانی تیادا بەکاردەهێنرێت ، ئەم جۆرەیان ئەگەر بەرتیشکی خۆربکەوێت ئەوا گازی $NO_2$ی ڕەنگ قاوەیی ووزە هەڵدەمژێت‌و لە ڕۆشنەکارلێکردندا شی‌دەبێتەوە ، لە ئەنجامی ئەم کردارەدا گازی ئۆکسجینی گەردیلەیی پەیدادەبێت :

$NO_{2(g)}$ + هەتاو $\longrightarrow$ $NO_{(g)}$ + $O_{(g)}$ چالاك

گەردەکانی گازی ئۆکسجینی کەش شالاو دەبەنە سەر ئۆکسجینە گەردیلەکە . . . گازی ئۆزۆن «بۆنی سیری لێوەدێت» پەیدادەبێت :

$$O_{(g)} + O_{2(g)} \longrightarrow O_{3(g)}$$
ئۆزۆن

هەروەها ئۆکسجینی چالاك لە توانایدا هەیە کاربکاتە سەر هایدرۆکاربۆنەکان ، هەر بە ڕەچەکارلێکردنێك چەندین پێکهاتووی ئەندامی زیاندەر پەیدادەبێت ، لەوانەیش :



$$R-C(=O)O^{\cdot} + O_2 + NO \rightarrow R-C(=O)-O-O-NO_2$$

پیرۆکسی ئەسایل نایترەیت
(PAN)

ئەم ماددانە (PAN ، ئەڵدەهایدەکان ، ئۆزۆن) دەبنە پێکهێنەرە سەرەکیەکانی ئەو چەرە دوکەڵەی کە لە ترۆمبێلو ئامێرەکانی ترەوە دەردەچێت لە کارپێکردنیاندا . لە سەرو ئەمانەیشەوە چەندین ئاوێتەی تر لە کارگەکاندا ڕۆدەکرێت پێیان دەوترێت تۆزە میتاڵیەکان . سلیکاتو فلۆریدو پێکهاتووە ئەرۆماتیەکانو گەلێ جۆری تر لە تەنە ڕەقە درشتەکان ، هەروەها ئەو کارگانەی ووزەی کارەبا دەخەنەوە بە هۆی ئەو کانە خەڵووزانەی توخمی گۆگردیان تێدایەو بە سووتان , $SO_3$ $SO_2$ دەردەکات .

هەتاوەکو ئەو کارگەو بنگە ووزانە لە گەڕدابن . . . ئەو ئامرازو ئامێرانەیش چالاکی خۆیان زۆرترو بەهێزتر دەنوێنن ، خۆ زۆر بوونی مرۆڤیش با لەو لاوە بووەستێت کە چەند پێویستی بە هەوای خاوێن هەیە . بەلاّم لەم تەمو مژدەدا چۆن دەست دەکەوێت ؟ ؟ ؟ . . . ئەم هەموو کاروبارە ناهەموارە سەرەنجامەکەی پیس بوونی هەوایە ، جا ئەگەر لەم ڕۆژنەوە مرۆڤ پڕکێشیی نەکات بۆ بەرهەڵستی ئەم دیاردەیە ئەوا ڕەنگە دووچاری ڕوژێکی ڕەشو بەدبەخت ببێت . .

٢ – ئاو Water :

لەو دەمەی کە مرۆڤ خۆی خجلاّندوە بە گۆڕانکاری لە ووزەو بەکارهێنانی کەرەسەخاوەکاندا بۆ وویستی ڕۆژانەی . . . ئەوەندە گوێی نەداوەتە ئەوەی چی دەبێت ؟ چی ڕووئەدات ؟ بەرەو کوێی هەڵدەدێرێت ؟ . . . بگرە درێغیشی نەکردووە لێی هەروەکو بڵێیت زۆر ئاسودەیە لەوەی کە هەر بەخۆی خۆی پاکو خاوێن دەکاتەوە ، سروشتیش هەر لە خۆیەوە پاکو خاوێن دەبێتەوە . ئیتر هیچ پێویست بە ڕاو تەگبیر ناکات لە سنووراندنی دوارۆژێك بۆ ئەم ژیوارەی کە تیایدا دەگوزەرێت . ئەوەی کە زیاتر ئاشکراو کاریگەرەو لەم بوارەدا دوخێکی زۆر بڕێو دەگێڕێت . . . . ئاوە . بەشێکی زۆر فراوانی لە زەویدا گرتوە ، جگە لەوەیش کە بە لایەنێکی زۆر پێویستو بڕێو دادەنرێت لە جیهاندا . لەم بوارەیشدا مرۆڤ نەسرەوتانە چنگی وێرانەی گەیاندە گەورەترین بەشی . پیس بوونی ئەم لایەنە بەرینو فراوانە هەمان ئەنجامی پیس بوونی هەوایە ، هۆیەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ کشتوکاڵو تەکنیکاری بە شێوەیەکی فراوان . گەشەی پسات و گەلێ شتی ترکە تا ڕادەیەك ڕووالّەتی بێ نەخشەیی و ناپەیرەوی پێوەدیارە .

نموونەیەك لە نەبوونی ڕەبازێکی ژیرانە لە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئاو ، چۆنیەتی نەخستنەگەری زانیاری بۆ ڕاساندنو دامرکاندنی ئەم شالاّوە ڕەشە . . . . دەریاچەی (ئیری)ە کە لە کەنارەکانیدا نزیکەی ١٠ ملیۆن کەس دانیشتویەتی ، چەندین کارگەو پیشەسازی گەورەو فرەجۆری تیادا دامەزراوە . هەموویش پێویستی بە ئاوە . هەر لە ڕۆژێکدا نزیکەی ٥ر٥ بلیۆن گالۆن ئاو کاردەکردێتو جارێکی دی لە پلەی گەرمی بەرزدا بەکاردەهێنرێتەوە .

بەشێك لە ئاکا● ئەم کردارە دەبێتە پاشەڕۆی زێراب ، وەك پێویست چارەسەرناکرێت . لەولایشەوە بڕێکی زۆر لەو بەرهەمە پاکژێنە کیمکانەی کە لە مالاّندا بەکاردەهێنرین لە ئاوێتەکانی فۆسفاتی تێدایە . ئەم هەموو سەرەنوێللكو پیسەڕۆی مالاّنو کارگەرو پیشەسازییانە کە زۆربەیشی پێکهاتووی ئەندامی تێدایە دەرژێنە دەریاچەکەوە . ئەم پێکهاتووە ئەندامیانە دەبنە نێوەندێکی گەش بۆ بەکتریاو . . . بەرەبەرە ئۆکسجینی تواوەی ئاوەکە خێرا لە لایەن بەکتریاوە وەردەگیرێتو ڕێژەی نزم دەبێتەوە . شیبوونەوەی ئەم ماددە ئەندامیانەیش بەهۆی ئەو جۆرە بەکتریا ناهەواییانەوە دەبنە گازە بۆگەنو زیاندەرەکانی وەك گۆگردیدی هایدرۆجین $H_2S$ . ئەو ماددە ئەندامیانەی گۆگردو گازی میثانو $H_2S$ یان تێدایە لەگەڵ زۆر لە ئایۆنە کانزاییەکاندا کارلێك دەکەنو پێکهاتووی ناتواوە لە گۆگردیدی کانزاکان پەیدادەبێت بە توێژێکی بۆرو تاریك لەسەر ڕووی ئاوەکە .

ئەو پاکژنە کیمیکانەیش کە ئاوێتەکانی فۆسفاتی تێدایە دەبنە هۆی گەشەکردنی قەوزەکان ، بە زۆربوونیان دەبنە ئاستەنگێك لە ڕێی جوڵەو شەپۆلدانی ئاوی دەریاچەکە ، بە مردنیشیان دەبنە نێوەندێکی گەش بۆ ئەو بەکتریانەی پێویستییان بە ئۆکسجینە . ئەمە نموونەیەك بوو بۆ دیمەنی ئەو ڕووداوانەی کە بەم چەشنە مرۆڤ بۆ نیازو مەرامی خۆی دەیانخاتە ژێر دەسەلاتەوە . ئەو دەریاچەیەی کە جاران بە دیمەنێکی جوانو سروشتێکی سەرنج ڕاکێش خۆی دەنواند . . بووە دیمەنێکی خەوشو پڕبۆگەنی ناخۆش ، هیچ جۆرە گیانداریکی ئاوی تیادا نەژی ، تەنها ئەو ماسییانە نەبێت کە لە ئاستێکی زۆر نزمی ئۆکسجینو پلە بەرزەکانی گەرمیدا دەژین . . . . ئەمانەش زۆر بە دەگمەن هەن . . .

٣ – ئاوی ناساز Hard – Water

ئاوێك کە بشێت بۆ خواردنەوە وزۆربەی کاری پیشەسازیی‌و خانووبەرەی پیٚ‌ئەنجام بدرێت . . . دەبێت ڕوونو بیٚ‌ڕەنگ ، بیٚ‌بۆنو بیٚ‌چەش بێت ، هیچ ماددەیەکی هەڵاویٚز Suspension ، هیچ میکروبێکی زیاندەری تیادا نەبێت ، بەڵام هێشتا لە ڕووی کیمیکانەوە پاكنیە ، بگرە پاکردنەوەیشی هەر زۆر سەختە . ئەو ئاوە سروشتیانە بەڵگەیەکن بۆ ئەم دیاردەیە ، بیرو کارێزو ئەو کانیاوە هەڵقوڵاوانەی جۆباری خۆیان دەکەنو زەوی ئاودر دەکەنو هاژەو خورەیان دێ بەسەر تاوێرە بەردەکاندا ، هەموو مەرجێکی نۆشاکیان تێدایە . بەڵام هەندێك ماددەی تواوەی تێدەکەوێت کە لە هەوادا هەیە وەك گازەکانی ئامونیا , $CH_4$ . $SO_2$ , $H_2S$ , $NH_3$ . ئەگەر پەیتی ئەم گازانە لە ئاودا بە ڕێژەیەکی ناپەسەندبوو . . . ئەوا نە بەکەڵکی نۆشین دێت ، وە نە بەکەڵکی پیشەسازیی . ئەم جۆرە ئاوانەیش پیٚ‌ی دەوترێت ئاوی ناساز . ئەم ناسازییەیش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی چەند ئایۆنێکی پەیت بەرزی وەك مەگنسیوم $Mg^{++}$ ، کالسۆم $Ca^{++}$ ، ئاسن $Fe^{+++}$ . ئەم ئایۆنانە لەگەڵ سابووندا کارلێك دەکەنو ماددەیەکی ڕەق ناتواوەی چڵکن پەیدا دەبێت . لە چالاکی سابوونەکە کەمدەکاتەوە :–

$$M^{2+}_{(aq)} + 2Na^+C_{17}H_{35}COO^-_{(aq)} \longrightarrow 2Na^+_{(aq)} + M(C_{17}H_{35}COO)_2$$

سیتەریتی سۆدیوم — کەف سیتەریت

ئەو کارگانەی کە مەکینەو ئامێرەکانیان بە هەڵمی ئاو کاردەکەن دەبێت دۆخی ئاوەکە (ناساز) بگۆڕێت بۆ هەڵم لە بنکە سەرەکیەکاندا تاکو ئەو ئامێرانە بخاتە کار . پاشان ئاوەکە دەهێنرێتەوە . . . دەخەستێنرێتو دەکوڵێنرێتەوە تاکو ببێتەوە بە هەڵمو جارێکی دی سوودی لێوەربگیرێتەوە ، وە هەروەها . . . .

جا ئەگەر ئاوەکە بەم قۆناخانەدا نەبرێتو ئەو بنکە سەرەکیانە پاڵاوتە نەبێت ، ئەوا برێکی زۆر لەو خوێیانەی وەك بیکاربۆناتەکان بە کەمترین گەرما شیٚ‌دەبنەوەو نیشتوو پەیدا دەبێت ، بەرەبەرە دەبێتە ناوپۆشاندنی بۆریەکانو نیشتنی لە بنو لێواری تانکیەکاندا .

ئەو قاپو قاچاخانەی ناوماڵ دیاردەیەکی ڕۆژانەن کە دێتە ڕێمان

$$M^{2+}_{(aq)} + 2HCO^-_{3(aq)} \longrightarrow MCO_3\downarrow + H_2O_{(l)} + CO_{2(g)}$$

هێمای (M) لەبری خوێیەکانی کالیسیۆم ، مەگنیسیۆم ، ئاسن .

ڕێگایش بۆ چارەسەرکردنی ئەم ناسازیەیش زۆرە بەڵام باشترینیان بەکارهێنانی ئەو پێکهاتووە کیمیکەیە کە سلیکاتی ئەلەمنیۆمی $AL_2(SiO_3)_3$ تێدایە پیٚ‌ی‌دەوترێت زیۆلایت Zeolite کە ئاوێتەیەکی گلەسووری سروشتییە بریتییە لە : $Na_2O \cdot Al_2O_3 \cdot nSiO_2 \cdot xH_2O$

ئەم ئاوێتەیە ئایونی سۆدیۆمی $Na^+$ تێدایە دەکەوێتە ئایۆن گۆڕینەوە لەگەڵ ئەو خوێیانەی کە دەبنە ناسازی (بەتایبەتی هەمیشەیی) وەك لەم نیگارەدا دیارە کە بنکەیەکی پارزنین پیشان ئەدات :




ئەم ئاوێتەیە «زیۆلایت» توانای کەلێن پڕکردنەوەو هەڵگرتنی بارگەی نیگەتیڤی Ve– هەیە ، هاوکێشی ئایۆنە پۆزەتیڤەکان Ve + دەبن و لە نێو کەلێنەکاندا گوزەر دەکەن . ڕێکاری پاڵاوتنەکەیش بەم شێوازە دەبێت : ئاوی هەمیشە ناساز دەبرێت بەسەر زیۆلایتدا تاکو ئایۆنەکانی $Mg^{++}$ ، $Ca^{++}$ ، $Fe^{+++}$ , لەگەڵ ئایۆنەکانی سۆدیۆم $Na^{+}$ بکەونە ئاڵوگۆر . ئەو بەرهەمانەیش کە پەیدادەبن هەر ئایۆنی سۆدیۆمیان تێدایە بە تواوەیی بەڵام زیاندەرنین .

زیۆلایت - $(Na^{+})$ + $Ca^{++}_{(aq)}$ ⟶ زیۆلایت - $(Ca^{++})$ + $Na^{+}_{(aq)}$
ئاوی

لەم کارلێکردنەدا زیۆلایتی سۆدیۆم دەگۆڕرێت بۆ زیۆلایتی کالسیۆم . دەیشتوانرێت چالاکی زیۆلایتە تێربووەکە چەند بازەبکرێتەوە ، ئەویش بەتێپەڕاندنی گیراوەیەکی زۆر خەست لە کلۆریدی سۆدیۆم ، خوێیەکانی کالسیۆم و ئەوانی تر دەشۆرێنەوەو ئاوەڕۆ دەکرێنە دەرەوە . .

زیۆلایت - $(Ca^{++})$ + $NaCl_{(aq)}$ ——— زیۆلایت - $(Na^{+})$ + $CaCl_{2(aq)}$
ئاوی

ئێستا زۆر لەو ماددە پۆلیمەرانە هەن توانای ئایۆن گۆڕکێیان هەیە ناودەبرێن بە ئایۆن گیرەکان (وەك کەتیرە) . ئەمانە پێکهاتوون لە زلەگەردی ئەندامی ، لە کەلێنەکانیدا کۆمەڵێك ئایۆنی Ve + وVe ی تێدا دەخزرێت بۆ ئەم مەبەستە .



چێوەیەکی نەگەتیڤی Ve– زیۆلایت ئەو کەلێنە گەورانە دەردەخات کە کەتەبونەکان گل دەداتەوە ، پتە رەشەکان بریتین لە گەردیلەکانی ئەلەمنیۆم و سلیکۆن ، پتە سپییەکان گەردیلەکانی ئۆکسجین پیشان ئەدات .

جا لەبەرجۆری پێکهاتنی و سوودی زۆری دەتوانێت بەهۆی ئەو ئایۆنە ئاخنراوانە ئاوەکە پاكو بێگەرد بکاتەوە . ئەم کردارە تەنانەت لە ئەزمونگە کیمیکەکانیشدا ئاکامێکی زۆر باشی هەیە لە پاکیژێنی ئاودا .

٤ – زێراب و چارەسەرکردنی Sewage and Treatment

دیاردەیەکی ئاشکراو روونە کە شارەکان پێویستیان بە زێراب هەیە .

ئەو شارانەی کە نزیك رووبارو دەریاکانن ئەگەر زێرابیان بۆ دانەنرێت مەترسییەکی گەورە دێتە رێیان . . . ئەو دەمەیش ئاوپاکژێن دەبێتە کۆسپێکی فرە سەخت و گران و زۆر دەکەوێت لەسەر مرۆڤ .

بێگومان ئەو پیسەرۆیەی کە لە ماڵ و کارگەکاندا بە درەنگ و زووی دەرژێتە چۆم و رووبارو دەریاکانەوە . ئەگەر زۆر گرنگی پێ نەدرێت ئەوا دەبێتە مەترسی بۆ سەر تەندروستی ملیۆنان کەس و زیندەوەرانی تر .

ئەم دیمەنە سامناکە دەبێتە تێکدانی ژیواری ئەو ناوچەیە، جا ئەگەر ڕێکارێکی نوێ زانستانە بخرێتەگەڕ بۆ پاکژێنی ئاوی زێراب ئەوا ئومێدی ئەوەی لێدەکرێت کە ئەو ترسە دووربخرێتەوەو بکرێتەوە بە ئاوێکی ڕوونو بێگەرد ، بەڵام ئەو کۆسپە سەختەی کە لە ڕێدایە ئەوەیە کە تواناو سامانێکی زۆری دەوێت . ئەوەی کە دڵخۆشکەرەو ئومێدی باشەی لێدەکرێت ئەو بنگەو ئێستگەیانەیە کە ڕێکاری نوێیان گرتۆتەبەر بۆ چارەسەرکردن . هەروەك ئەو ڕێکارەی کە لە سروشتدا پەیڕەوی دەکرێت ئەویش : زێراباوەکە دەپاڵێورێت بە تۆڕێکی میتاڵی بۆ لابردنی ئەو تۆپەڵە زلانەی کە دەبنەگیریو تێکدانی ئامێرە هەڵێنجەرەکان ، ئینجا ڕۆدەکرێتە ستێلی گەورەی نیشتن کە تەرخانکراوە بۆ گردکردنەوەی هەرچی ڕۆنو چەوری ماددە ڕەقە ئەندامیەکانە ، تاکو بە ڕێگەی پەرتەشیکاری Partial Analysis بنیشێن . ئەو ماددە ڕەقە درشتانەیش کە نانیشێن خوێیەکانی گۆگرداتی ئەلەمنیۆم $Al_2(SO_4)_3$ و کلۆریدی ئاسنیك $FeCl_3$ یان تێدەکرێت تاکو ببنە ئۆکسیدەکانو هایدرۆکسیدە جەللاتینەکانو بتوانن ئەو مادە ڕەقە درشتانە بلکێنن بە خۆیانەوە ، ئەمە قۆناخی سەرەتای چارەسەرکردنە . لە قۆناخی دواییندا ئاویژێنی چینە چەوە ئەستوورەکان دەکرێت کە بەکترینا کراوە بۆ ئەوەی ئەو ماددە ئەندامیە هەڵاوێزانەی کە تواوەن بگۆڕێن بۆ ماددەی نائەندامی خۆگرو بێ بۆن . ئەگەر ئەم دوو قوناخە ئاکامێکی پەسندە بدات ئەوا دەتوانین ئەو ئاوە لەو ماددە ڕەقە هەڵاوێزانە پاکژە بە ڕێژەی ٢٥—٩٠٪ ، وە ماددە ئەندامیەکان بە ڕێژەی ٩٥٪ .

پاشان دوای ئەم کردارانە کلۆری تێدەکرێت بۆ کوشتنی بەکتریا زیاندەرەکان پێش ئەوەی لە پارزۆنگ بێتەدەر . لە هەندێ پارزۆنگ ئەم دوو قۆناخە دەکرێتە یەك ، ئینجا تەوژمێکی بەتین لە هەوا دەبرێت بە ناو ستێلە نیشتەرەکاندا بۆ ڕێخۆشکرن بۆ ئەو بەکتریایانە کە لە ماددەنیشتووەکاندا هەنو دەبنە هۆی شیبوونەوەی ئەو ماددە ئەندامیانە . پاشان بۆ ماوەیەك ئەو ستێلانە وازی لێدەهێنرێت تاکو بە شێنەیی ئەو ماددە هەڵاوێزانەی کە تیایدا ماوە بنیشێن ، ئینجا ئاو دەکرێت بەسەریانداو بە کلۆر پاکژ دەکرێت .

گرنگترین کردار لەم پاکژێنە نەهێشتنی ماددە ئەندامیەکانە چونکە نێوەندێکی زۆر گونجاوە بۆ فرازێی بەکتریاو کەمبوونەوەی ئۆکسجینی تواوە .

بۆ ئەم مەبەستە ڕێگەیەکی ئەزموونی هەیە بۆ زانینی جۆری ئەو ئاوە ، ئەویش دیاریکردنی بڕی ئۆکسجینی پێویستە بە زیندەشیکاری لەسەر ماددە ئەندامیەکان واتە ڕادەی بڕی ئۆکسجینی داخواز BOD (Biochemical Oxygen Demand) . ئەگەر بێتو ڕادەی BOD نزمبوو لەو ئاوانەی کە لە کارگەو گەڕەکی شارەکاندا دەڕژێنە زێرابەوە ئەوا ئەتوانین بڵێین ئومێدێك هەیە بۆ بوژانەوەی ڕووبارو دەریاکان . هەندێ وڵات ئەم کێشەیان تارادەیەك توانیویانە ڕابگرنو بە باشی هەوڵی بۆ بدەن . بەڵام وڵاتانیتر هەن کە هێشتا چارەسەرکردنی زێرابی هەر تیادا نیە . . بەڵکو هەروا ڕەمەکیانە ڕۆدەکرێت بەبێ ئەوەی نەخشەیەکی چارەسەرکردنی بۆ دابنرێت ، بێگومان ئەم ناکۆكو نارێکییەیش دەگەڕێتە بۆ ئەو ڕژێمو دەسەڵاتانەی کە تواناو سامانیان تەرخان ناکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە ناهەموارە .



چارەسەرکردنی زێراب .

## کاریگەری کیمیکە کشتوکاڵیەکان بۆ سەر ژیوار

## The Effect Of Agricultural Chemical On The Enviroment

چەند ئامرازە کشتیەکان لە پێشکەوتن‌و برەویدا بن . . ئەوەندە مێرووکوژی پێویست دێتەکایەوە . ئەم کارە یافتێکی ناهەمواری لێ‌چاوەروان دەکرێت . ئەو تێرە پەیینانەیش بە نەتەرات‌و فۆسفاتەکان لە جۆبارو کارێزەکاندا کە دەنیشێن زیانێکی گەورە دەخەنەوە . هەروەها کشتیاریشی لەسەر زەوییەکی فراوان‌و بوونی جۆرێك لەبەرهەم . . . نێوەندێکی گونجاو دەرەخسێنێت بۆ مێرووە زیاندەرەکان ، دوایش ناچار پەنا دەبرێتەبەر برێکی زۆر لە دەرمانی زیندەکوژەکان . ساڵانی چلەکان ئەو زیندە کوژە ئەندامیانەی وەك

دی . دی . تی Dichlorodiphenyl Trichloroethane هاتە کایەوە بۆ بنبرکردن وا ئومێد دەکرا کە بنبرکردنیان لە نزیك بووندا بێت . کەچی . . . هەر بە ماوەیەکی کەم دەرکەوت کە زۆر لەو جۆرە مێروانە نەك هەر بەرگری پەیدادەکەن بەڵکو دەبنە نێوەندێکی لەبار بۆیان .

بەو هەموو خاسکاری‌و نوێکارییەی بەسەر ئەو زیندەکوژانەدا کە دێت هێشتا مەترسی هەر هەیەو بگرە نزیکەی ٣٠٪ لەو دەرامەتە کشتوکاڵیانە بە فیرۆ دەروات . لە سەرەتادا کە D.D.T هاتە کایەوە وەك زیندەکوژێکی ئەندامی زۆر بە زوویی بلاوبووەوەو بێ‌ئەندازەیش بەکاردەهێنرا . بەڵام لە دواییدا دەرکەوت کە ئاوێتەیەکی خۆگرەو هەروا بە ئاسانی شی‌نابێتەوە ، لەبەرئەوە دیاردەیەکی سەیرنیە ئەگەر بڵێین چەپاڵەیەك لە زەوی نەماوە کە دی . دی . تی تیا نەپژێنرابێت . ئەگەر کیمیکانە لەم ئاوێتەیە بکۆڵرێتەوە دەردەکەوێت کە لەگەڵ گڵ‌و ئاوو توێژە چەورییەکانی گشت زیندەرێکدا تێکەڵاو دەبێت .

رەنگە بە رووالەت زیانێکی ئەوتۆی نەبێت بۆ مرۆڤ ، ئەگەرچی رێژەیشی ٢٠٠ ئەوەندی چەوری ناولەشی مرۆڤێکی ئاساییش بەرزبێتەوە .

ئەم تاقیکردنەوە بەسەر شیردەرەکانی تریشدا هەمان یافتی فسیۆلۆجی بەجێ‌دەهێڵێت . بەلام هەر لەگەڵ ئەوەیشدا دەبێت بە ئاگاو سەرنجەوە بەکار بهێنرێت ، یان زیندە کوژە ئەندامی تر بەکاربهێنرێت لەبری دی . دی . تی . بە مەرجێ خۆنەگربێت‌و لە چەند رۆژێکی کەمدا پێکهاتووە کیمیکیەکەی شی‌بێتەوەو بگۆڕیت بۆ ماددەیەکی بێ‌زیان بەو هەموو رەبازو هەوڵدانەیشەوە هێشتا ئەو کوژەرە کیمیکانە کاری خۆیان بە یەجگاری ناهێننە ئەنجام چونکە لەوانەیە هەر لە ماوەیەکی کەمدا مێروو پەیدابێتەوەو بەرگری بکات‌و بیکاتە نێوەندێکی لەبار بۆ خۆی .

بەلام ئێستا هەندێ رێگە هەیە کە زۆر بایەخی پێدەرێت بۆ لەناوبردنیان پێی‌ دەوترێت زیندەرێکاریەکان Biological ways ئەویش بە بەرەلاکردنی ئەو نێرەمێرووانەی کە توانای فرازێیان نیە ، ئەم رێگەیە لەوانەیە تارادەیەك رێ‌ی لە فرازێی بگرێت بە تایبەتی لەومێرووانەی کە تاکە گەرایەك فرێ‌ئەدەن لە ژیانیاندا .

رێگەیەکی تریش هەیە کە ئەویش بەکارهێنانی هۆرمۆنێکی تایبەتی‌یە بۆ شێواندنی سووڕی گەشاندنی ئەو گەرایانە تاکو نەبنە مێروو .

رەنگە ئەم رێگەیە چالاکانە کاری گرنگی خۆی بسەپێنێت ، لەبەرئەوەی کە ئەو گەرایانە هەر لەسەرەتای بوونی سروشتیانەوە بەرامبەری پەکیان دەکەوێت ولەناودەچن . . . بۆیە زۆر لە چفاتە زانست‌و رێکخراوەکان بایەخ‌و گرنگی ئەدەن بەم رێگەیە .

پەنگاندنی پیس‌بوون Pollution Abatement :

یان گەمارۆدانی پیسی . . . . زور پێشنیارو رێکار هەیە خۆی ئەدات لە چونیەتی نەخشاندن‌و گەڕانەوە بۆ ئامێزی جوانی سروشت ، ئەو چەمك‌و بۆچوونەی کە لە ئارادایە هەموو دەروانێتە گێراندنەوەی چەشنی بەکارهێنان‌و گەمارۆدانی

پیسەرۆی کارگەو بنگە بەرهەم هێنەرەکان . هەرچەندە ئەم ڕێبازانە تارادەیەك یافتێکی بەسوود بەجێ دەهێڵن بەڵام بەرەو چارەسەرکردنی کێشە ـ سەرەکیەکان تاسەر نابات ئەگەر ئەو وەداخوازییانەی مرۆڤ لە بواری ووزەدا ڕەچاونەکرێن و سنوورێکی لەباری بۆ دانەنرێت .

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ (خشتەی زۆر بوونی دانیشتوانی جیهان) دەردەکەوێت کە مرۆڤ تا لە زۆربووندابێت . . . . بە ئەندازەیەکی زۆرتر داخوازی ووزەی لەدوایە . دەتوانرێت پەناببرێتەوە بۆ بەکارهێنانی هەندێ لەو ماددە زیندەزانیانە (بایۆلۆجیانە)ی کە شی دەبنەوە بۆ بەرهەم هێنانی هەندێ ئامراز ، بەڵام لەوە دەکات کە تەنها چارەسەرکردنێکی یەجگاری نەبێت . ڕەنگە دابینکرن و ڕاگرتنەوەی ئەو ماددانەی کە پاشەڕۆی کارگەو ئێستگەکانی ووزەو پیشەساز ییەکانن نزیکترین لەو گیروگرفتە .

وەنەبێت چوونە ناخی کێشەکە تەنها هەر کەمکردنەوەی ووزەبێت ، بەڵکو تاکە دەروویەك بۆ ئەمە نافرازیێ و ڕاگرتنی ژمارەی دانیشتوانی جیهان و ئابووریکردنە لە وویستەمەنیەکانی مرۆڤ بە پێی پێویست .

ئەم کارە وەنەبێت داهێزانی جۆرو ئاستی ژیان بگەیەنێت بەڵکو مەبەست بەرهەم هێنانی وویستەمەنی چاك و پتەو تاکو زۆر بمێنێتەوە . بۆ نموونە دەتوانرێت خانووبەرەیەکی جوان و نەخشین دروستبکرێت و بۆ سەدان ساڵ گوزەرانی تیادا بکرێت ، یان تەکنیکاری ئێستا بتوانێت ترۆمبێلێك ساخت بکات پتر لە ٢٠–٣٠ ساڵ بەرگەی کاروگوزاری بگرێت ، یان ئامرازو وویستەمەنیەکانی ناوماڵ ڕەنگە بەشی بەرودوا بکات . جا ئەگەر ئەم جۆرو چەشنە پێویستیانە تاسەر بێت لەوانەیە ئەو ئەرکەگرانە بەسەر ووزەوەیە سووك ببێت و هەرزانیش بێت . ڕەنگە لە سەرەتادا ووزەیەکی پتر لە ئاسایی پێویست بێت تاکو ئەم شتومەکانە بهێنرێتە بەرهەم بەڵام بەکارهێنان و کارپێکردنەکەی تاسەر جێی ئەو ئەرکە سەرەتاییەی دەگرێتەوە . ئەگەر لەسەر ئەم ڕێبازە ڕەفتاربکرێت ئەوا ئومێدی بۆ خاوێنی ژیوار لێدەکرێت . . . واتە ئەگەر بتوانرێت هێزی ووزە کەم بکرێتەوە ئەوە دەتوانرێت لێوەی ڕا گەرمی و ڕێژەی $CO_2$ و ئەو گازە ژەهرانەی کەش نزم بکرێتەوە ، هەر لە هەمان کاتیشدا دەتوانرێت سنوورێك بۆ کانەووزەکان دابنرێت و بخرێتە ژێر دەسەلاتەوە . مەگەر هەر بەم چەشنە ڕێبازو لێکۆڵینەوەیە بتوانرێت ئەو بارە ناهەمواریەی کە مرۆڤ گیرۆدەی بووە دابین بکرێت ، لەبەرئەوە مەبەستی پەروایان هەر کەمکردنەوەی ووزیە لێرەدا بە هەموو دیاردەو جۆراو جۆرێکیەوە با پەیوەندیەکی ڕاستەو خۆیشی نەبێت . بۆ نموونە دەشێت ئەو قاپ و کوپە کارتۆنانە بەکارنەهێنرێت چونکە چڵکی و پیسی دەخەنەوە ، جگە لەوەیش کە لە تێروانینێکی ئابووریانەوە بە دەستبڵاوی دادەنرێت لەووزەدا .

بێگومان دیاردەیەکی سروشتیشە کە بەرهەم هێنانی ئامرازو پێویستیەکانی ژیان تاسەر . . . . کارەدەکاتەسەر هێزو بازوی ڕەنجدەران ، بێکاری زۆر دەبێت لە زۆر وولاتانی جیهاندا ، ناچار . . . . دەبێت پەناببرێتەوە بەر ئامێرەکانی بەرهەم .

بەڵام ! ! ! . . . ئەو ناهەمواریانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕژێمە ئابووریە نارەواییانەی کە ناسازێن لەگەڵ خواست و ئارەزووی گەلدا .

کەواتە پێویستە ڕژێمێکی ئابووری بەسوود بێتەکایەوە ، بە جۆرێك بێت هاوڕەوتی تەکنە گۆڕانی پێشکەوتن بێت بۆ ژیانێکی خۆش و ئاسوودە .

### زاراوەکان

١ – زیوار : ژنگە : بیئة
٢ – دژند : قەڵایەکی دژوار
٣ – جامخانە : خانووی شوشەبەند : بیت زجاجی : Glass – house
٤ – بەرهەمی لاوەکی : ناتج جانبي : Side – product
٥ – تەمکادی : لە زماندا دەشێت دوو ووشە لێك بدرێت بۆ پێکهێنانی زاراوەیەکی نوێ هەروەك لە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیدا هەیە ، بۆ نموونە (دخان + ضباب) بۆتە دخاب ، (Smoke + Fog) بۆتە Smog .
٦ – ووزە ڕاهێزان : مولد الطاقة : Energy Power

# حەیرانۆك

«ڕێژەن بناڤی»

## پێشەکی

ژین ، سروشت ، وارگەهـ ، گوند ، زوزان ، کوچەری
هاتن‌و چون‌و بزاڤ‌و کاروانی‌و خەریبی‌و ئەڤین‌و سۆزو شەڤێ
درێژو بێ ئارام ئەڤەو هێژو هێژ . . د جڤاکەکی‌دا مینا جڤاکێ
کوردەواری ، دکەڤندا هەتا ڤی دەمی ژی ل هندە کوژێکێ
کوردستانێ پێد بووینە هۆیەکا بنەرەتی بو ژ دایك بوونا سۆزەکێ
زەلال کو ژ دل‌و دەرونێد گەنج‌و تولازێد ڤی واری بنزێتن‌و خ
کەرب‌و کین‌و وەستیانا کارێ روژێ‌و خەریبی‌و خەون‌و خەم
ئارونکا تێکەل بکەن‌و ب ئاوایەکێ تەڕو نازك بڤەهینن
بەرامبەری ئێك دوو ب ئاوازەکێ تژی نازو نازداری بسترین
شەڤێد درێژێد بێ دوماهی پی ب خەملین‌و کارێ رۆژێ ل
ئاقاراو چوونا مازیاو رێکێد بێری‌و . . هتد ، پێ تژی هیڤی
ئارام‌و سۆزبکەن . ئەڤانا هەمیا پێکڤە دژیانا کوردەواری‌دا جور
بەرهەمەکێ پیری ژیارو ڤەژین‌بێ پێك ئینای کو دبێژنێ
(حەیرانوك) .

ل ڤێرێ مەنەڤێت ب درێژی ل سەر بابەتێ حەیرانوکێ
باخڤین چونکی چەند بنڤێسین (حەیرانوك) بخوژ ئاخڤتنا مە پێ
پێناساخو دکەتن‌و ئەڤەل خارێ ژی حەیرانوکەکە بابەتێ وێ ژی
وەکی بابەتێ هەر حەیرانوکەکێ‌یە ، کو ئاخڤتنە دناڤبەرا دو
ئەڤیندارا داو هەر ئەڤیندارەك نازو قوربانی‌و ئەڤینا خوبو یێ دی
ئاشکرا دکەتن .

\+ کوڕکۆ دینۆ . .
ئەزا کوڕتم بلند نابم
زێڕێ زەرم خراب نابم
مازویا شینم بێ بها نابم
ئەز یا تەمە لێڤە نابم .
\+ کوڕکۆ دینۆ . .
ئەز گولم یا ب گولێ‌ڤە

یا ب هنداڤ تاکێ رێڤه
دەستێ کەسێ ناگەهێت من
ژبلی پێ لاوکێ من پێڤه
– کچکێ دینێ . .
ل سەربانا تێم‌و دروینم
خالا خەلکی درەوینم
ئەز ئاشقێ . . چاڤێت شینم .
– کچکێ دینێ . .
دێ بلا بلا
هەرە ناڤ حەودێ . . بشکێنە گولا
دیتنا سەربانا تەناهیا دلا .
– کچکێ دینێ . .
ئەز کەوم کەوەکێ نێرم
بەر ملکا ژووردا گیا دبژێرم
ئەز ئاشقێ . .
. . چاڤ‌و برویێت ژنکێت ب مێرم .
+ کورکۆ دینۆ . .
ل سەربانا . . مەش‌مەش نەکە
ئاگرێ جگارێ ل من خوەش نەکە
ئەز یا تەمە . . خوە شاش نەکە .
– کچکێ دینێ . .
ئەز کەوم کەوەکێ دینم
ل بەر ملکا تێم . . ل دەر دولکا دخوینم
ئەز ئاشقێ بەژنکا شرینم .
+ لاوکێ دلێ من کەوێ لەنگە
بەژنا بلند . . شوخ‌و شەنگە
دێ وەرن داوەتا من‌و لاوکی من بکەن لە درەنگە .
+ کورکۆ دینۆ . .
د دەرێ خانیێ مالا بابێ منرا بوری . .
. . تە سلاڤ نەکر

کراسێ منێ دریای بو ، تە شەرم ژێ نەکر .
– کچکێ دینێ . .
من نە ژ ئەوێ چەندێ بو
کراسێ تە ل‌بەر من ئەتلاسێ شامێ بو
نێ ئەز دا سلاڤێ لتە کەم . .
. . چاڤێ دوژمن‌و نەیارا لێ بوو .
+ کورکۆ دینۆ . .
دەردێ دلا بلا ژ دل بیت
شوینا خزێمێ بلا قەرافل بیت
شوینا کەمەری بلا طەنگا کەرێ کول بیت .
+ کورکۆ دینۆ . .
دێ چینە زوزانا پێکڤە پێکڤە
دێ کەپرۆکا چێ‌کەین شەقلە بسەرێکڤە
دێ حەفت نیڤەکێت شەڤێ خوە کێشین . .
. . بنك ئێکڤە .
– کچکێ دینێ . .
من حالێ زوزانا نینە
نە من هەسپە . . نە ماهینە
نە من صەنە . . نە تاژنە .
– کچکێ دینێ . .
نە من دەشتە . . نە زوزانە
نە من کولە . . نە کوڤانە
نێ من دەردە . . نە دەرمانە
حەکیم خودێ‌یە لوقمانە .
+ کورکۆ دینۆ . .
بەژنا بلند بلندیا
یا دهەژینیت لەوەندیا
من لاوکێ خوەیێ ژێ‌گرتی ژ ئەجنەبیا .
– کچکێ دینێ . .
بەژنا بلند دارا رێلا

بەژن کورتیٚ هرچا شکێرا
ناڤنجیٚ کۆما زێرا .
-کچکیٚ دینیٚ . .
بەژنا بلند ل بەر گوتنیٚ
بەر کرین‌و ل بەر فروتنیٚ
ئەز دیٚ لیٚدەم رحکا شرین . .
. . مالیٚ دنیٚ .
+ کورکۆ دینۆ . .
هەکە تە خت نەبیت من پیٚ بینی
هەکە تو عەشیرەت نەبی من برەڤینی
ما تو بوچی ل کلێسا . .
- . . بابیٚ خو نارینی ؟
+ نا تەبتیت . . نا تەبتی
کورکۆ دینۆ نا تەبتی
تە چی‌یە ل دەریٚ خانیٚ . .
. . مالا بابیٚ من دخەبتی ؟
کورکۆ دینۆ . . هەکە تو زێدەکەی دیٚ چم . .
. . نك قایمقامی نك زابتی .
- کچکیٚ دینیٚ . .
چیا بلندن بیٚ دار نابن
شیڤ‌و شەوال دبیٚ دوپیشك‌و مار نابن
کچ ژ حەفت سالیٚ پێڤە دبیٚ یار نابن .
- کچکیٚ دینیٚ . .
مالکێت مە بیٚ ل سەریٚ گری
من لەپەکیٚ خولیٚ ب سەریٚ تە وەرکری
مە گرتی ئەڤە حەفت سالە تو یا مری !

**تێبینی :-**

• ئەڤ حەیرانوکە من ژ زاردەڤیٚ دایکا خوە وەرگرتی‌یە کو ژی‌یٚ وی (٥٣) سالە ، هەروەسا برا (عبدالوهاب خالد)ی هاریکاری‌یا من کر بو ئامادەکرنا پێشگوتن‌و کێشێت ویٚ .

## کات

هەرکەسیٚ شەیدای کەلەپووری نەتەوەکەی‌بیٚ‌و سەودای گەران بە دوای کۆکردنەوەو تۆمارکردنی بابەتە هەمەجۆرە فۆلکلۆری‌یەکان بێت ، ئەوا هەمیشە تووشی چەندان داب‌ونەریتی کوردەواری یان داستان‌و سەربردەی ئەوتۆ دەبیٚ کە زۆر لە خوێنەرانی کورد گوێبیست نەبوون‌و چاویان پیٚ‌نەگەشاوەتەوە ، سەرەرای ئەو مرۆڤانە . . کە لە سوچێکی ئەم وولاتە زێدە ئازیزە لە پال شاخێك وەیان لەبەر دەرگای ئەشکەوتێکی زەمانی زوو . . روو بە روو بەرانگاریان دەبیت ، بەمەرجیٚ بتوانیت بخزیە ناخیان . لێرەدا زیاتر هەست بە بوون‌و مەزنایەتی خۆت‌و میللەتە رەگ‌داکوتاوەکەت دەکەیت‌و ئەو هەولیٚ تەقەلاٚ تاکە کەسی‌یەی رۆشنبیران بە گشتی‌و فۆلکلۆر پەروەرەکان بە تایبەتی ، دەبێتە بچوکترین دلۆپە ئاوی دەریای گەنجینەی نەتەوەکەت .

بۆیە،بۆ جاری هەزارەهەم دەڵێم : هیممەتێك بۆ ئەم مەبەستە برای رۆشنبیرو فۆلکلۆرپەروەر . . ئێوەیش مامۆستایانی سەرۆك‌و دەستەی نووسەرانی گۆڤارو رۆژنامەکان ، دەخیل ؟

هەرچەندە ئەم نووسینەی بەردەستتان ئەنجامی سەردانێکی فۆلکلۆریانەی چەند رۆژێمەو پووختەی گفتوگۆیەکی دوو سیٚ شەوی پایزە کوێستانی بناری (ماکۆك)و (سەرئەشکەفتان) بەرامبەر بە قۆپکی (شنە)و ، لەسەر تاتە بەردی (خاوەر زەمین)ە ، بەلاٚم فراوان‌تر لە ریپۆرتاژی رۆژنامەنووس ، بەڵکو

# ... فۆلکلۆر دەدوێ

ئەسعەد عەدۆ

بریتی‌یە لە چەند نموونەیەکی فۆلکلۆری تایبەت بە ناوچەیەك .

هەرێمی خاوەر زەمین (بێتواتە) بە هەندێك داب‌ونەریت‌و کارە میللەکانی‌و بە شاخ‌و داخی سەربەرزو جۆگەو کانیاوی ، خۆی لە خۆیدا پاشماوەو کەلەپوورێکی کوردەواری‌یە . بێتواتەیش وەك هەموو ناوچەکانی‌تری کوردستان خاوەنی کەلەپوورێکی یەکجار زۆرە بەلأم ئێمە نموونەی هەندێ لەو بابەتە فۆلکلۆریانە دەخەینە بەرچاو کە تا رادەیەك لە شوێنێکی‌تری کوردستاندا بە تایبەتی لە ناوچەی دەشتاییدا نیە .

### بەیتی زێرنۆکێ

سەربردەی زێرنۆکێ دەگەڕێتەوە دووسەد سالێ لەمەوبەر ، کە پیاوێك لەم بێتواتەدا هەبووە بە نێوی (مام قادر) ئەمەیش کچێکی خۆرەنگی قەشەنگ‌و جوانی نێو زێرنۆکی هەبووە . هەروەها گەنجێکی نێو ئاورەحمان کە خەڵکی ناوچەی موکریان بووە ، جا لەبەر هەر هۆیەك بێ دێتە بێتواتەو داوا لە میری بێتواتە دەکا چەپاڵەی بدات . بەم شێوەیە لەم هەبڕینەمدەمێنێتەوە . . ئاورەحمانیش هەر لە یەکەم رۆژی هاتنی ، موتووی زێرنۆکی کچی مام قادر دەبێ‌و هەر لەبەر ئەم هۆیەوە ماڵی میرانی بەجێ‌هێشتووەو بۆتە سەپانی ماڵی باوکی زێرنۆکێ .

رۆژێکیان لەکاتی دروونەکردندا مام قادرو ئاورەحمان دروونە دەکەن‌و زێرنۆکێش پشتی‌کێشیان بۆ دەکا ، مام قادر بە ئاورەحمان دەڵێ :

«ئەگەر بەندی دروونەی دەزانی بۆمانی بڵێ . . خەڵکی کوێستانێ بەندان گەلەکە ئەزانن» . ئاورەحمان بێ ئەوەی هەست بەوە بکات کە مام قادر لە گەڵیانە دەست بە بەند گووتن دەکاو زێرنۆکێ‌ی بەردلأن دەلاوێنتەوە :

سەفەرێکم کەوتە پێش دەڕۆم لە بۆ بێتواتێ
بۆ کن میری خۆشناوان بە نۆکەری قەلأتێ
هەردوو دەستی ماچ دەکەم بەڵکو زێرنۆکێم داتێ
ئەز قاسیدێ زێرنۆکێم سوبەی دەڕۆم سەحەری
کاڵەکێ خۆم لەپێکەم لەخۆ دەدەم کۆدەری
دەچمە کن بابی زێرنێ حەوت ساڵان بە نۆکەری
دەبمە شوانی بەرخۆڵان جارجاریش بە مەیتەری
چاوی زێرنۆکێ جوانن وەك ئەستێرەی سەحەری
دەچمە کن وەستاکاران دروست دەکەم دەراوان
دەچم لەبۆ بێتواتێ ئەو میرەدێ‌ی خۆشناوان
دەبیەم لەبۆ زێرنۆکێ بەڵکو هەڵێنێ چاوان
زێرنۆك لەبەر پەرێزێ ئارەق لەسەر رووانی
دەڵێ‌ی شووشەی گوڵاوە خوناوی سەر کوڵانی
زێرنۆك کە پشتی‌کێشە خۆم دەبم بە سەپانی
دەچمە کن وەستاکاران دروست دەکەم خرخالأن
دەبیەم لەبۆ زێرنۆکێ وەك کیژی گەورە ماڵان
پەرچەم ڕەشە ڕەیحانە باقەی سوسن‌و هەلألان . . . .
تاد .

## مەڕو بزن بڕینەوە

پیشەی مەڕوبزن بڕینەوە لە چوار چێوەی کوردستاندا باوەو هەموو ماڵێکی خاوەنی مەڕو ماڵات ئەمەیان کردووە . ئەم کاریەیش پسپۆری تایبەتی خۆی هەبووە . بۆ ئەمە مەبەستەیش خاوەن مەڕو بزن لە ڕۆژێکی دیارکراودا (بەرانێك) یا (نێرێك)ی ، قەڵەوی دەکوشتەوەو کابانیش بە پلاوساوار یان کەشکەك لێیدەنا .

بڕێنگ برانیش . بڕێنکیان لە ئەستۆی خۆیان دەناو بە قەنەنە کێشان بەرەو هەوێزی دیارکراو دەهاتن‌و دەستیان بە مەڕوبزن بڕینەوە دەکرد . لەکاتی کارکردندا ئەم گۆرانیەیان دەگووت :

زستان ڕۆیی بەهار هات دونیا هەمووی ژیاوە
گوڵان لەناو گوڵزاران دەستیان لەمل یەك ناوە
لەبن شاخ‌و قەد پاڵان هەر کانیاوو شەتاوە
هەوران هەر گاڵە گاڵە لە شاخان لە کوێستانان
لەساملەندی مامەشان سپی ڕێزی خەیلانیان
لە کوێستانی هەزار گوڵ لە گۆڕی بێرەوانان
قەندیل‌و پیرەمەگرون لە یەك دەکەن سلاوان
قیرەی مراوو قازان لەسەر گۆم‌و دەراوان
وەك قەتاری کچۆڵان نازدارو زی بەدراوان
هەموویان شەنگەبێرن هاتن‌دەر لە ڕەشماڵان
زرینگەی بازنیان دێ بۆ چەهـ چەهەی خرخاڵان
هۆ هۆی شوانان وادێ مەڕ گەیە دانگەی ماڵان
خوایە نەنێری ئەورۆ چ نەرمە پشیە (با) یان
خوری‌و مەرەز دەفڕێنی دەیکاتە هەلوەلایە
سەگان لە دەوری مێگەل دەکەن چەغرە سەمایە
دەزووکەن دەست‌وبردی وادێ گورژنی (با)یە
سەروماڵمان تێك ئەچێ خودایە لەم بەلایە . . . تاد

## بن مێو کێلان

لە دێهاتی ناوچەی خۆشناوەتی ، بە تایبەتی ئەم دێهاتانەی ڕەزی مێویان هەیە ، نێوان مێوەکان بە جووتەگا دەکێلدرێ . بەڵام گاسن ناگاتە ژێر دارمێوەکان ، بۆیە کۆمەڵێك لە گەنجان بۆ ئەم مەبەستە پێمەڕەو بێڵ دەبەن‌و بن‌مێوان بەم گۆرانیەوە دەکێڵن :

ئەوا بەهارەو شەماڵ دەلاری
دەیدا لە گۆمکەو خەزەڵی داری
شەماڵ ئەوادێ لە لای کوێستان
سلاوی دەکا لە باغەوانان
دەڵێت قاسیدێ بووکە بەهاری
مێوانی مێوو ئاژەڵی داری
شمشاڵی لێدەن گۆوەندێ ڕێزکەن
مێوان بکێڵن ، داران بەهێزکەن
میرێ دار چۆمان پیرە چنارە
بەگزادەی چۆمان دار ئەسپیندارە
کیژۆڵەی چۆمان خۆ دارە مێوە
بووکێ لە باوان هەڵووچەو سێوە . . . . تاد

## دێ‌کردن

لە وەرزی پایزدا خاوەن بزنەکان لە بەنی ، دەچنە نێو پاوانی تایبەتی خۆیان بۆ گەڵابەڕوو کردن تا لە وەرزی زستاندا سوودی لێوەربگرن ، هەندێك گەڵا دەبڕن‌و هێندێکیان وەستا کارانە لەسەر داربەڕووی دوو لك ئەو گەڵایە دادەنێن . . بەمەرجێ ئاوی باران بە نێوانیاندا نەڕوا . . بەمەیش دەڵێن (دێ) ، هەندێکیش هەن ئەو گەڵایە دێنێتە نزیك ماڵان‌و داری بۆ ئەچەقێنن بەمەیش دەڵێن (قوریە) .

ئەو دێیە دەمێنێتەوە تا بەفرو کرێوە دەباری‌و توانای ئاژەڵ‌بردنە بەنی نابێت ، لەوکاتەدا ئەو گەڵایە لەسەر بەفر بلاوەی پێ‌دەکەن بۆ ئەوەی ماڵاتەکەی بیخوات‌و پێ‌ی

ـێت . لەکاتی دیکردندا گەنجەکان ئەم گۆرانیە دەچرن :

مام حەسەن‌و مام ئەحمەد ، کاك ئۆمەرو خاڵ حەمەد
هەموو ساحێب حەیوانن لە دێیان چاك دەزانن
زستانێ دەگەرمێنن ، هاوینان لە کوێستانن
لەناو حەوشێ مزگەوتێ دەپێشی جەماعەتێ
خدراغای سەری‌کانێ رووی دەکردە خزمانی
رووی‌کردە لای تۆلازان سبەی بەری‌بەیانی
لە پاوان‌و لە رازان بۆ ماڵە پوورە خەجی
هەمووتان گوێتان لێبە سبەی زبارە دێیە . . . . تاد

## چاڵە بەفر

لە دێرزەمانەوە خەڵکی شاخاوی لە وەرزی زستاندا ، چاڵێکی بازنەیی یا چوار گۆشەیی قووڵ‌و بەرینیان هەڵدەکەندو بەفری دەوروبەری چاڵەکەیان کۆدەکردەوە ریز بە ریز لەگەڵ (کا) ، بە پەستن چاڵەکەیان شیش‌کووت دەکرد . . لە کۆتاییدا هەندێك (خوێ)یان ، بە بەفرەکەدا دەکردو بە گەڵای داربەروو دادەپۆشرا . لە وەرزی هاویندا سەری چاڵە بەفرەکە واڵا دەکرایەوەو بەفرەکەیان بەکار دەهێنا بە فرۆشتن یا بەخۆرایی .

کارکەرانی چاڵە بەفر بەم گۆرانیەوە کارەکەیان جێبەجێ دەکرد :

وای لە دەستی زستانێ
سەرماو سەهۆڵ بەندانێ
جێگەی گەمەو گەرانێ
هەر دەوری ئاگردانێ
لە مانگی رێبەندانێ
عالەم دێتە هەژانێ
چوولیمێی ئەشکەوتانێ
بەفرێ گۆتە بارانێ
لێم‌گەرێ تا دوو رۆژان
کفن دەکەم بە بەریان
لە گەرمێن‌و لە کوێستان
دونیا دەکەم بە شەختان
دەبەستم ئاوی بەستان
گەلی خزمان ئەمرۆکە
بیست‌و یەکی گۆرانە
کرێوەو بەفرە بایێ
دەگاتە شیلکەی رانان
بەفری سپی کوێستانان
کەوتیتە هەردوو بانان
بەفری سپی کەلیخان
کەوتیتە دۆڵ‌و شاخان
بەفری سپی سەهەندی
تام خۆشتری لە قەندی
سەرپۆشی کێوو هەردی
بەفرێ داکەن بە مەردی . . . . تاد

## ئاهەنگی بروانامەی مەلایەتی

لەکاتی خۆیدا بروانامەی مەلایەتی (الاجازه العلمیة) گەورەترین پلەی زانستی‌و ئەدەبی ئەو سەردەم بوو ، زۆربەی هەرە زۆری کەلە شاعیرو ئەدیبە کوردەکان دەرچووی قوتابخانە ئاینیەکان بوون ، بۆ مەبەستی خوێندنیش فەقێیانی کورد چوارچێوەی کوردستان دەگەران‌و چ خانقاو مزگەوت نەدەما سەری پێدانەگرن . . تا بروانامەیان وەدەست دێنا .

ئەو بروانامە وەرگرتنەیش ئاهەنگی تایبەتی بۆ سازدەکرا ،

**ئەو فەقێیەی بروانامەی لەلای مەلایەکی بروانامەدار وەردەگرت ، دەبوایە :**

١ – ئەو پلەیەی کە ئەبوایە بروانامەی پێ‌ئەدرێ فەقێیەکە تەواوی کردبێ .

٢ – ئەو فەقێیانەی کە لە قوتابخانەی (فەقێ ئامادەکراو بۆ بروانامە)دا هەبوون ، نامەیان بۆ فەقێیەکانی دێهاتی دەوروبەر دەنووسی‌و بە مۆری ئەو فەقێیە مۆر دەکرد .

٣ – فەقێیەکان نواندنیان پێشکەش دەکرد بێ ئەوەی (براوە – بڕۆقە) بکەن ، ئەو نواندنەیش بارودۆخی کۆمەڵایەتی دەخستەڕوو بە تایبەتی (خاوەن دوو ژن)و (شێخی درۆزن)و (پارە پەرست) .

٤ – لە نواندنێکی پاشاو وەزیردا ، پاشا بڕیاری خۆی بەسەر سەرەك هۆزو دەوڵەمەندەکان دەچەسپاند بۆ هێنانی (چا)و (شەکر)و کەلوپەلی‌تر ، ئەمەیش بە مەبەستی باروبووی فەقێ بوو ، بڕیارەکانیش بە دڵێکی فراوان جێبەجێ دەکرا . ئەگەر خوانەخواستە جێبەجێ نەکرابوایە ، ئەوە دەبوایە تاوانبار بە جلەوە فڕێ بدرێتە حەوزی مزگەوت . لەکاتی ئەو نواندنەیشدا دوو فەقێ سیما جوان لە پشت پاشا رادەوەستان‌و ئەمەیان دەخوێندەوە :

کورد میللەتێکی قەدیمە ساحێبی تەبعی سەلیمە
شاهیدی ئەم ئیدعایە سەلاحەدینی پاشایە
کورد میللەتێکی ناسراوە لە مەعاریف بەجێماوە . . .
تاد

**ئەو مەلایەی کە بروانامەی دەدا فەقێیەکە دەبوایە :**

١ – خاوەن بروانامەبێ

٢ – جوبەو مەندیلێکی بە پارەی خۆی بۆ ئەو فەقێیە بکڕێ

٣ – لە دوای کردنەوەی ئاهەنگی بروانامە بە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز مەلا هەڵدەساو بروانامەکەی بە زمانی عەرەبی دەخوێندەوە لەگەڵ چەند ئامۆژگاریەك بۆ مەلای نوێ .

**ئەرکی خەڵکی گوندەکە :**

١ – مەسرەفی یەك هەفتەی ئاهەنگ .

٢ – لە رۆژی بروانامەدا دەبوایە هەموو ماڵێك گۆشت‌و پلاو بنێرێتە مزگەوت .

٣ – هەندێك جار خواپەرستێك کچ یا خوشکێکی خۆی پێشکەش بە مەلای نوێ دەکرد .

لەکاتی هەڵپەڕکێی ئاهەنگەکەدا هێندێك لە فەقێیەکان لەسەر ئەو ئاوازە هەڵدەپەڕین ، بەم جۆرە تا پێتی ئەبجدی کۆتایی پێدەهات :

ئەلفەکی ئا ئەوەلی ئا ئوئلی مۆلی من المۆلی مو ئا ئا
بێیەکی با ئەوەلی با بوبلی موبلی من الموبلی مو با با
تێیەکی تا ئەوەلی تا توتلی موتلی من الموتلی مو تا تا . . .
تاد

**سەمەنی**

لە زەمانی زوو ئەو سەمەنە بە بۆنەی جەژنی نەورۆز سازدەکرا ، دوو مانگ بەر لەهاتنی نەورۆز . . هەندێك گەنمیان لە نێو (ئینجانەی گلیدا) دەچاند ، لە رۆژی (٢١) ئادار ئەو گەنمەیان هەڵدەکەندو ژێرەوەو سەرەکەی هەڵدەقاچران‌و قاچە سپییەکەی دەمایەوە ، ئینجا لەگەڵ ئاو دەخرایە نێو مەنجەڵێك‌و ئاگریان دەخستە ژێرەوە . کوڕو کچانیش بە چەپڵە ڕێزان ئەم گۆرانییەیان دەگووت :

لە گۆمەڵی بەهاری بەفر نەما لە شاخان
تەژندەر دێنە خواری
بیست‌و یەکی ئاداری
سەمەنی دێتە کاری
لە دەوری ئاگردانی
دەکەن چەپڵە ڕێزانی
ئەم قەرسیلە جوانە
دەڵێی بسکی کچانە
سەمەنی چەند شیرنە

دەڵێ ی مێوژی سەلأنە
رابێ کچە جوتیارە
لە سەمەنی ئاگادارە
رەپستەی ناو ئینجانان
هەروەکو مێرخوزاران
فاتم کچە سەپانە
بۆ کردنی سەمەنی زۆر باش‌و زۆر کابانە
یاخواو یا پیرەشالیار
بە عام پیرۆزبێ بەهار . . . . تاد

## مازی چنین

ئەو دێهاتانەی بە دارمازو بەناوبانگ بوون ، لە رۆژێکی دیارکراودا برا گەورەی گوندەکە بانگی رادەهێشت کە بەیانی دەچنە مازی چنین ، ئینجا کورو کچانی گوندەکە خۆیان ئامادە دەکردو نانیان دەگەڵ خۆ دەبرد ، بەم گۆرانیەوە کارەکەیان ئەنجام دەدا :

هەرایە وەی هەرایە ئەمشەو بانگە سەدایە
لەبۆ مازی چنینێ شا قەدەغەی نەمایە
کچ‌وکور زەردو سۆرن وەکی گوڵێ بەهارێ
دەڵێن بۆ مازی چنینێ رێگایدا مام کوێخایە
لە مێرگۆڵەو لە دۆلأن کوروکاڵ‌و کچۆلأن
مازیانن بۆ زۆر بکەی بە پیرەکەی سندولأن
لەسەر کانیا رێزانێ کچان دەکەن دیلانێ
کوران دەکەن سەیرانێ بە یادی چاو جوانێ
فاتم دەڵێ هەمینێ رابیلێ خاتوو زینێ
کلدانم بۆ بنێرن دەچمە مازی چنینێ
دەنگی گۆرانی کوران لە بالۆرەی کچۆلأن
هەروەك دەنگی شمشاڵێ دەنگیان دەروا لە دۆلأن . . . تاد

## داردەلامە

لە رۆژانی جەژن کچان دەچوونە ژێر دارگوێزێك‌و بە کندرو تەختە دارێك جۆلانەیان دروست دەکردو دووان لەسەر تەختەو دەست بە کندرەوە رادەوەستانو یەکێکی تریش لە ناوەراست دادەنیشت . . بەو شێوەیە لەگەڵ هەژانەوەیان ئەم گۆرانیەیان دەگووت :

لە پردێ باسان کاریتەی مێوە
گەییمە نازدارێ کور بە بەرێوە
کوێرایم دابێ ماندوو بوو پێوە
لە پردێ باسان کاریتەی شکێ
یار زۆر منداڵەو لێم‌دەگری رکێ
لێ ی تێ‌گەیاندووم خەڵکی گەرەکێ
لەپردێ باسان کاریتەی مازی
ئەو کورە منداڵە چۆن بیکەم رازی
مەگەر بیبەم بۆ مەلاو قازی
زێ‌بێ بادینان شینی بە شینی
نێوانی مەمکان شانەی هەنگوینی
خۆزگەم بەو لاوەی دەیخوا لە خورینی
زێ‌بێ بادینان دێت‌و دەسافێ
شەپۆلأن دەدا لە بنەی کوشافێ
ماچی سەر کوڵمەت وەکی تەوافێ
لەپردێ باسان عێلێ بەرەو ژوورە
ئەو کورە منداڵە بۆیە مەغرورە
منی کوشتووە خۆی بێ شعوورە . . . تاد

## عامیە

لە گوندی (هەرتەل) ، کاتێ (رێواس)و (کەنگر)و (دۆریە)و (دۆمەلان)و (کارگ)و (ترشۆکە) پێ‌دەگات ،

کچ‌وکوڕانی هەرتەل وولآخان دەبن‌و ماوەی سێ شەوو سێ ڕۆژ لە چیا دەمێنەوە . ئەو ماوەیەیش بە شایی‌و هەڵپەرکێ بەسەردەبن‌و لەگەڵ شایی (سێ‌پێ‌یی) ئەم گۆرانیە دەڵێن :

ئای لە مێگەلآن وای لە مێگەلآن
ئای لە مێگەڵی دەخۆشناوان
مەڕم بەردایتە دەراوان
وەرنە سەیری زی بەدراوان
ئای لە مێگەلآن وای لە مێگەلآن
ئای لە مێگەڵی مام ئاکۆیان
مەڕم بەردایتە هێرۆیان
وەرنە سەیری چاو هەڵۆیان . . تاد

## بەیتی شەم‌وشەمزین

هەروەکو بیستراوە گوایە شەمزین خەڵکی گوندی (وەلآشە)ی ، باڵەکیان بووە . باوکی نێوی (حەمەد ئاغا) بووە . خاتوو شەم ئامۆزایاتی‌و کچی (وەیسی ئاغە)یە ، هەر لە منداڵیەوە شەم‌و شەمزین هۆگری یەکتر دەبن‌و حەز لە یەکتر دەکەن . باوکی شەم ، شەمزینی برازای دەرکردووە . . ئەویش دەچێتە لای (وەسمان بەگی گەرگەری) لە شاری (دیاربەکر) لە دوای حەوت ساڵان هەواڵی بە مێردانی شەم دەزانێ . . دووبارە بەرەو وەلآش دەگەڕێتەوە .

شەمزین لە ڕۆژی گواستنەوەی شەمی ئامۆزای دەگاتە نزیك گوندەکەیان‌و شەمیش چاوی پێ‌دەکەوێ‌و بە دایکی دەڵێ :

**شەم :**
سوارێك ژێرهەڵدێ یەخترمەی شینە
لەوان ڕکێفان ئەوا شەمزینە

**دایك** ئەرێ شەمیلێ ئاقلت گۆڕاوە
ئەم ساڵێ حەوت ساڵە شەمزین نەماوە

ئینجا شەم دێتە سەرکانی ئافرەتان‌و شەمزینیش دەگاتە نزیکی ، هەرچەندە شەمزین دەزانێ ئەوە شەمی ئامۆزایەتی بەلآم دەڵێ با ئەو بەندەی بۆ بڵێم ئەگەر ئەوبێ وەلآم دەداتەوە

**شەمزین :**
خۆم سەرگەردان‌و شەم لەبەر کۆڵێ
بسکێ شەمیلێم لاسکێ کەرکۆڵێ
شەمێ هەڵدەگرم دەچمە ئەستەمبۆڵێ
خۆم سەرگەردان‌و شەم لەبەر نانی
بسکێ شەمیلێم گەیینە سەر ڕووانی
شەمێ هەڵدەگرم دەچمە کن خاڵی
خۆم سەرگەردان‌و شەم لەبەر ماران
بسکێ شەمیلێم ئارمووشێ شاران
شەمێ هەڵدەگرم دەیبە مە تاران
هەی ناکەم ناکەم چ مێردان ناکەم
بسکان هەرماڵم فتنێ بەرپاکەم
لەدوای شەمزینی سەر بەقوڕێ داکەم
هەی ناکەم ناکەم بە قسەی کەس ناکەم
لەدوای شەمزینی چی لە دونیاکەم
وەکو مەجرووم ڕوو لە مەجراکەم
سوێندەکم خواردووە بە گوڵێ نیسانێ
بە گوڵێ مێلاقێ پەرێ قورعانێ
لەدوای شەمزینی دەچمە زیندانێ

**شەم :**
لە دوای ئەمەدا یەکتر دەناسنەوەو بە یەك شاد دەبن‌و شەمزین دەستە جلێکی پیاوانە لەبەر شەم دەکاو جێ‌ژوانی خۆیان بۆ شەو نیشان دەکەن ، تا لەوێ‌وە بەرەو دیوەخانی خانی

ـەپ زێڕین بڕۆن ، ئینجا دەچنە شایی بەڵام شەم لە خۆشیاندا
گـ ـڕەی گوێی لەبیر دەکاو دەچنە نێو شایی بەندان دەڵێن :

**شەمزین :**

شاییەك دەگەڕێ لە دانگەی مالان
کەزیی شەمیلێم بەندی ڕەشماڵان
شەمی هەڵدەگرم دەچمە کن خالان
شاییەك دەگەڕێ هۆزان بە هۆزان
بسکێ شەمیلێم بڕیێ شێ بۆزان
شەمی هەڵدەگرم لە حەوت ئامۆزان
شاییەك دەگەڕێ لە پشت قەڵاتان
حەوت ساڵ غەریب بووم من لە وولاتان
بسکێ شەمیلێم دەزووی خەیاتان
شاییەك دەگەڕێ لە پشتی دێیە
بسکێ شەمیلێم ئارمووشی پێیە
حەوت ساڵ غەریب بووم بێ ماڵو جێیە
بە گولانو بە گرلان بە گوڵێ سەرکەندی
نێریا خۆلیدای بێریان هەڵقەندی
شەمی هەڵدەگرم دەچمە دەربەندی
شاییەك دەگەڕێ ڕۆینێ خانمانە
شەم تازە بووکە خەنە بەندانە
خوام پشتیوان بێو نۆرەی کولانە

خەڵکەکە لە گەرمەی شاییدا ئاگاداری هیچ نین جگە لە پیرەمێردێك کە بەرامبەر شەمو شەمزین ڕاوەستابوو . بە گوارە زێڕینەکە شەم دەناسێتەوەو دەڵێ :

**پیرەمێرد :**

دەبینن بینن شێ بۆزان بینن
زینیان لێبکەنو تەنگان بشەتینن
قورتاریان نەکەن شەمو شەمزینن
نیشانەی شەمێم گوارەی زێڕینن

لەگەڵ ئاشکرابوونیان شەمزین دەستی شەم ڕادەکێشێو بەرەو ماینەکەی دەچنو بۆی دەردەچن ، تا دەگەنە قەڵای دمدم . لە ئەنجامدا لە شەری قەڵای دمدم شەهید دەکرێن .

● **ئەم دەقە فۆلکلۆریانەم لە ڕۆشنبیرو فۆلکلۆریەروەر مامۆستا عبدالسلام مەلا محمد نبی حەیدەری دانیشتووی بێتواتە وەرگرتووە . ئەم بەرێزە لە چلەکانەوە دەستی ئەدەبی هەیەو کتێبی چاپکراوو چاپنەکراوی هەیەو لە ساڵی ۱۹۳۰دا لە دایك بووە ، خوایاربێ لە دەرفەتێکی تردا بە درێژای باسی ژیانو بەرهەمەکانی دەکەم .**

**فەرهەنگۆك**

ئینجانەگل : لەجیاتی مەرکان بەکارهاتووە . بەڵام گەورەتر بووەو لە گل دروست دەکریێو بسێنێك بەرزە .
بەنێ : شاخ .
بڕی : مووی سەرملی ماین .
پشتی کێش : گیشەکەر .
تەژاندەر : کەوی بەفری گەورە . یان بە دارێکی گەورەی ڕزی دەگوترێ .
داردەلامە : جۆلانە .
دۆریە : گیایەکی تام خۆشە نزیکەی یەك مەتر درێژە لە کوێستان شین دەبێ .
دانگە : نزیك ، بەرمالان .
گۆمەڵ : ناوەڕاست .
گەمە : یاری ، وازی .
کوشاف : گوندێکە سەر بە ناحیەی گوێز .
سەلان : نێوی گوندە .
سامڵەند : کوێستانێکە لە کوردستانی ئێران .
سپی‌زێر : کوێستانێکە لە کوردستانی ئێران .
سمایل ئاغە : مەبەست لە سمکۆ شکاکە .
ڕەبستە : قەرسیل .
شێخ قادر : مەبەست لە شێخ عبدالقادر نەهرییە .
ژێ : مامۆستا عبدالسلام حەیدەری دەڵێ : لەو ناوچەیە ئەم وشەیە بۆ برایانی بادینان بەکاردێ .
یەخترمە : وولاخ .

# کاروانی رۆشنبیری له کوردستاندا

## هەولێر

دژوار

### قالەو بافلۆف

دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی له رۆژی ١٩٨٦/١٢/١٦ له هۆلی رۆشنبیری جەماوەردا کۆرێکی چیرۆك خوێندنەوەی بۆ چیرۆکنوس مامۆستا شێرزاد حسن سازکرد . لەسەرەتاوه مامۆستا محمود زامدار بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردوو پوختەی ژیانی مامۆستا شێرزادی بۆ ئامادەبوان خوێندەوه .

منو قالەو سەگەکەی بافلۆف ناونیشانی چیرۆکەکەی مامۆستای موحازیر بوو کە پەیوەندی بە لایەنی دەروون زانی یەوه هەبوو ، بەتایبەتی نووسەر پالەوانێکی خولقاندبوو کە هەلگری کۆمەلێ نەخۆشی دەروونی بیو هەر لەمندالی یەوه بوو ، نامەکەشی سەبارەت بەوەبوو ئاخۆ دەکرێ فرۆیدو بافلۆف یەك بخرێنو بتوانین تیۆرەکانی ئەو دوو زانایه لەیەك بۆنەدا بتوێنینەوه . . کامەیان زالترە . کامەیان له روانگەی زانستی یەوه ساغترە . . ئەم هەموو پرسیارەو دەیان پرسیاری بەسترا بۆوه بەبوونی قاله کە پالەوانێکی تری چیرۆکەکەبوو . نەك قالەش بەلکو بەسترابۆوه بەدانەکەندنی پێلاوی قاله ، ئەم حالەتەش بەسترابۆوه بەسەگەکەی بافلۆف . . ئاوو هەوای چیرۆکەش تێکەلاوی یەکی سەیرو عەنتیکەی خولقاندبوو له نێوان بێئاگایی فرۆیدو پەرچەکرداری مەرجی المنعکسات الشرطیەی بافلۆف ، له راستیدا ئەوەی جێی سەرنجەی کە ئەم چیرۆکە وەك نووسەر خۆی وتی پشتی بەستبوو بە قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونو تەقاندنەوەی شتە شاراوەکانو دانپیانانو ورێنە دالغەو تەوژمی هۆشو مۆنۆلوجی راستەوخۆو ناراستەوخۆ . . دەتوانین بلێین ئەم چیرۆکە پەیوەندی بە دەروونزانی یەوه هەبوو . . هەرچەندە نووسەر له سەرەتادا وتی من ویستوومە چیرۆکێکی نەفسی ئیقاعدار بنووسم نەك تواندنەوەی تیۆرە سایکۆلۆژی یەکان . لێرەدا پێویستە بلێین کە پتر له دە – پانزە کەس لەسەر ناوەرۆكو هونەری چیرۆکەکەو دەروونزانی کەوتنە قسە کردنو بیروڕای جیاوازو دژ بەیەکیش هاتە پێشەوه . هەلبەتە هەویرەکەش ئاوی زۆری دەکێشا ، بەپێی پێویست نووسەر وەلامی هەندێکیانی دایەوەو هەندێکیانیشی فەرامۆش کرد . ئەوەی شایانی باسە ئەم کۆڕە سێ سەعاتی خایاند .

### غۆرێلا

کۆمەلەی هونەرە جوانەکانی کورد لقی هەولێر – هونەرمەندانی ئەزمونگەری سلێمانی له رۆژی ١٩٨٦/١٢/٢٩و رۆژانی تر لەسەر شانۆی رۆشنبیری جەماوەردا شانۆگەری غۆرێلایان پێشکەشکرد . ئەم شانۆگەریە له نووسینی یۆجین ئۆنێلو وەرگێرانی شیرزاد حسنو دەرهێنانی شەمال عومەر بوو . ئەکتەرەکان بە گشتی کریم عثمان ، دلپاك طاهر کاوانی ، مەریوان کمال ، خالد ئاوارە . جەبار حەمەد ، یادگار شینکی . کاوان عومەر . ئارام حەمە فەرەج ، ابراهیم عبدالله ، سەلام مستەفا . کەژال یوسف ، بێخال یوسف ، کارزان عثمان .

ئەم هونەرمەندانەیش بەشداری کارە هونەرەکانیان کرد ، ئازاد مولود ، بکر معروف . نیگار . ئازاد توفیق ، ئاشتی محمد ، وەفا کمال ، ئازا حەسیب قەرەداخی ، ئاکۆ عومەر ، سەلام مستەفا ، کارزان عوسمان .





## ڕۆژی هونەر

نەقابەی هونەرمەندان بەبۆنەی ڕۆژی هونەر لە ڕۆژی ٨/١/١٩٨٧لە هۆڵی ڕۆشنبیریو لاواندا پیشانگایەکی فراوانی سازکرد .

### بەشدارەکانو کارە هونەریەکان

– تابلۆی (دژواری سروشتی) مامۆستا عەزیز سەلیم .

* عەزیز سەلیم ، لە ساڵی ١٩١٧ لە قەڵادزێ لە دایك بووە ، ئەندامی کۆمەڵەی هونەرمەندانی عێراقە . لە ساڵی ١٩٦٩وە پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– هونەرمەند سلێمان شاکر بەچیای سەفین ، سروشتی کپ لە فۆلکلۆری کوردیدا بەشداری کردبوو .

* مامۆستا سلێمان لە ساڵی ١٩٣٧ لە گوێڕ لە دایك بووەو لە ساڵی ١٩٥٧ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدای بە باڵایی تەواو کردووە ، لە ساڵی ١٩٥٨ بەشداری پیشانگاکانی کردووە .

– منارەی چۆلی ، ژنە ڕەوندێك ، تەشی ڕێسی دزەیی تابلۆکانی هونەرمەند اسکندر عثمان بوو .

* مامۆستا اسکندر لە ساڵی ١٩٣٨ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٦١ خانەی مامۆستایانی هەولێری تەواو کردووە ، لە ١٩٦٢ بەشداری هونەری هەیە .

– هونەرمەند حسین عبدالله بە تابلۆی ئەسپو جوانویەکەیو ڕاوکەرو دایکایەتی بەشداری کردبوو .

– مامۆستا حسین لە ١٩٤٢ لە هەولێر لە دایك بووە لە ١٩٦٤ ئامۆژگاری هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووە لە سەردەمی قوتابیەتیدا چالاکی هونەری هەیە .

– هونەرمەند دارا بە تابلۆی بووك ، سروشتێکی سەیر ، دایکێك بەشداری کردبوو .

* مامۆستا دارا محمد علی کامەلا لە ساڵی ١٩٥٠ لە عەوێنە لە دایك بووەو لە ١٩٧٤ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووە . لە ساڵی ١٩٧١وە پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– هونەرمەند چەتۆ بە دوو دیمەن بەشداری کردبوو .

* مامۆستا چەتۆ حسن لە ساڵی ١٩٤٥ لە عەوێنە لە دایك بووەو لە ١٩٨٣ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– هونەرمەند نامق بە تابلۆی پێکهێنانی هور . حاڵەتێکی دەروونیو ئاوازی با . بەشداری کردبوو .

* کاك نامق علی قادر لە ١٩٥٤ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٧٥ ئامادەیی پیشەسازی لە هەولێر تەواو کردووە ، لە ساڵی ١٩٧٤ پیشانگای یەکەمی تایبەتی سازکردووە .

– هونەرمەند محسن بە تابلۆی سروشت بەشداری کردووە .

* مامۆستا محسن محمدامین لە ١٩٥١ لە شەناغە لە دایك بووە ، لە ساڵی ١٩٧١ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– سوارێك ، بابەتێکی وەرگێڕاو ، دووکاری تابلۆکانی مامۆستا محمد بوو .

* مامۆستا محمد مولود قادر لە ١٩٣٦ لە کۆیە لە دایك بووەو لە ١٩٥٩ خانەی مامۆستایانی بەعقووبەی تەواو کردووە . لە ١٩٦٠ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– پورترێت تابلۆی هونەرمەند کمال بوو .

* هونەرمەند کمال سعدی لە ١٩٥٦ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٧٦ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– دایکایەتیو ڕاوچی دوو تابلۆی هونەرمەند فیصل بوو .

* کاك فیصل عثمان لە ١٩٥٦ لە هەولێر لە دایك بووە ، لە ساڵی ١٩٧٥ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– سروشتو مامۆستای دێیەك تابلۆی هونەرمەند جوهربوو .

* کاك جوهر محمد عمر لە ١٩٦٢ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٨١ خانەی مامۆستایانی هەولێری تەواو کردووە ، لە ١٩٧٨ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .

– خوشکی هونەرمەند دلڤین بەم تابلۆیانە بەشداری کردبوو :

خەونێك بەشنگارەوە . ترس لە هیچەوە . ڕۆژ هەڵدەیێت .
* دڵڤین حسن حسین سنجاری لە ساڵی ١٩٦١ لە شێخان لە دایك بووە ، قوتابی قۆناغی سێ‌ی بەشی جیۆلۆجی کۆلیژی زانیاری زانکۆی (صلاح‌الدین)ە . لە ساڵی ١٩٧٩ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .
- بەرزبوونەوەی خودی مرۆڤ . هەولێر ١٩١٨ ، هەولێر ١٩٤١ تابلۆکانی هونەرمەند سنجاوی بوو .
* سردار سنجاوی لە ١٩٦٤ لە کەرکوك لە دایك بووەو لە ١٩٧٩ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .
- تابلۆی ئافرەتێك‌و باڵندەکان‌و منارەی چۆلی‌و ئەسپ کەرستەی بەشداری هونەرمەند شێرزاد بوو .
* کاك شیرزاد سلێمان لە ١٩٤٧ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٧٣ ئامۆژگاری، مامۆستایانی هەولێری تەواو کردووە .
- هونەرمەند بەرزنجی بە بابەتێك بەشداری کردبوو .
* کاك دارا انور بەرزنجی لە ١٩٥٨ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٨٢ ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووە .
- هونەرمەند ئازا بە ئافرەتێك‌و وێرانە خاك‌و خۆر بەشداری کردبوو .
* کاك ئازا حسیب قەرەداخی لە ١٩٨٠ پیشانگای تایبەتی ساز کردووەو لە سلێمانی لە دایك بووە .
- ئایەتێکی قورئان . ژنێکی تێکۆشەر ، کەرستەی بەشداربوونی هونەرمەند هاشم علی جرجیس بوو ، ئەم هونەرمەندە لە ساڵی ١٩٤٣ لە هەولێر لە دایك بووە .
- کۆچەر . سێ دەم‌و چاو کەرستەی هونەرمەند ڕزگار فقێ عولا بوو . ئەم لاوە لە ١٩٦٤ لە ڕواندز لە دایك بووەو لە ١٩٨١ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .
- عمر دەروێش لە ١٩٥٧ لە سلێمانی لە دایك بووەو بە سەربازێکی ون‌و شێوەو بیر بەشداری کردبوو .
- دیمەنێك کەرستەی هونەرمەند هەڵگورد بوو ، ئەم هونەرمەند ناوی (هەڵگورد عبدالوهاب)ەو لە ١٩٦٦ لە ناوپردان لە دایك بووە . قوتابی پۆلی یەکەمی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدایەو لە ١٩٧٩ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .
- دوو فرۆشیاری کەرکوك . کرێکارەکان دوو تابلۆی توانا عبداللە بوو ، ئەم هونەرمەندە لە ١٩٧١ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٨٦ پیشانگای تایبەتی سازکردووە .
- موهەریج تابلۆیەکی هونەرمەند جواد محمد بوو ، لە ١٩٨٦ ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی بەغدای تەواوکردووە .
- فەرهاد عزیز گەردی بە دوو بابەت ، ئەم هونەرمەندە لە ١٩٦٦ لە هەولێر لە دایك بوو .
- نزار عبدالهادی لە ١٩٥٩ لە سلێمانی لە دیاك بووەو دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی سلێمانیە بە سیرامێك بەشداری کردووە .
- ئازاد غفور لە ١٩٦٢ لە هەولێر لە دایك بووەو لە ١٩٨٦ پیشانگای تایبەتی سازکردووە بە دووجیهان بەشداری کردووە .
- گەیلان رحمان خورشید لە ١٩٦٣ لە هەولێر لە دایك بووە ، بە پینە دۆزێك بە شداری کردووە .
- لوقمان جوهر مولود لە ١٩٦٦ لە هەولێر لە دایك بووەو . قوتابی پەیمانگای هونەرە جوانەکانە ، بەشی مۆسیقا لە موسل بە گوندێك بەشداری کردووە .
- خوشکە ئەدیبە اسماعیل مامە لە ١٩٦٦ لە هەولێر لە دایك بووە ، یەکەم هەنگاویەتی لە جیهانی هونەر . بە هاوار ، پۆرترێت ، مۆدیل بەشداری کردووە .
- سالار صۆفی لە ١٩٦٥ لە کەرکوك لە دایك بووە ، کاروکاردانەوەو نوێژی ئەڤین کەرستەی بەشداری بوونیەتی .
- فاضل ابراهیم اورفلی لە ١٩٥٣ لە هەولێر لە دایك بووە ، بە سیرامێك بەشداری کردبوو .
- حیدر قادر عبداللە لە ١٩٥١ لە هەولێر لە دایك بووە ، بە گوندەکەم ڕەشماڵ نشین بەشداری کرد . ئەم هونەرمەندە یەکەمجارە بەشداری پیشانگای هونەری دەکات .

- بژار کریم سلیم بە ئایەتێکی قورئان بەشداری کردووە .
- نجم‌الدین پشدەری بە ئاگر . سەربازی ون بەشداری کردووە .

### هیوای گەڕانەوە

تیپی شانۆی قوتابیان لە ئامادەیی هەولێری کوڕاندا ، لە رۆژی ۱۹۸۷/۱/۳ شانۆگەری (هیوای گەڕانەوە) لە نووسین‌و دەرهێنانی حەمەد رەنجدەر بوو . قوتابیە لاوەکان لە وتەکەیاندا دەڵێن (کاتێ پەپوولەیەکی نەشمیلە بە دەوری شەمعێکا ئەخولێتەوە . گومانی لەوەدا نیە ، ئەگەر بێتو زیاتر لێی نزیك بێتەوە باڵەکانی ئەسوتێ‌و لەنێو ئەچێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەرلێی نزیك ئەبێتەوە .

ئێمەی مرۆڤیش کاتێ ئەمانەوی لە ئاواتێ نزیك بینەوە نابێ گومان لەوە بکەین کە لەوانەیە باڵەکانمان بسوتێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ سوتانی باڵەکانمان وامان لێ بکات لە کاروانی رێگای ئاوات دابرێین . بەڵکو پێویستە بەردەوام بین .

ئەکتەرەکانی ئەم شانۆگەریە بە گشتی : سعید شێخانی- مەلا ، عبدالخالق عبدالله - صۆفی کریم ، حەمەد رەنجدەر - ئازاد ، عبدالرزاق رشید - مام وەسمان ، هەڵمەت طاهر - رسول ، مهدی عباس - علی ئاغا ، ادریس بهجت - خولە ، علی ابوزید - عەلە ، شاخەوان جوهر - حوسە ، خطاب حامد ، کاروانی - شریف ئاغا ، فریا عبدالستار * سەعە ، مظفر عبدالله * چایچی ، عدنان فتاح - هیوا ، ئەم هونەر دۆستانەیش بەشداری کارە هونەریەکانیان کردووە : هێرش عمر ، انور اسماعیل ، سوداد عمر ، صدقی جمیل ، محمد عمر ، یوسف احمد .



## سلێمانی

ئازاد



### «کامەران موکری . . . ماڵئاوا»

رۆژی «۷»ی کانوونی یەکەمی «۱۹۸٦» لە مێژووی شیعری کوردیدا رۆژێکی ئاسایی نەبوو ، تەنانەت رووی ئاسمان‌و مرۆڤانی شاری زێدیش تەماوی‌و خەم ئامێز بوون . ئەو رۆژە درەختەکان‌و چیاکان‌و گردۆڵکەکانی شارو بە تایبەتیش «گردی سەیوان»ی هەوارگە ئەسرینیان بۆ مەرگی مرۆڤێکی بەرز . . بۆ «کامەران موکری» دەرشت کە دڵە مەزنە پڕ ئەوین‌و جوانیەکەی لەو رۆژەدا لە لێدان کەوت .

لقی دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی لە سلێمانی بە بۆنەی چلەی مەرگی شاعیری کۆچکردووە «کامەران موکری»یەوە لە رۆژی هەینی رێکەوتی ۱۹۸۷/۱/۱٦داو لە هۆڵی رۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی کۆڕێکی ماتەمی فراوانی بۆ سازکرد کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب‌و نووسەران بەشداریان تێدا کردو جەماوەرێکی زۆریش ئامادەی کۆڕەکە بوون .

سەرەتا چیرۆکنووس مامۆستا «مستەفا ساڵح کەریم» بە ناوی دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردیەوە بەخێرهاتنی لە سەرجەمی ئامادەبووانی کۆڕەکە کردو پاشان لە لایەن مامۆستایەکی ئایینی‌یەوە چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز خوێندرایەو ئینجا ماتەمگێران دەقیقەیەك بۆ گیانی پاکی شاعیر



راوەستان .

بەرنامەی خوێندەنەوەی ئەو وتارو شیعرانەی بۆ یادی خوالێخۆشبوو گوتران بەم جۆرە بوو :-

– کورتەیەکی ژیانی شاعیر لە لایەن چیرۆکنووس مامۆستا «مستەفا سالح کەریم»ەوە .

– وتاری دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی لە لایەن بەرێز مامۆستا «مستەفا نەریمان»ەوە .

– وتارێك لە لایەن بەرێز مامۆستا «د . عیزەدین مستەفا رەسوول»ەوە .

– وتاری کۆری زانیاری کورد لە لایەن مامۆستا «عەبدوللە تیف گلی»یەوە .

– پارچە شیعرێك لە ژێر ناوی «لەچلەی بەهرەیەکدا» لە لایەن شاعیر «کاکەی فەللاح»ەوە .

– وتارێك لە لایەن بەرێز «د . ئیحسان فوئاد»ەوە .

– پارچە شیعرێك بە ناوی «بۆ داربەرووی شیعر» لە لایەن شاعیر مامۆستا «حەسیب قەرەداخی»یەوە .

– وتاری بەرێوەبەرێتی رۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی لە لایەن کاك «شەهاب عوسمان»ەوە .

– وتارێك لە لایەن مامۆستا «مستەفا نەریمان»ەوە .

– وتارێك لە لایەن چیرۆکنووس بەرێز «عەبدولا عەزیز خالید – ئاگرین»ەوە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن بەرێز «شێخ حەسەن بەرزنجی»یەوە .

– وتارێك لە لایەن بەرێز مامۆستا «کەریم زەند»ەوە .

– وتارێك بە ناوی «بیرەوەری و ناسینی مامۆستا کامەران موکری» لە لایەن بەرێز «د . شوکریە رەسوول»ەوە .

– وتارێك لە لایەن کچی خوالێخۆشبوو خاتوو «ئەستێرە»وە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن شاعیر مامۆستا «جەمال شارباژێری»یەوە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن شاعیر مامۆستا «ع . ح . ب»وە .

– وتارێك لە لایەن مامۆستا «محەمەد مارف»وە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن خاتوو شەفیقە عەلی «لەیلان»ەوە .

– وتارێك لە ژێرناوی «کامەران موکری و چەند بیرەوەرییەکی گەش» لەلایەن چیرۆکنووس بەرێز «تاهیر سالح سەعید»ەوە

– وتارێك لە لایەن بەرێز «مومتاز حەیدەری»یەوە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن بەرێز «ئیسماعیل عارف»ەوە .

– وتارێك لە لایەن کاك «حەمە سەعید حەمە کەریم»ەوە .

– خوێندنەوەی شیعرێك لە شیعرەکانی شاعیر لە گەڵ پێشەکییەکدا لە لایەن بەرێز «تەها بابان»ەوە .

– پارچە شیعری «خەمێکی گەش» لە لایەن کاك «محەمەد سەدیق مەحموود»ەوە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن شاعیر «ئەژی گۆران»ەوە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن شاعیر مامۆستا «حەمە ئەمین پێنجوێنی»یەوە .

– خوێندنەوەی شیعری «جەمیلە»ی شاعیر لە لایەن شاعیر کاك «جەمال غەمبار»ەوە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن بەرێز «خورشیدە بابان»ەوە

– وتارێك لە لایەن بەرێز کاك «یاسین بەرزنجی»یەوە

– پارچە شیعرێك لە لایەن کاك «ئیسماعیل خورماڵی»یەوە .

– وتارێك بە ناونیشانی «کامەران موکری و گەشتنامەی مەرگ و ژیان «لە لایەن شاعیر کاك «لەتیف هەڵمەت»ەوە .

– شیعرێك لە لایەن مامۆستا «عومەر عەبدولرەحیم»ەوە .

– پارچە شیعرێك لە لایەن کاك «جەمال محەمەد ئیسماعیل»ەوە .

– شیعری «سەیوانی مەزن ئەمشەو دەسنوێژت بە شیعرێك بشۆ» لە لایەن شاعیر کاك «بەرزان هەستیار»ە وە .

- پارچە شیعرێك لە لایەن بەرێز «نزار عەلی ئەحمەد»ەوە .
- پارچە شیعرێك لە لایەن کاك «تۆفیق مەحموود»ە وە .
- پارچە شیعرێك لە لایەن شاعیر کاك «هیدایەت عەبدولاّ حەیران»ە وە .

دوا وتار «ئەخۆل»ی شاعیر بە ناوی بنەماڵەی شاعیرەوە لە گەڵ چەند پارچە شیعرێکدا خوێندیەوە .

بەم بۆنەیەوە چاومان بە چیرۆکنووس مامۆستا مستەفا ساڵح کەریم» کەوت‌و ئەم پرسیارەمان ئاراستە کرد :- کۆچی دوایی کامەران موکری» وەکو مرۆڤێك . . . وەکو شاعیرێك ، جیی لای بەرێزتان خرۆشاند ؟

● لە کۆچی شاعیری بەهرەوەر «کامەران موکری»دا زۆر ست لە ناخمدا وروژا ، کاتێك قوتابیی قۆناغی ناوەندی بووم ، دوور بە دوور کامەرانم دەناسی ، وەك وتاربێژێکی پراوی خۆپیشاندانەکانی راپەرینی کانوونی ٤٨ .

بەلاّم سەرەتای یەکتر ناسینمان لە ساڵی پەنجاو حەوتەوە دەستی پیکرد ، کەمن لە رۆژنامەی «ژین»دا کارم دەکردو ئەویش شیعرەکانی لەوێدا بلاّو دەکردەوە .

ئەو هاورێییەتی‌و برایەتیەمان هەر بەردەوام‌بوو ، لە حەفتاکانیشدا دوو ساڵ پێکەوە لە دەستەی بەرێوەبردنی لقی سلێمانی‌ی یەکێتی‌ی نووسەرانی کورددابووین ، لەو ماوەیەدا لە تەك مامۆستا «هەردی»دا سێ قۆلّی چەندین بەرنامەی ئەدەبیمان پێکەوە لە تەلەفزیۆندا پێشکەش کردو چەندان سەفەری خۆشمان هەبوو کە هەموویان یادگارێکی نەمرن لە هەست‌و هۆشمدا .

کامەران لەرێزی نەمراندایە ، لە دڵی نەتەوەکەیدا هەمیشە زیندووە ، بەخشندەیەکی مەزن‌بوو ، بە شیعر ، بە وتار ، بە قوربانی ، سەرئەنجام ئەوو هاورێیانی ئەم رێبازە ریزە لووتکەیەکی بەرزی مێژووی ئەم نەتەوەیەن‌و لە بیر ناچنەوە ، بۆیە ئەمرۆ هەر لە «ماردین»ەوە تا ئاکری‌و ئامێدی . . . تا سلێمانی «ئەستێرە»ی بۆ دەچن‌و لە تەك گوڵاڵە سوورەی کوردستاندا چەپکی دەکەن بۆ «دیاری»ی سەر گۆڕە پیرۆزەکەی .

ئەوی راستی‌بێ هەمیشە دەنگی مێژوو لە سەروو هەموو دەنگێکی ترەوەیە ، پێناسەی نەمریی هەموو ناودارێکیش لە روانگەی ئەو ئاکارانەوە تەماشادەکرێن کە بوونەتە هۆی لە بیرنەچوونەوەیان ، هەر بۆیەشە «کامەران»ی شاعیرو تێکۆشەر هەردەم شیعرەکانی و قەڵەمەکەی ووشە پیرۆزەکانی‌و هەڵوێستە مەردانەکانی لە دڵ‌و دەروونی هەموو کوردێکی دڵسۆزدا بە نەمری دەمێننەوە . ئەو چرایەی لە قەلاّی شیعری کوردیدا دایگیرساند هەتا هەتایە شەوقە خۆش‌و گرە پرشنگدارەکەی بەرپێی کاروانی رێ کردووی ئەدەبی کوردی رووناك دەکاتەوە .

رۆژ بە دوای رۆژ تابێت نرخ‌و بەهای گەوهەری شیعرەکانی «کامەران» برەوی زیاتری خۆشەویستی‌و رێزو شکۆمەندی بۆ خۆیان‌و بۆ ئەدەبی کوردی پەیدا دەکەن .

* هەروەها لەو شاعیرانەی لە گێرانی ماتەمی کۆچکردوودا بەشداریان کردبوو مامۆستا «حەسیب قەرەداخی» بوو ، لێمان پرسی :- لە روانگەی بەرێزتانەوە «کامەران موکری» تا چەند توانیویەتی رێچکەی شیعری نوێی کوردی خۆش بکات‌و رچەی تەقلیدیەت بشکێنێت ؟ چۆن ؟

● ئێمە کە بروامان وابێ گۆڕانکاری لە ژیاندا دەبێ بە هۆی گۆڕانی ئەدەب‌و هونەرە جۆربەجۆرەکانی تریشەوەبێت ، شاعیری کۆچکردوومان «کامەران موکری» کاتێ کە چاوی هۆش‌و رۆشنبیری‌ی کرایەوەو گوێی بە دەنگ‌و باسی کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی‌و هەواڵی تێکۆشانی گەلان‌و برەوی ئازادی‌و ئازادی خوازان زرایەوە ، هەنگاوی نایە سەر رێگەی تێکۆشان . لە بەرەی ئازادی خوازاندا شان بە شانی ئاشتی خوازانی جیهان مافی رەوای گەلی کوردیشی کرد بە برواو مەبەست . ئیتر لەم بوارە جەنجاڵەدا تێگەیشت دەبێ شیعریش لە قاڵبی چاولێکەری‌و رستە رێکخستن دەرباز بکرێ بۆ ئەوەی بکەوێتە سەر زمانی تێکۆشەران ، سەرزمانی خەڵکی



ستەمدیدەی کورد . ئیتر ئەم رچەی تایبەتی‌ی بۆ خۆی کێشاو چ کی مەردانەی لێکرد بەلادا .

مەردوم نابێ بێ ئینساف بێ . کامەران موکری جێگەی خۆی گرتو شۆرە سواری ئەو مەیدانەبوو . ئەم شێوەکارە نایابەی ئەویش لە هۆنینەوەی شیعردا مۆرکی تایبەتی‌ی ئەوی گرتۆتە خۆی‌و رێچکەشی بۆ شیعری تازەی کوردی خۆش‌کردو دەسبەرداری شاعیرانو ئەدەبی پێشینیشمان نەبوو بە مەبەستی لێبران بەڵکو لە هەموو شیعرەکانیدا بۆنو بەرامەی شیعری رەسەنی کورد دەکەین .

لە راستیدا مامۆستا «حەسیب قەرەداخی» هەروەکو ئاماژەیشمان بۆ کردووە بۆ یادی شاعیری کۆچکردوو شیعرێکی نووسیوە وائێرەدا کۆپلەیەکی لێدەخەینە روو :-

«لەبیرت دێ لەسەر گڵکۆی «فایق بێکەس» چۆن نرکانت ؟ !

ئەو رۆژە تۆ تەپڵی ژەنی لەشکری ری‌ی ئازادی بووی
ئەو رۆژە تۆ گۆیندەبووی ، هەڵکەوتبووی
ئەو رۆژە تۆ سوارچاکێ بووی تێنەگلابووی نەکەوتبووی

ئەو رۆژە تۆ گرکانێکی تەقیوە بووی
گری سۆزت دەگەیشتە تەختی بەرزی زاتی خوا
وەکو نووری حەقیقەتێ جی‌ی خۆی گرتو لەوێ روا»

هەروەها دوا پرسیارمان ئاراستەی کاك «ئازاد عەبدولواحید» کرد کە لە نێوەندی ئەدەبیدا وەك رەخنەنووسێکی شیعری ناسراوە :-

- **«کامەران»ی شاعیر بەلای ئێوەوە کێیە ؟**

● «کامەران موکری» شاعیرێك‌بوو سووربوو لەسەر ئەوەی بە شیعرەکانی بچێت بەگژ چەوسانەوەو کۆت‌و پێوەندا ، بۆ خۆش کردنو جوان کردنی ژیان . دەیویست وەکو شاعیرێك شیعرەکانی لە ئاستی داهێنانی شیعری سەردەم بێت‌و بە تەنگ داوایەکانی‌یەوە بچێت . تا ببێتە یەکێك لە نوێنەرانی قۆناغی شیعری «پشووی گوێزانەوە - فترة الانتقال»و بە شیعر ئاسوودەیی‌و سەربەخۆیی‌و یەکسانی‌و دادپەروەری بۆ رۆڵەکانی گەلەکەی دەستەبەر بکات . شیعرەکانی شان بەشانی بزووتنەوەی نیشتمانی رۆیشتووەو لە باوەشی خەباتی نەتەوایەتیدا چاویان هەڵهێناوە ، بۆیە شیعرەکانی بە خەباتی نەتەوایەتی‌و نیشتمانی‌ی ئەو سەردەمەوە نووساوەو وەکو چەکێکی کاریگەری برندەو کوشندە دژی ناحەزانو دوژمنانی کورد بەکارهاتووە ، کە ناتوانرێ لە باسی شیعرەکانیدا ئەو لایەنە فەرامۆش‌بکرێ یان کە باسی خەبات‌و تێکۆشانی ئەو سەردەمە دەکرێ ، باسی شیعرەکانی ئەو نەکرێ ، چونکە گرو تینی داوە بەو بزووتنەوەو راپەرینانە . ژمارەی ئەو شاعیرانە زۆر کەمن کە بتوانن خۆیان بۆ شیعرو خەبات تەرخان بکەنو مەسەلەی شیعرو مەسەلەی میللەتەکە بە یەکەوە ببەستنەوەو تا دوا هەناسە سەنگەر نەگۆرنو هەر رۆژە لە سەر پەتێك ئەکروباتیك نەکەن ، کە «کامەران» هەر لە سەرەتاوە تامردن ئەو سەنگەری خەباتەی بەرنەداو بە هیچ شتێك نەیگۆریەوە .

راستە ئەوانەی ئەو رێگا سەختانە دەگرنە بەر ئازارو ئەندێشەی زۆر دەچێژن لەو پێناوەدا ، بەلام چ شتێك لەوە خۆشترە پیاو لە پێناوی ژیانو حەقیقەت‌و ئاواتەکانی نەتەوەکەی خۆی دڵی خۆی



ـدنه گۆرانیی نەبەزین و کۆڵ نەدان .

ـ«کامەران موکری» ناهەق نەبوو ناوی لە خۆی نا ـ«کامەران» ، چونکە دەیزانی وەك شاعیرێکی سەر بە میللەت ـچـسته لە «کامەرانی»دا خاوەن گەنجینەیەکی گەورەبێت ، تا ـبێت ئەو گەنجینەیە بەسەر خەڵکدا دابەش بکات ، تا بەپێوە ـو بە پێوە بمرن و رووبەرووی هەموو جورتم و نەهامەتی یەك ـو هێزی ئەوەیان هەبێت بەرانبەر بە هێزی نەگریسی چۆك ـ بوەستن ، بێگومان ئەم کارەیش بە ئینسانی بەزیوو ـگەر چۆڵکردوو ناکرێ . بۆیە ئەم جۆرە شاعیرانە ـرەترین خەڵات دەسکەوتیانە ، کە خەڵاتی خۆشەویستیی ـەنە» .

شایانی باسە کە لقی دەزگای ناوبراو لە هەمان رۆژدا ـنگایەکی لە هۆڵی بەڕێوەبەرێتیی رۆشنبیریدا کردووەوە کە ـبوو بە وێنە فۆتۆگرافیە تایبەتیەکانی شاعیری کۆچکردوو ـگەڵ هاورێیانی و قوتابیانی و زۆر لەو ئەدیب و شاعیرانەی کە ـۆست و ئاشنای شاعیربوون .

بە مەرگی شاعیری بڵند «کامەران موکری» یەکێك لە ـستێرە گەشەکانی ئاسمانی شیعری کوردی دەکوژێتەوە ، بەڵام ـشیعرە بەرزەکانی لە یادی شیعری کوردیی هاوچەرخدا هەر بە ـمری و جاویدی دەمێننەوە .

هەزاران دروودو سلاو بۆ گیانی پاکی شاعیری خۆشەویستی و خەبات و ژیان «کامەران موکری» .

- محەمەد ئەحمەد تەها «کامەران موکری» لە ساڵی ١٩٢٩ زدا لە گەڕەکی دەرگەزێن لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوە .

- لە ساڵانی پەنجاکان و شەستەکاندا لە ئاکامی کاری سیاسی چەند جارێك لە بەندیخانە بەندکراوە .

- لە ساڵی ١٩٧٥زدا کرا بە مامۆستای کۆلیجی ئادابی زانکۆی سلێمانیی ئەو دەمەو سەلاحەددینی ئێستا - بەشی دیراساتی کوردی .

- لە نێوەندی پەنجاکانەوە دەستی بە نووسینی شیعر کردووە .

- دیوانە شیعریە چاپکراوەکانی برێتین لە :- «دیاری - ١٩٥٧ -» ، «ئاگرو ژیلە - ١٩٥٨» ، «گوڵ ئەستێرە - ١٩٥٩» ، «گوڵاڵە سوورە - ١٩٥٩» ، «ئاوات و رەنج - ١٩٦٨» ، «زەبری هۆنراوە - ١٩٧١» .

- لە حەفتاکاندا ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی ئەدیب و نووسەرانی کورد بووە .

- لە رۆژی ١٩٨٦/١٢/٧دا و لە شاری هەولێر کۆچی ماڵئاوایی کرد .

**«خەم و تەنیایی و . . هەڵسەنگاندنێك»**

لە بەرواری ١٩٨٧/١/١٤داو لە هۆڵی بەڕێوەبەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەر ، لە لایەن بەڕێوەبەرێتیی ناوبراوەو کۆڕێك بۆ خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی چیرۆکێك سازدرا ، چیرۆکەکە لە ژێر ناونیشانی «خەم و تەنیایی»دا بوو لە نووسینی کاك «کامەران رەفیق» .

دوای ئەوەی کاك «بەکر حەسەن» کە کۆڕەکەی بەڕێوە دەبرد وتەیەکی سەبارەت چیرۆك و هونەری چیرۆك نووسین بە کورتی خوێندەوە ، کاك کامەران چیرۆکەکەی خۆی خوێندەوە .

کاك «بەهات حەسیب قەرەداخی» هەڵسەنگاندنێکی



سەبارەت چیرۆکەکە نووسیبوو . پاش خوێندنەوەی چیرۆکەکە دەستی بە خوێندنەوەی هەڵسەنگاندنەکەی کرد کە بەسەر سێ بەشدا دابەشی کردبوو :-

بەشی یەکەم :- ناوەرۆکی چیرۆکەکە .

بەشی دووەم :- لایەنی هونەریی چیرۆکەکە .

بەشی سێیەم :- زمانی چیرۆکەکە .

سەرەتا برای هەڵسەنگێنەر ئەوەی خستە ڕوو کە ئەو خاڵانەی لە هەڵسەنگاندنەکەیدا دیاریان دەکات ڕەنگە زۆر لەو چیرۆکانە بگرێتەوە کە بە تایبەتی لە هەشتاکاندا هاتوونە ئاراوە لە ئەدەبی کوردیداو نەك بە تەنها ئەو چیرۆکەی کە لە کۆڕەکەدا خوێندرایەوە .

لەو خاڵانەی لە دوو توێی باسەکەدا هاتبوون :-

- چیرۆکەکە زیاتر مەسەلەیەکی تاکی دەخاتە ڕووو هێڵێکی ئایدیۆلۆژیی ڕوونیش لە خۆ ناگرێ .

- لە ڕووی تەکنیکەوە :- «دەنگی تاکە کەس» زاڵەو ویستراوە بە زۆرە ملێ کەسێتیی «نووسەر» وەکو دەنگ تێ بئاخێنرێت .

- چیرۆکەکە دەیەوێت خۆی بە زمانێکی شیعریەوە ببەستێتەوە ، بەلام لەم ڕووەوە سەرکەوتوویی بە چنگ نەهێنراوەو زمانەکە زیاتر لە وشەی بریقەدار ڕێکخستن نزیك بووەتەوەو ئەمەیش دەربڕینەکانی لاسەنگ کردووە .

برای چیرۆکنووس لەوەرامی بۆ ئەو ڕایانە دەڵێت کە :-

«هەموو بزووتنەوەیەك پێویستیی بە شیکردنەوەی زاتی و مەوزوعی هەیە ، جا لەم چیرۆکەدا پاڵەوانە کە بە هۆی ئەو شکستیەی خودیەیە هەڵقولاوەی دەوروبەریەوە بەلادا دەکەوێ و گۆشەگیر دەمێنێتەوە ، بەلام گەر ماهیەتی چینایەتی خۆی بناسیایە وخاوەنی ئایدیۆلۆژیەتبوایە وانەدەکەوتەوە . .» .

**«چەند چالاکییەکی شانۆیی**
**پەیمانگای هونەرە جوانەکان»**

لەو شانۆییانەی لە سەرەتای ئەمساڵداو وەکو پایاننامە لە



لایەن قوتابیانی دوا پۆلی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانییەوە پێشکەش کران :

شانۆیی «ورچ»ی چیخۆفو دەرهێنانی قوتابی «ئومێد حسین ڕەزا» . هەروەها شانۆیی «لالۆڤانیا»ی هەمان نووسەر (واتە چیخۆف)و دەرهێنانی کچە قوتابی «پەری ئەحمەد» ، هەروەها شانۆیی «ڕێبواری شەو»ی شاعیری ناوداری عەرەب «سەلاح عەبدولسەبور»و وەرگێڕانی کاك «تۆفیق ئەحمەد عەبدول»و دەرهێنانی مامۆستای پەیمانگا «عصمان فارس» .

**«فایلی ٦٧» لە دەربەندیخان**

لە سەرەتاکانی مانگی کانوونی دووەمی ئەمساڵدا ، تیپی شانۆی دەربەندیخان شانۆیی «فایلی ٦٧»ی «ئیسماعیل فەهد ئیسماعیل»ی لە وەرگێڕانی کاك «عوسمان چێوار»و دەرهێنانی کاك «دڵشاد حسین» لە دەربەندیخان پێشکەش کرد.

لەو ئەکتەرانەی لەم شانۆییەدا بەشداربوون :

(ساڵح ئەحمەد ، کەریم عەلی ، تۆفیق عومەر ، حەمە ڕەئوف ئەحمەد ، خەلیل حەمە عەلی ، مەجید مەحموود ، ڕێبوار حەسەن ، جەلیل حەمە غەفور) .



## «چەند پێشانگەهەکێت خاندنگەها»

بهەلکەڤتنا جەژنا لەشکەرێ مەیێ پالەوانو ل ژێر چاڤدێریا مێژ رێڤەبەری گشتییێ پەروەردەیێ ل پارێزگەها دهوکێ ، چەند پێشانگەهێت مەزن یێت هونەری هاتنە ڤەکرن ل ١٩٨٧/١ . ژوان پێشانگەها پەیمانگەها ماموستایا یا کچاو پەیمانگەها کورا .

ژ خاندگەهێت دی یێت کو پێشانگەهێت تایبەتی بخوڤە ڤەکرین : ناڤنجییێت گولستانو چراو ئاشتیو هیڤیو سەرەتایێت : بلند ، بروشکی ، زانیاری ، فاتما کورا ، فاتما کچاو ئامادەییا کشتوکالیو ئامادەییا (الدراسات الاسلامية) .

## «بزاڤێت فێرگەهیو پێشانگەهەك»

ب هەلکەڤتنا جەژنا لەشکەرێ مەیێ پالەوان ، ل رێکەڤتی ١٩٨٧/١/٧ بچاڤدێریا پارێزگەهێ دهوکێ هێژا «نامق رقيب سورچی» پێشانگەها بزاڤێت فێرگەها یا رسومێت زاروا ل هولا خاندنگەها گولستان هاتە ڤەکرن .

هژمارەکا باش ژقوتابیو ماموستایێت خاندنگەهێت دهوکی دەمەکێ خوەش ل هولا پێشانگەهێ بوراند ل گەل هزرو بیرێت



زارویێت ل ناڤبەر تەمەنێ ٦ سالیو هەتا ١٢ سالی ئەڤێت کو درەسمێت واندا هاتین .

## «کاویس ئاغایێ نەمر دکۆرەکیدا»

ژ چالاکییێت دەزگەها رەوشەنبیریو بەلاڤکرنا کوردی ل رێکەفتی ١٩٨٧/١/٧ کۆرەك هاتە پێشکێشکرن ل هولا بزاڤێت فێرگەها ژلایێ ماموستایێ (جلال ملا حسن خوشناو) ڤە ل ژێر ناڤو نیشانێت «ژیانو بەرهەمێ ستران بێژێ نەمر کاویس ئاغا» ئەدیبێ هێژا وصفی حسن ردینێ کۆر برێڤەبر .

هژمارەکا باش ژ ئەدیبو رەوشەنبیرو شەیدایێت سترانا کوردییا رەسەن لڤی کۆریدا ئامادەبون .

ژرێڤە هێژایێ موحازر پێناسینەك ب درێژی د سەبارا کاویس ئاغایێ نەمرو بنەمالا وی ل قەلەمدا .

پاش بەحسێ ناڤبری کر وەکو هونەرمەندو ستران بێژەکێ بێ بەڤلو ناڤدارو تبابەکێ ل سەر سترانێت وی ئاخفت ، نەمازە لاووکو حەیرانێت ب بویەرێت وی سەردەمی گوتین ئەڤێ لێ ژی ل ناڤبەرا سالێت ١٨٨٩و هەتا ١٩٣٦

سالا ١٩٣٠ کاویس ئاغا دچیتە بەغدا . لوێرێ بو جارا یەکێ لاوکێ «گەنج خەلیل» ل سەر قەوانی کومپانیەك تومار دکەتو تێتە خەلاتکرن ژ لایێ کومپانیێ ڤە .

لایێ دی ژ ڤەکولینا سەیدایێ موحازر بەحسێ گەرێت ستران بێژێ مەیێ نەمر دکەتو چاڤ پێکەتنێت وی ل دەڤەرێت دچیتێ ل گەل مەزنو ماقویلو کەسوکێت جڤ کی .

ژ وان دەڤەرا یێت لێ بویە مێهڤان «سولەیمانیو کویەو دەڤەر



بادينانو كوردستانا توركيا» . هەروەها سەيدايێ مە ب كورتى ل سەر رێشتا كاويس ئاغاى ئاخفت .

پشتى هينگێ مەگوهێ خوەدا چەند سترانەكا ژدەنگێ وى ژدەنكگرێ . پاش سترانێت وى ژمەرا هژمارتن ، ژوان يێت نافدار «ميرپەنجو - شێخ مەحمودێ نەمر - سەودالێ - يار گوندو - لاوكێ سموق - كوچەرێ سەگڤانو حەسەنێ واليكى» .

**سەيداى** بەلىكر كو كاويس ئاغاى هژمارەكا لاوكێت **نەتەوايەتىو** راميارى ل سەر مێژووا مللەتێ كورد گوتينە ، نەمازە دەست درێژىو زورداريێت عەجەمێت توخم پەرستو ميريا ئوسمانىو ئنگليزێت داگيركەر .

ل دووماهيێ هژمارەكا باش يا پرسيارا ژ لايێ گوهداراڤە هاتنە كرن ، بەرسڤا وان ژى ژ لايێ موحازرى ڤەهاتەدان .

**سەيدايێ خوشناو** ژندەرێت خوە ژمەرا خواندنو كورێ مەيێ خوەش تەڤاف بوو نێزيكى سەعەتو نيڤاكێشا .

**«ساڵەك ل سەر وەغە كرنا ئەيازى»**

ب هەلكەڤتنا بورينا سالەكێ ل سەر وەغەركرنا ستران بێژێ خوشتڤى خودێ لێخوش ئەياز يوسف زاخوىى ، كورەك ل بازێرێ زاخو ل رێكەفتى ١٩٨٧/١/٨ هاتە گرێدان ، ل هولا خاندنگەها بوتان بەرپرسيارێت زاخوو هژمارەكا بەرفرەهـ ژ جەماوەرێ بازێرى لێ ئامادەبون .

ئەڤ كورە ژ بزاڤێت رێڤەبەريا رەوشەنبيرى جەماوەرە ل دهوكێ ، رێڤەبەرێ وێ هوزانڤانێ هێژا خالد حسين ل پێشيێ گوتارا رێڤەبەريێ خاند .

ددويڤدا دو هەلبەست بهەلكەڤتنێ هاتنە خاند ژ لايێ هێژايان مصطفى رفعتو رێناس سندى .

پاش سەيدا عمر على تبابەكێ ل سەر ژيانا هونەرمەندێ نەمرو بەرهەمێ وىو هونەرێ وى ئاخفت ، ديسان ئەگەرێت سەركەتنا وى دڤادا سترانێ داو بەرفرەهيا ئەڤينداريێت سترانا خودێ لێخوش نەمازە ل دەڤەرا بادينا ژمەرا خوياو بەرچاڤ



كرن . هەروەها دورا هێژا هونەرمەند صباح حاجى هات ، وى ژى ژلايێ خوەڤە بدرێژى ل سەر ژيانا هونەرمەندێ نەمر ئاخفت ، بهايێ وى يێ هونەرى ژمەرا ئاشكەرا كرو بيرهاتنێت خوە لگەل ل قەلەمدان . ئەڤە د بەرا گوهدارێت كورى گوهێ خوە دانە قەفتەكا سترانێت ئەيازىو دەنگێ وى يێ زەلالو نەمر .

ئەڤ كورەك بكوتايى هاتو نێزيكى سەعەتەكێ كێشا .

**«روژا هونەرىو ئاهەنگەك»**

بهەلكەڤتنا روژا هونەرى ، نيقابا هونەرمەندا ل دهوكێ ل رێكەفتى ١٩٨٧/١/٨ ب ئاهەنگەكێ رابون ل هولا بزاڤێت ڤێرگەهێ ، هژمارەكا بەرپرسيارو هژمارەكا بەرفرەهـ ژ جەماوەرێ دهوكێ لێ بەرهەڤبون .

موڤكێت ڤێ ئاهەنگێ د پێك هاتىبون ژ هژمارەكا سترانو ئاوازا ، هاتنە پێشكێش كرن ژ لايێ ستران بێژو هونەرمەندێت پارێزگەهێ ، ديسان تيپا هونەريا رێڤەبەريا بزاڤێت ڤێرگەهىو تيپا مللىيا هونەرىيا نيقابا هونەرمەنداو تيپا هونەرىيا ئێكەتيا ئافرەتێت دهوكێ ، پكشدارى دڤێ ئاهەنگا خوەشدا كرن يا كو نێزيكى دوو سەعەتا كێشاى .

**«هونەرمەندێت دهوكێ د پێشانگەهەكێدا»**

بچاڤدێريا جێگرێ رازگرێ نهێنى يێتايێ دهوكێ يێ پارتا بەعسا عەرەبيا هەڤپشكى هێژا «عبدالسلام العناز» ل رێكەفتى ١٩٧٨/١/١٠ ل هولا رێڤەبەريا رەوشەنبيرى جەماوەر ،



پێشانگەها هونەرێ شێوەکاری‌و نڤیسینا عەرەبی‌یا نیقابا هونەرمەندا ل دهوکێ هاتە ڤەکرن .

هونەرمەندێت پشکداری دڤێ پێشانگەهێ‌دا کرین ئەڤەبون :

فهمی صالح بالابی – عبدالرحمن وحید – عارف عبدالله ئامێدی – داود درویش – صدیق حامد – حسین حجی ئەنور جمیل جزراوی – خلیل عبدالقادر .

**«چلا مەئتەمینی یا نەمر محمد عارفێ جزیری»**

ل رێکەڤتی ۱۹۸۷/۱/۲۶ ، ب ئامادەبونا هێژایان محمد امین محمد ئەمینداری گشتی یێ رەوشەنبیری‌و لاوان‌و نامق رقیب سورچی پارێزگەرێ دهوکێ نیقابا هونەرمەندا ل پارێزگەهێ چلا مەئتەمینی یا ستران بێژێ بناڤ‌و دەنگ خودێ لێخوش محمد عارفێ جزیری کر . جەماوەرێ هونەرمەندێ نەمر ل ئاکرێ‌و هەڤلێرو مویسل‌و زاخوو ئامێدیێ‌و بەغدا ئامادەبون ، ژ بلی نوینەرێت نیقاباو ئێزگەو تەلەڤزیوناو ئێکەتی‌و رێکخراوێت مللی ل پارێزگەهێ .

پروگرامێ چلێ یێ پێك هاتی‌بو ژخاندنا چەند گوتارەکاو هەلبەستا ب هەلکەڤتنێ . ل پێشیێ گوتارا نیقابا هونەرمەندا هاتە خاندن ژ لایێ هێژا صلاح صالح .

ددویڤدا هێژا تیلی امین سەرۆکی تایێ دهوکێ یێ ئێکەتیا ئەدیب‌و نڤیسڤانێت کورد پەیڤا ئێکەتیێ خاند ، پاشی هەلبەستەك بهەلکەڤتنێ هاتە خاندن ژ لایێ هوزانڤانێ هێژا خالد حسین ، ددویڤدا هێژا سگڤان عبدالحکیم پەیڤا ئێزگا کوردی ل بەغدا خاندو خالد حاجی خضری ژی پاش هەلبەستا خوە بهەلکەڤتنێ خاند . سەیدا نزار محمد سعیدی ژی کوتارەك لسەر ژیان‌و بەرهەم‌و هونەرمەندیا خودێ لێخوش خاند رایا خوەو یا چەند هوزانڤان‌و ستران بێژو هونەرمەندا ل سەر خودێ لێخوش









خویا کرن .

ددویڤدا بهجت مجید هەلبەستەك خاندو هێژا شیرزاد انور عوزێری پەیڤا نیقابا هونەرمەندێت هەڤلێرێ خاندو دەرفەت هاتە دان بو خسرو فارس‌و هەلبەستەك خاند بهەلکەڤتنێ ، ل دوماهیێ ژی پەیڤا بزاڤێت ڤێرگەها ل هەڤلێرێ هاتە خاندن‌و هەروەها هونەرمەند تحسین طەی بیرهاتنێت خوە ل گەل ستران بێژێ نەمر دیارکرن .

ئەڤە چەند بروسکەك هاتنە لێدان بو رێڤەبەریا چلا مەتەمینی ب هەلکەڤتنێ ژلایێ تیپا هونەری یا مللی ل هەڤلێرێ‌و دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی‌و چەند هەڤال‌و هوگرێت محمد عارفێ جزیری ژ وان ستران بێژ فؤاد احمد .

سلاڤ‌و هزار سلاڤ ل جانێ تەیێ پاك بن بابێ کەریمێ دەلال ، دەنگێ تەیێ زەلال ئاوازێت تەیێت شرین لاووك حەیرانێت تەیێت دل حەبین‌و خەم رەڤین نامرن ئەو تم دگوهێت مە دانە ، تم بهارا دلانە .

**«چەند تێبینی‌و درست‌کرنەك»**

سەیدایێ هێژا محمد امینێ ئوسمان چەند بیرو رایەك دژمارا (٥٠)دا ژکاروان دەربریبون هندەك ژ وان نەمینا ئەو بوچوی هاتبونە خارێ ، دڤان تیبینیێت ژێری‌دا درست دکەت :

۱) (بەهـ) ئانکو (باش)‌و (دین) ئانکو ئابین ، یان دیتن ، دبیتە (دیتنا نوی) .

۲) من نەگوتیە کو (شمدینان) رۆژ پەرێسی‌یە ، شەم دکوردێ‌دا مومکە ، شەمالکە ، نیشانن بو روناهیێ ، ئیشارەتە بو پەریستنا روناهیێ چ ئاگر چ رۆژ .

۳) من دیارکرکو (بوهتان) دەڤەرا (صەنەما)یە ، ل هێرە دبیتە پەرێستنا صەنەما ، وەئەنا .

# پۆستەی کاروان پۆستەی کاروان

سۆزان حەریری
ئامادەی کردووە

خوێنەری هێژا :

لەماوەی چوار ساڵی رابردوو کە «کاروان»ی تیادا دەرچووەو ، بە زوربەی شارو شارۆچکەکانی وولاتدا بلاوبۆتەوەو ، گەییوەتە دەستی بەشێکی زۆر ئەو خوشکو برایانەی خولیای نووسینو خوێندنەوەیان هەیە ، یا هەندێ لەوانەی لەو سەردەمە کورتەدا ئاشنایەتیان لەگەڵ خوێندنەوەدا پەیدا کردووەو ، کاروانیان ناسیوە . لەو ماوە کورتەدا دەیەها نامەو نووسینی هەمەجۆرمان بۆ هاتوون ، ئەڵبەتە هەندێکیان بلاوبوونەتەوەو ، هەندێکی دیکەیشیان شیاوی بلاوکردنەوە نەبووینو بەرێزەوە نووسەرەکانیان ئاگادار کراوەتەوە . لەو نامەو نووسینانە ، بەشێکیان نووسەرەکانیان بە پەرۆشەوە داوا دەکەن ببنە هاوریێو دۆستی گۆڤارەکەمان . ئێمە بەو خوشکو برایانە دەڵێین ، ئێوە هەموو کاتێك هاوریێو دۆستی دڵسۆزی ئێمەن جا بەرهەمەکانتان بلاوبکرێتەوە یان نا ، نامەمان بۆ بنێرن یان نا ، ئێمە هەموو خوێنەرێکی ووشەی کوردی بە دۆستێکی وەفاداری «کاروان» دەزانین . ئەمەیان لەلایەك ، لەلایەکی دیکەشەوە هەندێ لە نووسینانەی دەگەنە گۆڤارەکەمان زۆر بە

ساده‌یی‌و ساکاری‌یه‌وه نووسراونه‌ته‌وه، وه‌کو ئه‌وه‌ی ده‌نووسن فلانه‌که‌س شاعیرێکی نه‌ناسراوی کورد . به‌لام گه‌لێ جار ئه‌و شاعیره نه‌ناسراوه ته‌مه‌نی هه‌ر چوار جار به‌قه‌ده‌ر ته‌مه‌نی گۆڤاره‌که‌مان ده‌بێ ، جا ده‌بێ هۆی نه‌ناسراوی ئه‌م برا شاعیره چی بێت‌و ، بۆ تا ئێستا گۆڤارێك یا رۆژنامه‌یه‌ك چه‌ند دێرێکی شیعره‌کانی بلاو نه‌کردبێته‌وه . گه‌ر شاعیرێکی لێهاتوو بێت . یا هه‌ندێ بابه‌تی وامان بۆ ده‌نێرن به‌ناوی ره‌خنه‌وه ، که هیچ مه‌رجی ره‌خنه‌یی تیادا نایه‌ته دی‌و ، له‌گه‌ل ڕێبازی گۆڤاره‌که‌شمان ناگونجێن . به‌هه‌ر حال . سوپاسی هه‌موو لایه‌کیان ده‌که‌ین‌و هیوای سه‌رکه‌وتنیان بۆ ده‌خوازین .

ئه‌مه‌ش وه‌لامی کۆمه‌ڵێکی دیکه‌ی ئه‌و نامه‌و به‌رهه‌م‌و بابه‌تانه‌یه که گه‌یشتوونه‌ته گۆڤاره‌که‌مان‌و بۆ بلاوکردنه‌وه نه‌شیاون‌و ، پێشه‌کی داوای لێبوردنیان لێ ده‌که‌ین .

**● بۆ ئه‌و برا خۆشه‌ویستانه‌ی ئه‌م به‌رهه‌مانه‌یان بۆ ناردووین :**

«ره‌خنه‌ك ل سه‌ر چه‌ند مامکا ، دیلێکی ئێرانی ، زه‌حمه‌ت کێشێکی کوردستانی ئێران ، شاعیراغان له هۆنراوه‌ی کۆن‌و نوێی خۆشه‌ویستی‌دا ، ئه‌م هونه‌رمه‌نده به‌هره‌داره بناسه» .

سوپاستان ده‌که‌ین بۆ ئه‌و به‌رهه‌مانه‌ی بۆتان ناردووین ، ئه‌وه‌ی راستی بێت ئێمه حه‌زمان ده‌کرد ئه‌م نووسینانه‌تان به‌سه‌ر لاپه‌ره‌کانی کاروانه‌وه بده‌روشانایه‌ته‌وه ، به‌لام داخیان ناچی که له‌زۆر رووه‌وه بێ‌هێزی‌و کزی‌یان پێوه دیار بوو ، ئه‌مه جگه له‌وه‌ی که زیاتر له‌بابه‌تی رۆژنامه ده‌چوون ، نه‌وه‌ك گۆڤار ، بۆیه داوای به‌حشین ده‌که‌ین‌و هیوای سه‌رکه‌وتنتان بو ده‌خوازین له‌دوا رۆژداو هه‌ربژین .

**● بۆ کاکه محمد خدر محمد گه‌لیاوه‌یی له شه‌قلاوه :**

کاکی برا زۆر زۆر سوپاست ده‌که‌ین به‌رامبه‌ر به‌و هه‌سته ناسکه‌ی له‌نامه‌که‌ت‌دا ده‌رت بریوه ، هه‌ق خۆشته که ده‌ڵێی «کاروان» زۆر جار ده دوازده رۆژ ره‌ت ده‌بێ به‌سه‌ر کاتی ده‌رچوونی ئه‌وسا ده‌که‌وێته بازاره‌وه ، به‌لام برای ئازیز باوه‌ڕت بێ ئێمه دریغمان نه‌کردووه ، به‌ڵکو هه‌موو کاتێك دوو به‌ڵکو سێ ژماره‌مان به ئاماده‌کراوی له‌چاپخانه‌یه ، به‌لام چارمان ناچاره‌و چاپخانه‌که له‌وه زیاتر فریای چاپکردنی گۆڤاره‌که‌مان ناکه‌وێ ، بۆ ژماره «٢٨» و «٢٩»ی گۆڤاره‌که‌شمان ، به‌داخه‌وه که ئه‌م دوو ژماره‌یه‌مان نه‌ماوه . . دووباره سوپاس . .

**● بۆ ئه‌و برا به‌ڕێزانه‌ی ئه‌م به‌رهه‌مانه‌یان بۆ ناردووین :**

«سووتانی پێنج وه‌رزی عیشق ، به‌یادی دوو ماچه‌وه ، هاوڕێم کوێستان ، ئاواته‌کەم ، یادێك بۆ رابردوو . خۆزگه‌ی سه‌ووشت ، گری عه‌شقێکی هه‌ڵچوو ، پێشکه‌شه به چه‌وساوه‌کانی نیشتمان ، ووته‌ی دایکێ . زارووکێن دی» .

ئه‌م به‌رهه‌مانه‌ی ناومان بردوون له‌زۆر لایه‌نه‌وه که‌م‌و کورتی‌یان تیادا هه‌بوو ، بۆیه بۆمان نه‌کرا بلاویان بکه‌ینه‌وه ، سوپاستان ده‌که‌ین‌و چاوه‌روانی به‌رهه‌می دیکه‌تانین .

**● بۆ ئه‌م به‌ڕێزانه‌ی شیعریان بۆ ناردووین :**

«محتاج دینۆ شێخانی ، خدر کاك ملا همزه گولانی ، سامی عبدالقادر ، خالد حاجی خضر ئاکره‌یی ، رێبوار سدالکریم مارف ، به‌همه‌ن عثمان ، یوسف شاخی . بکر عبدالله مجید ، عدنان صدیق ، حسین مصطفی جعفر ، هیوا کلپه ، عبید محمد حسین ، ستار قادر مولود گه‌ردی ، نه‌وزاد حاجی لطیف ، کمال شوکت حمه خورشید ، نه‌وروز عباس سعید ، طاهر صالح فتاح ، علي جمعه علي ، مقداد مردان دێرگژنکی ، وریا رؤوف جلی زاده» . .

به‌ڕێزان ، هاوکاری کردنتان له‌گه‌ڵ گۆڤاره‌که‌مان‌دا مانای خۆشه‌ویستی‌و دڵسۆزی ئێوه‌یه بۆ «کاروان»و ، وه‌فاداری‌تانه بۆ ووشه‌ی شیرینی کوردی ، به‌لام به‌داخه‌وه ئه‌و شیعرانه‌ی بۆتان ناردووین له‌زۆر رووه‌وه کزو لاوازو ساده‌ن بۆیه شیاوی بلاوکردنه‌وه نه‌بوون ، هیواخوازین لێیان دڵگیرنه‌بن‌و بمان به‌خشن .

● **بۆ کاکە نەوزاد عزیز . لە هەولێرەوە :**

کاکی برا . سوپاست دەکەین لەبریتی ئەو شیعرەی بە ناونیشانی «سێ هۆنراوەی کورت»ەوە بۆت ناردووین . بەڵام دەبێ ببووری کە هەر ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیاوی بڵاوکردنەوە بوو . چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین :

کە جێت هێشتم
زەوی‌و ئاسمان لەگەڵ منا بۆت ئەگریان
خۆت فرمێسکی چاوی بارانت نەسری
خۆت توورە بوویت
کێڵگەی تینووی حەزەکانت تێر ئاو نەکرد

● **«ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی شیعری «کەلامی مەلا ئەحمەد»ەوە . برادەرێك لە شاری سلێمانی‌یەوە بۆی ناردووین . .**

ئێمە زۆر سوپاسی ئەو برا بەڕێزەمان دەکەین . بەڵام دەبێ بمان بووری کە بۆمان نەکرا ڕوونکردنەوەکەی بۆ بڵاوبکەینەوە . چونکە بابەتی تیرو تەسەل‌ترمان لەم بارەیەوە پێ‌گەییوە . کە زانیاری ووردتری تێدایە .

● **بۆ کاکە «غفور طاهر» لە قەزای مەخمووری سەر بە پارێزگای هەولێر . .**

براگیان . سوپاست دەکەین بۆ ئەو باسەی بە ناونیشانی «شاعیرێکی نەناسراو لە مەخموورەوە» . بۆت ناردووین . بەڵام سەیر لەوەدایە کە کاك ڕەنجدەر تا ئێستا هەوڵی ئەوەی نەداوە خۆی بە خوێنەران بناسێنی‌و . تەنانەت تاکە شیعرێکی خۆیشی لە ڕۆژنامەیەك یا گۆڤارێك‌دا بڵاو بکاتەوە . ئەمە جگە لەوەی کە هێشتا لە تەمەنی لاوی‌دایەو بەچاکی لەبواری شیعر نووسینەوەدا قاڵ نەبۆتەوە . خۆزگە کاك ڕەنجدەر پێشتر ئەم هەوڵەی دەدا ئەوسا کاکە غەفووریش ئەرکی ناساندنی ئەوی دەگرتە ئەستۆو . باسێکی تێرو تەسەلی لەبارەیەوە دەنووسی‌یەوە . .

● **بۆ کاکە «عدنان صدیق حەوتەغاری» . لە گوندی حەوتەغاری ناوچەی داقوق . .**

براڵە ئەو باسەی بەناوی «شیعرێك‌و شاعیرێکی وون‌بوو»ەوە بۆت ناردووین . ئەزۆر ڕووەوە کزو لاوازە . بۆیە بۆ بڵاوکردنەوە ناشێ . چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین‌و هەربژیت .

● **کاك «صدیق احمد» لە دهۆکەوە پارچە شیعرێکی بۆ ناردووین لەژێر ناوی «دێ زڤرم»دا :**

ئێمە لەوکاتەی سوپاسی ئەم برا ئازیزەمان دەکەین بۆ بەشداری کردنی لە گۆڤارەکەماندا . لەهەمان کاتدا پێی ڕادەگەیەنین کە تەنها ئەم کۆپلە شیعرەی شیاوی بڵاوکردنەوە بوو کە لە خوارەوە بڵاومان کردۆتەوە :

● **دێ زڤرم** ●

ئەز ڕێڤینگم
دێ شەڤینم ڕێکا درێژ
ئەز ڕێڤینگێ . .
خواستنا بەژنا نازێمە
بلا ل پێشیا مندا هەبن
چوار کەلەمۆك
خەم پێ نینە . .
دێ دەمە سەر .

● **بۆ ئەو برایەی کە چیرۆکی «السفرة الاخیرة»ی بە زمانی عەرەبی‌یەوە بۆ ناردووین .**

برای ئازیز بیوورە کە چیرۆکەکەت شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، هەروەها شێوەی نووسینەکەیشت بەدڵی ئێمە نەبوو ، وەك بڵێی لەوە ئاگادار نیت کە چەند جار داوامان کرد بەقەڵەمی «حبر»و لەیەك دیوی کاغەز بنووسن ، هیواداریی بۆ داهاتوو ئاگاداری ئەم لایەنەیش بیت .

● **«نامەیەك لە – ناظم حکمت – ەوە بۆ محمەدی کوری . .**

ناونیشانی ئەو نووسینەیە کە برادەرێك لە شاری

کەرکووکەوە بۆی ناردووین .

سوپاس بۆ ئەو برادەرە ئازیزەو . هیوادارین لەمەودوا بەرهەمی تازەترو بەسوودترمان بۆ بنێرێ . تاوەکو بتوانین لە گۆڤارەکەماندا بلاوی بکەینەوە .

● **بۆ ئەم دوو دۆستە ئازیزە «کانی کریم»و . «بەیان سعدون» . لە سلێمانی‌یەوە . .**

هەربژین بۆ ئەو دڵسۆزی‌یەتان بەرامبەر بە گۆڤارەکەمان . سوپاسی ئەو هەستە پاکەشتان دەکەین کە لە نامەکەتاندا دەرتان بریووە . ئەو بابەتەی بەناوی «دوانزە سوارەی مەریوان»ەوە بۆتان ناردووین شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو . ببوورن . خۆزگە لەمەودوا بەرهەمی بەکەڵکترتان بۆ دەناردین . .

● **بۆ ئەو خوشكو برا بەرێزانەی ئەم چیرۆکانەیان بۆ ناردووین :**

«ستێپانی دڵدار . خۆزگە . هیچ نامرت . نەهێنی کۆچێکی وون بوو . میوانێکی بەرەبەیان . وێنەی جوتیارێکی هەژار . دیدەن» . .

لەگەڵ ڕێزماندا بۆ ئەو ماندووبوونەتانو بەسەرکردنەوەی گۆڤارەکەمان . بەلام دەبێ ببوورن کە چیرۆکەکانتان شیاوی بلاوکردنەوە نەبوون . چاوەڕوانی بەرهەمی بەپێزترتانینو هەربژین . .

● **بۆ کاکە «جهور حمید حسن» لە زاخۆوە :**

برای ئازیز سوپاست دەکەین بۆ ئەو چیرۆکە فۆلکلۆری‌یەی بۆت ناردووین . بەلام دەبێ بمان بووری کە شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو .

● **بۆ کاکە «کاظم مغدید خۆشناو» لە هەولێرەوە :**

کاکی برا پێشەکی زۆر سوپاست دەکەین بۆ هاوکاری کردنت لەگەڵ گۆڤارەکەماندا . بەلام دەبێ بمان بووری کە ئەو بابەتەی بەناونیشانی «شاعیری تێکۆشەر ئریش فرید» . لەگەڵ ڕەوتو ڕێبازی گۆڤارەکەماندا ناگونجێ . چاوەڕوانی بەرهەمو نووسینی دیکەتانینو هەربژیت .

● **«هێمنو جودایی ژیان» . بابەتێکە کاکە بەختیار سعید رشید بۆی ناردووین . .**

سوپاس بۆ ئەم برا بەرێزەمان کە ئەم لێکۆڵینەوەی بۆ ناردووین . بەلام بابەتەکە لەزۆر ڕووەوە سادەو ساکارەو شیاوی بلاوکردنەوە نی‌یە . ئاواتەخوازین ئەم برایەمان هەوڵی زیاتر بداتو بابەتی تازەتر هەڵبژێرێ بۆ لێکۆڵینەوەو قووڵتر بچێتە نێو باسەکە . دووبارە سوپاس .

● **بۆ ئەو دوو برایەی ئەم دوو بەرهەمەیان بۆ ناردووین :**

«خۆزگەی پیرە پیاوێك . مەی لە هۆنراوەکانی بێ‌کەس دا» .

لەگەڵ ڕێزو سوپاسماندا بۆ ئەو دوو برا ئازیزەمان . داوای لێبووردن دەکەین کە بەرهەمەکانیان شیاوی بلاوکردنەوە نەبوون . خۆزگە هەوڵی ئەوەیان دەدا باسو بابەتی بەکەڵکترو سوود بەخشتریان بۆ دەناردین . کە شیاوی بلاوکردنەوەبن لە گۆڤارەکەماندا .

● **بۆ کاك «عبدالرحمن ملا کاك احمد چۆمانی» لە شەقلاوە . .**

برای بەرێز ئەو نووسینەی بەناوی «ئەشکەوتی کونە پێست»ەوە بۆت ناردووین بۆ ئەوە ناشێ کە لە گۆڤارەکەماندا بلاوی بکەینەوە . ببوورەو سوپاست دەکەین .

● **«خۆشەویستی» ناونیشانی پارچە شیعرێکە کاکە شمس‌الدین مشیر یابە – خۆرین لە ڕەحیماوەی کەرکووکەوە بۆی ناردووین .**

سوپاس بۆ کاکە شمس‌الدینو ئەمەیش کۆپلەیەکی شیعرەکەیەتی :

● **خۆشەویستی** ●

ئازیزەکەم . تاکە گوڵم
گەر نەت‌بینم ڕۆژێ جارێ
وا ئەزانم هەوری بەهار

نەرزەو زریان
بەسەر مندا دا ئەبارێ

● **کاکە «هەرمان محمد رەسوڵ . لە قەڵادزێ»وە .**

رەخنەیەکی بچکۆلانەی ... ناردووین لەژێر ناوی «ئەمینداری دەزگاو...» ... لەگەڵ ئەو ... شاعیرەدا ... رەخنەکەی لێ گرتووە . چونکە بابەتەکە زیاتر بۆ ... بۆ بلاوکردنەوە ئەمە جگە لەوەی کە شاعیرەکەیش هەر دراوسێی خۆیەتیو لێیەوە نزیکە .

● **بۆ ئەو نووسەرەی ئەم بابەتەی بۆ ناردووین :**

**«ئاوڕدانەوەیەك لە هەوڵە سەرەتایی‌یەکانی مرۆڤ بۆ فرینە ئاسمان»** .

پێشەکی دەڵێین خۆزگە نووسەر ناوو ناونیشانی خۆی لەبیر نەدەچوو . چونکە ئێمە چەندەها جار ئاگاداری‌ی لەم بابەتەمان لە گۆڤارەکەدا بلاوکردۆتەوە . هیوادارین نووسەر لەمەودوا ئەم لایەنە فەرامۆش نەکا . بۆ نووسینەکەیشی دەبێ ببورێ چونکە شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو . چونکە لەرووی وەرگێڕانو دارشتنو زمانەوانی‌دا کەمو کورتی تیادا هەبوو .

● **بۆ ئەو نووسەرانەی ئەم بەرهەمانەیان بۆ ناردووین :**

«سێ مەتەڵی کوردی . پوور سۆر . لاوکی حەسەنو حەیدەر . خودا جوانی پیاو نیشان دەداتەوە ، ئەو کەروێشکەی ویستی خۆی بەسەر هەموو ئاژەڵەکانی هاوڕێ‌ی‌دا زل بکات . کۆترە رازاوەو کۆترە سوورە» .

سوپاس بۆ ئەو هەستە پاكو پڕ سۆزەتان . بێگومان ئەم هەوڵەی ئێوە مایەی خۆشحاڵیو شانازی هەموو مرۆڤێکی دڵسۆزە . بەڵام برا شیرینەکانم جیهانی فۆلکلۆرو کەلەپووری نەتەوەکەمان ، جیهانێکی گەلێ فراوانە . هەر تەنها بە کۆکردنەوەو لەزار وەرگرتنی دەقێکی فۆلکلۆری مەسەلەکە کۆتایی نایەت . بەڵکو پێویستی بە هەڵبژاردنو لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنو لێووردبوونەوەیش هەیە . ئەلبەتە ئەم نووسنانەی ئێوەیش ئەم ووردە کاری‌یانەی تیادا رەچاو نەکراوەو . هەندێکیان هەر زۆر بە ساکاری‌یەوە ئامادەکراونو خراونەتە سەر کاغەز . هەندێکیشیان جارەهای جار لەبارەیانەوە نووسراوەو سوواون . جا خۆزگە زیاتر هەوڵی هەڵبژاردنی بابەتی واتان دەدا کە شیاوی بلاوکردنەوەبنو دووبارە سوپاستان دەکەین .

● **بۆ کاکە «بێکەس مەنتك» و «صابر صمد بیبانی»**

سوپاستان دەکەین بۆ ئەو دوو بەرهەمە فۆلکلۆری‌یەی بۆتان ناردبووین . بەڵام دەبێ بمانبەخشن کە لەگەڵ رێبازی گۆڤارەکەمان‌دا نەدەگونجانو خاڵییش نەبوون لە کەمو کورتی . ئاواتەخوازین لەمەودوا بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێرنو هەربژین .

● **بۆ ئەم دوو دۆستە ئازیزەمان . «کانی کریم» و «بەیان سەعدون» لە شاری سلێمانی‌یەوە . .**

پڕ بەدڵ سوپاسی ئەم دڵسۆزی‌یەتان دەکەین بەرامبەر بە گۆڤارەکەمانو . دڵنیاتان دەکەینەوە کە ئەو هەوڵو کۆششەی ئێوە رۆژێ دەبێ ئەنجامێکی چاکی بێ ، خۆزگە لەگەڵ شارەزایەك‌دا ئاشنایەتیتان دەبوو بۆ ئەوەی بەووردی رێو شوێنی نووسینو کۆکردنەوەی زانیاری فێر دەکردن ، بەهەرحاڵ ئێمە ئاواتی سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین .

بۆ ئەو بابەتەی بۆشتان ناردووین بە ناونیشانی «کورتە مێژوویەکی چەمێ گەورە» ، لە هەندێ لایەنەوە کەمو کورتی تیابوو ، بۆیە داوای لێبووردن دەکەین کە شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو ، دووبارە سوپاس . .

**خوشكو برا شیرینەکانم .**

**وا ئەمجاریش لێرەدا دەوەستینو . کۆتایی بە بەشێکی دیکەی «پۆستەی کاروان» دێنین . دوای ئەوەی وەڵامی کۆمەڵێکی تری نامەو نووسینەکانی ئێوەمان دایەوە ، ئیتر تا ژمارەیەکی دیکەو . بەیەك گەیشتنەوەیەکی تر ، هەر شادو سەرفراز بنو هەربژین .**

# كاروان

في هذا العدد




مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة للثقافة و الشباب
باللغتين الكردية و العربية

رئيس التحرير
محمد امين محمد احمد

نائب رئيس التحرير
حسين عارف

54

نيسان /١٩٨٧

السنة الخامسة



العنوان : اربيل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مجلة كاروان ـ هاتف / ٢١٩٢٢

# النجمة العالية ..

– بابا . . . ! اين هي النجمة ؟؟
– انها لا تظهر للعيان من هنا ، ياحملي الصغير .
– ولماذا لا تظهر للعيان ، يابابا !؟
– يابني ، ان السماء تشوبها الكدرة ، و . .
– ولم تشوب السماء الكدرة !؟
– ام مم . . . لان . . هذه المدينة كبيرة ، وفيها نفط كثير . . وحين يشعلون فيه النار ، يتحول الى دخان و . . يسد على النجوم افاق الرؤية . . . عندما نعود الى (نبع الحوريات)[١] . نتسلق – سوية – قمة (الشيخ سيوه يل)[٢] ، ثم من هناك نصعد متن نجمتك . .
– لكنني ، ياابتاه ، لااستطيع المشي بعد الان . . . ابتاه ! ، لاتدع الطبيب يأخذني . . . انها تطيب ، وسوف تتماثل للشفاء من تلقاء نفسها . اليس كذلك بربك ؟!
– ولكن ياصغيري ان الطبيب هو ادرى منا علينا ان نلتزم بما يوصي به .
– اذن لن أرافقك . والنجمة ايضاً لاأريدها .
– انها كانت غلطتك يابني . غلطتك كانت . . .
– ابتاه ! الم تقل انت بنفسك ، ان في وسع الطائرة ، الوصول الى النجمة العالية ؟! . . اذن ، سوف اخبرها فيما لو سارت اليها ان تهوي بها من عليائها .
ابتي ! هل تعود بي غداً الى البيت ؟ انها لا تؤلم . . . لقد آلمتني كثيراً حينما انجرحت . . اما الان فانها لاتؤلمني . الم تقل انت بأننا اذا وصلنا الى (الكوكب العالي) فانها تندمل ، من تلقاء نفسه ، وتتماثل للشفاء ؟! ولماذا لم نذهب يابابا ؟!
أبتي ! ياابتي ، خذني الان بين ذراعيك ، واحملني واصعد بي الى مشارف (الشيخ سيوه يل) .
عندئذٍ – من هناك سوف اسير على قدميّ بنفسي . .
أما قلت أنت بالذات : بأننا اعتبارا من هناك سوف لن نسير على اقدامنا ؟ ! وأننا مثلما تسبح الاسماك في الماء هكذا نمشي ؟ ! ألا نختنق ؟ ! .
قل لي يا أبتي : ألا تؤلم الأسماك ارجلها ؟ ! .
ولماذا حين يرمي (خضر رەش) قنينة البارود في (البركة[٣] الصفراء) ترى الاسماك بعدها ، لا تستطيع السير ، فتستلقي هكذا مثلي – على ظهورها فوق سطح الماء ؟ ! .
أبتاه ، ثم انها لا تمتلك حتى الاجنحة ، كي تصفق بها وتطير ، لتحط الى جوار «النجمة العالية» . .
أما أنا فلو – كان لي جناحان لكنت الان اطير هكذا ، وأذهب . أو تأخذني بنفسك يابابا الى رأس (الشيخ سيوەيل) ؟ ! . ها . بابا ؟ ! .
– اجل يا ولدي .
– ومتىٰ ؟
– الان . . الوقت ليل . سنذهب غدا مبكرين .
– أبتاه ، الا تمنع الاطباء من أن يأخذوني ؟ ! .
– بلى أمنعهم يا ولدي . . غدا في وقت مبكر ، وقبل أن يحضر الطبيب ، سأحملك على حاركي ونغادر . .
سنصعد من السكة الرفيعة التي على جانب (نبع الحوريات) .
هل سبق لك ، وأن شاهدت الطريق ؟ !
إنها طريق صاعدة زلقة جدا ، غير انني لكثرة ما استطرقتها في تنقلاتي ، ملمٌ بها شبرا ، شبرا ، عارفٌ بصخورها ، صخرة صخرة . . فيما مضىٰ حينما كنت صغيرا ، كان ابي كلما استبدّ بي التعب ، وأجهدني السير ، يضعني فوق حاركه ، ومن ثم يتقدم الى الامام . كنت اذاك اتملىٰ على هواي جوانب الطريق ، وأمتع نظري كما يحلو لي دون أن ينتابني الخوف من الانزلاق ، أو السقوط . كانوا يقولون لابي : «انزله من على كاهلك يا رجل ، كي يسير على قدميه بنفسه . . انه ليس طفلا» .

وقتها كنتُ في مثل سنّك الان . كنا دائمي التنقل فيما بين المناطق السهلية الحارة . والجبلية الباردة .

احيانا كان يصادف ان يطول بنا المسير الى ان يخيم الظلام .

ابي كان قويا جدا . في كل مرة كان يبادر الاخرين بقوله : «ألا أيها الشباب ! بالله عليكم دعوا الخجل جانبا . لو أصاب احدكم الاعياء . وخانته قواه ، رجلا كان أم امرأة . فأنني على اهبة الاستعداد . كي احمله على كتفي . الى حيث يشاء» . كثيرا ما كنت استمتع بغفوة لذيذة . وأنا محمول على ظهره . . . مرة . وأنا غارق في النوم فوق حاركه ، اذا بي أنتفض اثر صفق جناحي احد السمانيات .

لكم تمنيت لو أرفرف مثل ذلك الطائر بجناحي . فانحدر صوب (وادي[4] الجان) الاخضر العميق .

أبي قال : «يا بني انك لست بطائر السماني[5]» . سوف تتهاوى . وتسقط . فتتهشم . وتتبعثر اشلاءاً» .

ولحد الانّ ، حينما أحلم . استحيل طائرا سمانيا . وبرفة من جناحي أنحدر الى عمق الغابة من علياء القمة .

لكنني حالما اتذكر قول أبي . ينتابني الخوف . فيهيض جناحاي . وأتهاوىٰ . ومهما أحاول وابذل . فلا تلمس قدماي الارض . الى أن استيقظ مذعورا . .

أما أنت يابني . فلا تخف . وكن مطمئنا . لأنني سوف لن أتخلىٰ عنك ، وسأظل ممسكا بك . وأحميك من السقوط .

اننا في هذه المرة . سوف لن ننحدر صوب (وادي الجان) . وانما يكون مسارنا بأتجاه كوكبك بالذات . .

أليس هذا حسنا يا ولدي ؟ ! .

ندت منه التفاتةٌ الى ابنه .

فصل برفق . كاهله عن حافة السرير الابيض الذي يرقد عليه ابنه . ثم مدّ عنقه متطلعا ، ورنا اليه . وهو متقرفص .

كان هو مغمض العينين . ثمة بسمة ساخنة كانت طافية على اساريره ، تشبه في صفائها ماء (نبع الحوريات) الرائق جدا . اذ يكتسح من طريقه الثلوج المتراكمة . أيام زمهرير كانون القارس . وهو ينحدر صوب (البركة الصفراء) .

قال في نفسه : --

– تُرىٰ لو علمت أمك بهذا الخبر . ماذا تفعل بنفسها ! ؟ . . وبأي وجهٍ أعود بك الى القرية يا صغيري المحبوب ! ؟ .

وهل تقوى ركبتاي بعد على حملك فوق حاركي لأصعد بك . واوصلك الىّ قمة (الشيخ سيوەيل) ! ؟ . . . لا . . . لم يقدر لأمثالنا أن يعيشوا دون سيقان ! . إننا لسنا بأشجار (وادي الجان) . ولا بالاسماك ، أو طيور السمانيات أيضا . حين لفه الصمت . لم يكن يتناهى الى سمعه سوى هدير محركات السيارات المسرعة . أسند ظهره الى الطبلية ، فألصق ركبتيه بصدره ، ثم أطبق عينيه : «غدا أحزم أمري مبكرا ، ولسوف أحملك . ونواصل السير . لا نعوج على القرية ، بل نسلك السكة الرفيعة ، ولا نتوقف الى أن يستقر بنا المقام فوق هامة (الشيخ سيوەيل) . واذ تسدل الظلمة ستارها ، ليبزغ كوكبك الصغير . هذه المرة لا يكون بزوغه من فوق قمة (الشيخ سيوەيل) ، وانما أبعد بكثير . عندئذٍ تبادرني فتقول : فلننطلق اليه وثبا . انك لا تفكر في (وادي الجان) ، كم هو عميق ، بعيد الغور ، ومخطر ؟ ! . انه الليل . مظلمةٌ هي الدنيا . لا يبين له من أثر . وأنا أتذكر كلام أبي ، فارجع القهقرىٰ . وأنت تتخيلني بغلاً . فتنطّ . وتثبُ . ثم تهمزُ خاصرتيّ بقدميك . لكي أتقدم بك الى الامام .

لحظتئذٍ ، أنسىٰ مقولة أبي ، فتنبجس في عروق أجنحتي دماء السمانيات . لا أنظر الى الاسفل . بل استجمع باصرتي ، فأُحدّقُ في كوكبك الصغير . ثم اقفز بخفة . فأرتفع مثل العنقاء . عند انطلاقتي الاولى ، ينبغي ألا اتذكر مقولة ابي . وألا اسقط . والا انتفض من نومي مذعورا . سأخذك . ولن أتوقف . حتى تلامس بيديك كوكبك الطالع . ان ابي لم يعلمني الطيران . أما أنا فينبغي علي ان اعلمك كيف تطير ، لان قلبي لا يطاوعني في ان اراك . وانت مضطجع مقعد طوال حياتك . اننا معروفون اباً عن جد بكوننا نلفظ أنفاسنا الاخيرة . ونحن وقوف . لا اطيق رؤيتك وأنت مقعد . تستلقي على جنبك أكثر من هذا . حينما تحرك لسانك لأول مرة بالنطق . واذكنت تطلب مني شيئا . فأتلكأُ في احضاره لك ، كنتَ تقول محتجاً : إنني لن اصبح ابنك بعد الان . فلِمَ – الان – أنت صامت هكذا . لا تنبس يا قسمتي ؟ لست ادري كيف اطبقتَ جفنيك . ونمتَ في هذه الليلة دون أن تقرّ عيناك برؤية النجمة العالية ؟ .

ها أنت وعلى مدى صيفين . أو ثلاثة . والى أنْ يستبدّ بجفنيك الكرىٰ . فتنام . وأنت مضطجع فيما بيني . وبين أمّك . تظلّ تحدثني بأستمرار عن النجمة العالية . وكيفية الوصول اليها . لست ادري لماذا شُغفتَ بها وحدها من دون كلّ تلك النجيمات ، والكواكب . فملكتْ عليك قلبك حتى لكأنهاملكك الخاص ؟ .

اني لاشكُّ في أن يخطر ذلك الكوكب الذي هو لك . حتى ببال

المنجمين ايضا ، ليعتمدوا عليه في حساباتهم عند قراءة طوالع الناس .

أيةُ حورية اسكنت قلبكَ الصغير ذلك الكوكب ، يا ولدي ؟ . فلو صدقوا ، وكان هو كوكبك الخاص بحق وحقيق ، لوجب أن يكون سامقا ، لايدانيه كوكب . ولوجبَ ايضاً ، أنْ تكون أنت بمنأىً عن هذا البلاء الذي ابتليت به ، يا وحيدي .

واذ فتح عينيه ، كانتِ الدنيا مضاءةً بهالةٍ من النور الكثيف الابيض . لا الشمس كانت تتراءىٰ له ، ولا ايُّ شيْ آخر . ثمة امرأة متسربلة بثياب بيضاء كانت واقفة فوق رأسه ، تترقبه . بأبتسامة رقيقة بادرته : –

– لماذا لم تخبر الخفير كي يزودك ببطانية زائدة ، تنام عليها ! ؟ .

واذ تلفت حواليه ، فلمح ابنه ، تذكر الليلة الماضية . اراد أن ينهض على قدميه . أحسَّ بساقيه اللتين كان يتوسدهما . وكأنهما قد فارقتا جسده .

ثمة لذعةٌ كاوية تصاعدت من أعماقه ، لكنه سرعان ما تمالك نفسه . قالت له الممرضة : –

– ساقاك متخدرتان . . مدهما قليلا ، كي يزول عنهما الخدر . . كيف استطعت أن تنام وأنت في وضعية الجلوس هذه ، أيها المنكوب ؟ ! .

هيا . . اسرع . يقول الطبيب : ان اول عملية جراحية تجرى اليوم هي لابنك .

– أيةُ عملية جراحية ؟ ! . . وهل تبترون ساقه ؟ كلا . . اذا لم يكن في مقدوركم معالجته ، فدعونا ، وشأننا . جزيتم خيراً ، إنني سوف اعود به من حيث أتيت .

– يا أخانا . . لقد تلوّث الجرح ، وأزمن ، وليس له من علاج آخر . فأن لم تُبتر ، فأنه سوف يموت .

– لا بأس عليه . . الموت أهون من ذلك . القىٰ بنظرة على ابنه . وضع راحة يده فوق جبينه . هو فتح عينيه . هذا قال : –

– يا (هەلو) . . قمْ يا بني ، لنبارح ، ونواصل مسيرنا على وجه السرعة . . فأذا قُيِّض لي أن ابقى على قيد الحياة ، فسأوصلك – اليومَ – الى قة (الشيخ سيوەيل) ، قبل أنْ يخيم على الدنيا الظلام .

نيسان ١٩٧٩ .

**الهوامش :**

توخياً للدقة ، وبغية تقريب مضمون القصة من فهم القاريْ الكريم . أثرتُ ترجمة اسماء الامكنة الواردة في سياق القصة حرفياً وهي على التوالي : –

١ – كانى پەريان – نبع الحوريات

٢ – پيرسيوەيل الشيخ سيوەيل

٣ – گۆمەزەردە البركة الصفراء

٤ – كانى جنۆكان – نبع الجان .

٥ – السُمانىٰ : الواحدة : سماناة والجمع : سمانيات . طائر أصغر حجماً من الحجل . من فصيلة الدجاجيات : (سويسكه) .

القصة منشورة في مجلة (كاروان) (المسيرة) في العدد (٣) لشهر كانون الاول من سنة ١٩٨٣ .

تاريخ ترجمتها الى اللغة العربية / اواخر نيسان من سنة ١٩٨٦ .

●

## صلاح شوان

١ – في قرية (مام رەش) بمنطقة (شوان) احدى ضواحي مدينة كركوك/ محافظة التاميم كانت ولادة صلاح الدين احمد خورشيد عام ١٩٤٧ .

٢ – تخرج من قسم اللغة الكردية بكلية الاداب/ جامعة بغداد ، بعدما أكمل الدراستين الابتدائية ، والثانوية في مدينة كركوك .

٣ – بداياته كانت مع الصحافة ، حيث عمل فيالصحف والمجلات الكردية ، مثل صحيفة (هاوكارى) (التضامن) ، وكذلك مجلتي (بيان) ، و(روشنبري نوى) (المثقف الجديد) الصادرتين باللغة الكردية ، وكذلك عمل في جريدةالوقائع العراقية .

٤ – عين مديراً للشؤون الثقافية في دار الثقافة والنشر الكردية .

٥ – وهو – الان – عضو في المجلس المركزي لاتحاد الادباء والكتاب في القطر العراقي ، لدورتيه الاولى ، والثانية . .

٦ – عرف شاعراً ، وقصصياً وصحفياً وناقداً حيث نشر عام ١٩٨١ اضمامه من قصائده في ديوان سماه «حبيبتي ليست سحابة خريفية» ، بالاضافة الى نشره للعديد ن القصص على صفحات الجرائد ، والمجلات الصادرة باللغة الكردية .

# اين عاشت هذه القبيلة؟ وماذا حل بها؟ وهل كان اسمها جافان ام كلهان؟




تمهيد : -

في سنة ١٩٥٦ - ١٣٧٥ القى العلامة الكبير المؤرخ الذي عاش للتأريخ الدكتور مصطفى جواد - رحمه الله وجعل الجنة مثواه - كلمة قيمة حول قبيلة «الجاوان» الكردية بعنوان (جاوان القبيلة الكردية المنسية ومشاهير الجاوانيين) وكانت للمحاضرة قيمة خاصة للشعب الكردي . كما وكان لها صداها الكبير . . حيث تثبت حقيقة قوة ونفوذ الكرد في القرون الأولى من صدر الأسلام . أذ كانوا هم الذين ساندوا الخلافة العباسية ضد (البويهيين) و (الغز) و (السلجوقيين) وكانوا يستقرون في هذه المناطق التي تسمى اليوم محافظات (ديالى - بابل - واسط) وكذلك كانوا يعيشون في بغداد والحلة . وبعد أن أنتهى الدكتور مصطفى جواد من القاء محاضرته وتوديع المستمعين الذين تقاطروا لأستماعها . . أصبحت أمامنا - أنا والدكتور - فرصة لمتحادث حديثاً خاصاً . عندئذ توجه اليّ قائلاً : - ما هو رأيك في قبيلة

(الجاوان) هذه ومرابعها ومساكنها القديمة . . ؟ ؟ الا تعتقد أنها أستقرت قديماً في ضواحي (سيروان وقرتپة) قلت من جوابه : - دكتور لحد الأن أني لم أمعن النظر من شأن هذه القبيلة ولا بحثت عنها . . ! لماذا لم يرد ذكر أسم هذه القبيلة كقبيلة من (الشرفنامة) ؟ ولكني بعد أن أستمعت الى محاضرتكم القيمة سوف أترجمها الى اللغة الكردية . وكذلك أدرسها دراسة متعمقة ومستفيضة . ثم بعد هذا اللقاء ومرور مدة ترجمت المحاضرة الى اللغة الكردية . ونشرتها مسلسلاً على صفحات جريدة (زين) الذهبية . . وبعد فترة أخرى سنحت الفرصة أن تلاقينا مع (الدكتور مصطفى جواد) ثانية من المجمع العلمي .

وأثرنا الموضوع السالف مجدداً . وقلت له : - دكتور يظهر لي أن قبيلة (جاوان) هذه كانت تقطن في منطقة (جوان رو) ومن ثمة نزحت نحو الجنوب . فأن كلمة (جوان) هي نفس كلمة (جاوان) الكردية وحسب ومشتقة منها . وليست مشتقة من كلمة (جوان) الفارسية . . وقد أستحسن الدكتور كلامي هذا وتقبله وأستمع اليه برحابة صدر . ثم قال في جوابي أن هذا الموضوع يحتاج الى بحث وتحقيق أعمق وتمحيص . . فأنت من جانبك عليك أن تبحث وتستقرئ الكتب الفارسية والتركية القديمة .

وأنا بدوري سوف أبذل قصارى جهدي في تحقيق الموضوع . . ولكنه في هذه الظروف الشاذة أذا بأعاصير الحقد والكراهية والأوضاع السياسية الدقيقة رمت بي الى ضواحي البصرة . ثم بعد أن قضيت سنتين في (شمرته) و (البصرة) نقلت الى مندلي .

ولما وقعت ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ عدت الى كركوك . وخلال هذه الفترة جرت عدة أتصالات عن طريق الرسائل والهاتف بيني وبين الدكتور مصطفى جواد . ولم تكن هذه الأتصالات لها مساس بموضوعنا هذا وأنما كنا نخوض في مواضيع أخرى . .

ومع هذا فأني واثق بأن الدكتور بعد محاضرته السابقة لم ينشر أي بحث يتعلق بموضوع (الجاوانيين) . . وعندما كنت خارج الوطن خلال سنوات ١٩٦٥ - ١٩٧٩ صادف أني ركبت سيارة أجرة وقد كان سائقها نابهاً فعلم من لهجتي بأني كوردي لذلك بادر الرجل يخاطبني باللجة الكرمانجية الجنوبية . وأنا بدوري سألته

من أية منطقة أنت . ؟ قال لي من بليدة (جاوون) فخفق قلبي من جوابه لأني كنت منذ مدة هائماً وراء كلمة (جاوان) عندئذ سألته وما هي (جاوون) هي قبيلة أم منطقة ؟ ؟ قال هي أسم قبيلة ومنطقة أيضاً . . قلت فأني هائم أبحث عن أسم هذه القبيلة . منذ مدة طويلة فأين تقطنون أنتم ؟ قال في بليدة (جاوون) وعدة قرى من ضواحي (دەماوەند) وهذه القرى تابعة لـ (ئەبه رشيو) في منطقة (ناوخوى) التابعة لقضاء (دماوند) وهم جميعاً يتكلمون اللهجة الكرمانجية الجنوبية أن الفرس يسمون هذه البليدة (جابان) وبعد هذا الحوار والمجاملة أوضحت له بأني

أود البحث وأستقاء المعلومات عن هذه القبلية . عندئذ طلب مني أن أزورهم في (جاوان) وبدوري كنت مشتاقاًلهذه السفرة .

ولكني لما كنت لاجئاً ولم تكن لي حرية التصرف والتنقل لذلك فقد أرسلت طلباً بالبريد الى مديرية التربية والتعليم في المنطقة وصورة الى قائمقامية قضاء (دماوند) وهم يسمونها (فرماندار) أطلب فيها منهم منحي سمة الزيارة لتلك المنطقة ! لكنهم جاوبوني وبعد مدة بأن الطريق الى هذه المنطقة ترابية غير معبدة وعرة المسالك وغير صالح لمرور السيارات . أذ ليس هناك سيارات تعمل على هذه الطرق ما عدا (باصات) مستهلكة . . ! أضافة الى ذلك فأن السفر الى هذه الأماكن النائية بالنسبة للأجانب غير معقولة ؟ ! ومن هذا الجواب أدركت بأن الظروف السياسية لا تساعد على هذا السفر كما قيل (العاقل تكفيه أشارة) لذلك لم أسافر وباشرت بأجراء البحث والتحري والتحقيقات في بطون الكتب التأريخية والجغرافية . . !

كتب المسعودي في مروج الذهب. أن الأكراد الذين يقطنون مناطق (دينه‌وه‌ر) (همدان) لاشك أنهم جميعاً من نسل (ربيعة بن نزار) وكذلك (الماجوران) الذين هم من نسل (الكيكانيين) الأذربيجانيين.. والهذبانيون - والسرات - واللور - والباردلكان - والباريجان - والباريسيان - والخالية - والجبانارقية - والجاوان.. الخ. أن أسماء هذه القبائل التي ذكرها المسعودي دونت بصورة مغلوطة نتيجة التحريف في النقل والتدوين. لاشك أن المقصود من (ماجوران) أما هؤلاء (الكورانيين) الذين كانوا يسكنون حول المدن التي يبدأ أسمها بكلمة (ماه) مثل (ماه البصرة) و (ماه الكوفة) وأما كان القصد (باجوان) حيث أن لكلتا القبيلتين - الماجوران - والباجوان - علاقات وثقى مع (الكيكانيين) أي (الكاكائية) ولهم أرتباطات مع هاتين القبيلتين حتى أن (الكورانيين) (من محافظة كرمانشاه جميعهم (كاكائيون) وكذلك (الباجوان) الذين يسكنون أطراف الموصل لا يزالون على مذهب - الكاكائية - (الكاكه‌يي) ولكني لا أصدق المزاعم التي تدعى أن قبيلة (ماجوران) هي نفس قبيلة (باجلان) أما (الهذبانيون فهي تلك القبلية الكبيرة التي أنجبت عشرات الأبطال أمثال صلاح الدين وأهدتهم الى التأريخ والحضارة. أما (السرات) فينبغي أن تكون (سورجي) وليس (سوران) لأن (سوران) أسم يطلق على منطقة بين الزابين الصغير والكبير. أي محافظة أربيل الحالية. (أما (الشازنجان) فهي تلك القبلية الكبيرة التي أسست الدولة (العيارية) الكردية. ولا أستبعد أن تكون عشيرة (زنكنه) الحالية هي بقايا عشيرة «شازنجان» حيث نزحت بالأصل من منطقة (زنكان) لكن الفرس بدلوا رسمها وسموها (زنجان).

أما (اللور) فهي نفس قبيلتنا (اللرية) المشتملة لفرعيها (فيلي - بختياري) أو (بيشكوه و پشتكوه) أن هذه القبائل تمكنت لحد الأن من المحافظة على خصائصها وسماتها القومية وأسمائها.. ألا أن أسم (بارد لكان وباريجان) بقيت محرفة ولحد الآن لم يصحح هذا الغلط.. أما (باريسيان) فقد جعلها الأستاذ (أمين زكي بيك) - بازيان -. أما الـ (خاليه) فينبغي أن تكون (خيلاني). والـ (جبانارقة) التي تعرض أسمها للتحريف مرة أخرى فهي محرفة من (كاو باره‌كه) حيث يسكنون في هذه الأونة في (تالش) وبالقرب من بحيرة الـ (خرز) أما (الجاوان) تلك القبلية التي كانت موضوع محاضرة الدكتور مصطفى جواد والتي هي موضوعة بحثنا. فقد تبين لنا من النص السابق بأن المسعودي حذا حذو المؤرخين قبله في أعادة والحاق أروم هذه القبائل الى أصل عربي..!! بيد أن آراءه هذه تعرضت للنقد والمعارضة والتجريح - كما يبدو - فلهذا تراجع عن آرائه تلك. فها هو ذا في كتابه (التنبيه والأشراف) الذي الفه بعد مروج الذهب. كتب يقول (أن أكراد قبائل: - باذنجان - شاهجان - شازنجان - نشاوره - بوذي كان - لوريه - جورقان - جوانيه - باريسيان - جلالي - متسه كان - جبانا رقية - جروغان - كه‌يكان - ماجردان - والهذبانيون - وغيرهم من الذين يسكنون ضمن المناطق الخاضعة لنفوذ (فارس - كرمان - سيستان - خوراسان - أصفهان) والذين يعيشون في سهول وجبال وماهات (أي دينه‌ور ونهاوه‌ند ويشتكوه) و (أيغارين) أي (به‌ره‌ج وكه‌ره‌ج) - وهمدان - وشاره‌زور - داراباد - صامغان - ئاذربايجان - أرمينية - آران - بيله‌قان - باب الأبواب - جزيرة - بين النهرين - شام) والذين يعيشون من المضايق يعتبر هؤلاء القبائل جميعها من نسل (كورد أبن أسفنديار بن منوجهر) وقد دون المسعودي في كتابه هذا أيضاً أسماء هذه القبائل بصورة غير صحيحة (لكنه ليس هنا محل ذكر هذا الموضوع مفصلاً).. أما بالنسبة الى أن صول هذه القبائل تعود الى أصل عربي..! فأني لا يسعني الا أن أعيد الى الأذهان محاضرة المرحوم (الدكتور مصطفى جواد) حيث كتب يقول (ولا شك في أن الحاق الكرد بالأنساب العربية قد أصبح باطلاً عند أهل التحقيق والتدقيق). وها هو المسعودي يكتب في (التنبيه والأشراف) يقول أن هذه القبائل الكردية جميعها من نسل كوردبن أسفندبار بن منوجهر)

